هاتووچۆی گەرمو جۆستو چالاکی بازرگانو زانایانو گەشتیارانی جیهان بە جادەی هەوریشما، کە بە ناو هەمەداناتێدەپەڕی، هۆیەکی سەرکی نەشونماو گەشەسەندنی باری کلتورو زانستو هونەر بوو، چ لە هەمەداندا یا لەگشت شارەکانی کوردستان، کە شارێکی جادەی هەوریشم یا لاڕێگەو لقەکانو ڕێچکەکانی بەو شارانەدا دەڕۆیشتن، لەوانەش کرماشانو هەورامانو موکریانو جزیرەو بۆتانو هەولێرو کەرکوكو شارەزوورو خانەقینو شارەکانی تری..

بەڵام لەپڕدا هاتووچۆ بە ڕێگەی هەوریشما کزو لاواز بوو..تا دواتر بڕاو ڕاوەستایەوە، چونکە ئیتر پێویست بەو جادەیە نەما، ئەویش لەبەدبەختی کوردستان، دوای دۆزینەوەی ڕێگەی دەریایی لە ئەوروپاوە بۆ هیندستانو چین، کە دەریاوانی خەڵکی پرتوگال بەناوی ڤاسگۆدی گامالەساڵاتی(١٤٩٨ز) ڕێگەی دەریایی لە (رأس الرجاء الصالح)ەوە، باشوری ئەفریقیا، دۆزییەوە، کە لەوێوە ئیتر کەشتیو گەمییە دەریاییەکان بەئاسانی، بە بناری هیندستانو چین دەگەیشتنو ئەو کاڵایانەیان دەگواستەوە، کە پێشتر بە وڵاخو گالیسکە، بەجادەی هەوریشما(چین —ڕۆژهەڵاتی ناوەراست-ئەوروپا) دەگوێزرایەوە.

ڕاوەستانی هاتووچۆی گەرمو بەردەوام بە جادەکەدا راستەوخۆ کاریگەری نێگەتیڤی خستە سەر ئاستی ئابووریو کۆمەڵایەتیو کەلتوری خەڵکی ئەو شارو وڵاتانە کە کەوتبوونە سەر جادەکە، ئیتر وەکو چرایە کزبووبیتەوە، ڕەوتی پێشکەوتن ڕاوەستا، بەڵکو بەرەو دوا پاشەکشێی کرد.

ئەمجا، وردە وردە وڵاتانی ئەوروپا کەوتنە بوژانەوەو گەشەسەندن، کە پەیوندیی راستەوخۆیان بە هیندستانو چینو وڵاتانی دیکەوە بوو، سەرەتای ڕێنیسانسی ئەوروپایی، کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە، ئەویش بەتایبەتی کە زاناو شارەزایانی ئەوروپایی کەوتنە وەرگێڕانی سەرچاوەکانی زانستو فەلسەفەو کەلتوری ڕۆژهەڵات.

کەواتە : وەختێك ڕۆژهەڵات لەبوژانەوەو گەشەسەندنی زانستیو کەلتوری بوو، ڕۆژئاوا نووستبوو. بەڵام بەهۆی دۆزینەوەی ڕێگەی دەریایی لە ئەوروپاوە بۆ ڕۆژهەڵات، دۆخەکە پێچەوانەو گەڕایەوە، ئەمجا ڕۆژئاوا کەوتە پێشکەوتنو

ڕۆژهەڵات لە جێگەی خۆی داچەقیو پاشگەزبووەوە، کە ئـەوەتا ئـەمڕۆ خەریکـە هاوسەنگی لەنێوان هەردوو دیوی گۆی زەوین بگەڕێننەوە.

کە کردەوەیەکی ئێجگار سەختو دژوارە، مەگەر وڵاتانێـك وەك چـینو ژاپـۆنو هیندستانو کۆریاو هی تر ڕەوڕەوەی پێشکەوتوونیان ڕانـەگرتو، هاوکـاری گـشت وڵاتانی ڕۆژهەلات بکەن...مەبەستیش بزاڤی پەرەسەندنی باری ژیانی گەلانە، نەك خستنە بەرامبەریەکی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا، وەك دوو ڕکابەر، ...

نەخێر، بڕوام بەو جۆرە ڕکابەرییە نیە، و کارێکی نەکردەنییە، بەڵکو... دەڵـێم کە مـافی گشت گەلانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوایە لەپێشکەوتنی زانـستو شارسـتانیو تەکنەلۆژیا سوود ببەنو بەئاسوودەییو بەختەوەری بژین. لێرەشـدا..وەك هەمیـشە وتوومە-دووپاتی دەکەمەوە، کە وڵاتانو گەلانی دونیـا پێویـستیان بـەهاوکاریو دۆستایەتی نێوانیان هەیە.

لە فەلەسەفەی بابا تاهیری هەمەدانیدا تیشکی ئەو بۆچـوونەو بـیروباوەڕانە دەبـینین، کە خەڵکی دنیای بۆ میهربانیو عیشق یەکـسانیو یاریـدانی یـەکتر بانگ کردوە.

بابا تاهیر، ئەوەتا دەلێ:

ئەگـــەر دەســـتم بگاتـــە چـــەرخی گـــەردوون
دەپرســـم لیـــێ کـــەوا ئـــەم چـــوونەو ئـــەو چـــون
یـــەکێ پێـــت داوە ســـەد جـــۆرە نـــازو نیعمـــەت
یـــەکیش نـــانی جـــۆی ئاوێتـــەی خـــون!

یا:

دڵـــێکم هـــەس کرێـــداری محبـــەت
لـــەلایا گەرمـــە بـــازاڕی محبـــەت
کراســـێکم بـــە بالآیـــا بریـــوە
لـــە پـــۆیی مەینـــەتو تـــاری محبـــەت!

یا :

کــــه تـــۆ نەتخوێنـــــدووە عیلمــــی ســــەماوات
کـــه تـــۆ نابەیتـــــه دەر ڕێ لــــه خـــەرابات
کـــــەتۆ ســـــوودو زیــــانی خـــۆت نـــــەزانی
بـــەیاران کـــەی دەگـــەی هەیهاتــــه هـــەیهات!

یا:

درەخـــتی غـــەم لــــه گیـــان کردوویــــه ڕیـــشه
لەدەرگـــــــەی خـــــوا دەنـــــــاڵێنم هەمیـــــــشه
عـــــەزیزان بـــــا بـــــزانین قـــــەدری یــــەکتر
ئەجـــەل وەك بـــــەردە ئیـــسنان چەشـــنی شیـــشه

یا:

دڵـــی شـــاد ئاگـــای لــــه دڵـــزار نیـــــه
ســـپ و ســـاغ ئاگـــای لـــــه بـــیمار نیـــــه
سوورچـــــی تـــــۆ نیــــــه ڕەسمێکـــــی کۆنــــــه
ئـــــازاد لەئەســــــیر ئاگـــــــادار نیـــــــه!

یا:

گـــــوڵی خـــــۆم بـــــدەم، کـــــه پـــێچ و تـــــاوی
بــــه ئـــــاوی چـــاوی خـــــۆم بـــدەی ئـــاوی
لـــــه ڕێگــــــەی خـــــوا کــــــەیێ ڕەوایــــــه
یـــــەکێکی تـــــر بــــی و بگـــــرێ گـــــولاوی؟

یا:

لەگـــــەڵ ســــــوتە دلانم چـــــون نــــــەناڵم
لەتـــــەك بـــــی حاصــــــلانم چـــــۆن نــــــەناڵم
ئـــــەناڵن بـــــولبلانی نــــــار چــــــل و گـــــوڵ
کــــەمن دوور لـــــه گـــــولانم چـــۆن نــــەناڵم؟

**هەمەدان:**

بۆ گەیشتن بەڕاستی پێویستە کاتو شوێن بزانین.

هەندێ لەکاتو سەردەمی دەرکەوتنی بابا تاهیرمـان، دواتـر بـاس دەکـەین. لێرەدا بە کوردی باسی زێدوماوا(شوێن)و جێگـەی پەیـدابوونوژیانی ئەکـەین، بەتایبەتی کەسەرچاوەکان دەڵێن هەر لەشاری هەمـەدان ژیاوەو، کەم بەسەفەرچـووە بۆ جێگەی تر، مەگەر هەندێ جار بۆ لورستانو ئەسفەهانو شیراز.

هەمەدان کە یەکێك لە شارە کۆنەکانی جیهانەو، لەو رۆژە کە دامەزراوە هـەر ئاوەدان بووەو لەدانیشتوان خاڵی نەبووە.

لەساڵی ٦٧٠ پێش زایینەوە بۆ نیادی هەمـەدان لەلایەن "دیاکو شا=دئیـوك شا"ی میدییەکان دامەزراوە، بەدیواری ئەستوورو قـایمو کوشـكو تـەلاری ڕازوەو قـەڵای گەنجینـەی نـاوەوە، دورسـتیان کـردووە، سـەرەتا نـاوی "ئـەکباتان= هەکەمتانا=هەگەمتانا= هەمەگتانا" بووە.

کەواتە یەکەمین شاری گەورەو پایتەختی دەوڵـەتی میـدیا (مـاد) بـووە. لـەو سەردەمەدا میدیا(ماد) دوو شاری گەورەی هەبوو: هەمەدانو ڕەی.

هەمەدان، لە ئەسڵدا، هەنگمتان ناو دەبرا، کە بـەمانای: "ناوەنـدی زانایانـە، چونکە لەشاردا ئەنجومەنێك لەسەد زانای گەورە پێکهاتبوو.

بەپێی سەرچاوەکان، بە فەرمانی گوشتاسپ شا کتێبـی ئاوێستای زەردەشت بە دوو نوسـخە هـەر نوسـخەیەك لەسـەر دوازدە هـەزار پۆسـتی گـا، بـەئاوی زێـر دەنووسنەوە.

دانەیەکی لە گەنجینەی قـایمی کتێبخانـەی مـەزن (دژ نەپـشتك) لـە شـاری هەمەدان دەشارنەوە، دانەکەی دیکـەی دەبـەن لـە (گـەنج شـپیکان) بەپـەنهانی دادەنێن.

بـۆ زانیـاری : دژ نەپـشتك یـانی: جێگـەی قـایمی سـەخت بـۆ شـاردنەوەی بەڵگەنامەو دیکۆمێنیت هەمەڕەنگ. کە سەرەتا لەهەمەدان بووە، ئەمجا لەچـەند جێگەی تر کردوویانەتەوە.

(شیپیکان)، مەبەست (شیزە)، زێدو مـاوای زەردەشـتو جێگـەی یەکـەمینو دێرینەترین ئاتەشگەی زەردەشتیە، دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی دەریاچەی ورمـێ.

مێژوونووسانی دەنووسن کە ساڵی ٣٣١ پ.ز ئەسکەندەری مەقدونی هێرشی هێنایە سەر ئێرانو داگیریکرد، لە ئەنجامدا هەردوو دانەی نووسراوی ئاوێستایی دۆزیەوە، یەك لەهەمەدانو ئەوی دیکە لە شیز. دانەیەکی سووتاند کە دوازدە هەزار پۆستی گابووە، بەلاَم لەسەر ئامۆژگاریو ڕاوێژکاری زانایانی یۆنانی ئەسکەندەر دانەکەی دیکەی ئاوێستای بۆ یۆنان نارد تا وەریبگرنە سەر زمانی خۆیان.

ئەوەش گرنگی پێگەی شاری هەمەدان پیشان دەدات کە جێگەی متمانەی پاشاکانی ئەو سەردەمە بووە. لەوەشدا دەردەکەوێ کە چەندین سەدە پێش زایین هونەری نووسین زانراوە، تەنانەت بەئاوی زێر ئاوێستایان لەهەمەدان نوسیوەتەوە.

هەر لە سەردەمی زەردەشتەوە، هەمەدان ناوەندی ئەنجومەنی زانایان(کۆڕی زانیاریو زانکۆ) بووە، سەرەتا سەد شاگرد (خوێندکاری) هۆشیاری پێگەیاندووە کە بەشارەکانی ئێرانی ئەو سەردەمەدا بلاوبوونەتەوە، هەروەکو پلو تارك چەند مێژوونووسی یۆنانی دەنووسن کە فەیلەسووفانی مەزن وەك سوکراتو ئەفلاتوونو فیساغورس ئەرستوو ئەوانی دیکە سوودی زیادیان لە کولتور زانیارییەکانی زانایانی زەردەشتی وەرگرتووە، چ ڕاستەوخۆ ئەوانیان دیتووە، یا لەڕێگەی خوێندنو وەرگێڕانەوە، فێربوونە، بەتایبەتیش لەبواری فەلسەفەو پزیشکیو ماتماتیكو هەسارە ناسیو زانیارییە سروشتیەکانەوە.

زەردەشت، بەخۆی، بایەخی گرنگی بەفێرکردنو پەروەردەی ژنو پیاو بوو، هەر بۆیەش لە فێرکردنی (پوورچیستی) کچی خۆیەوە دەستی پێکردووە.

لە سەرەتاوە بیری لە دانانی فێرگەو قوتابخانە کردۆتەوە، تەنانەت، بەپێی ڕاڤەی هەندێ ئاوێستالۆجی (ئاوێستا ناسی) دەلێن کە ئاوێستا بەمانای پەروەردە، بونیاد، ئەسڵو زانستی پایەیە، کە نزیکی واژەی "وید"ی سەنسکریتی هیندی دەزانن، واتە: زانستو ماریفەت.

جا سەیر نییە ئەگەر ناوی پایتەختی میدی(ماد) کە نەتەوەی زەردەشتە، واتە شاری هەمەدان(=هەنگمەتانە=هەگمەتانە) بەمانای سەنتەرو مەلبەندی زانایان هاتووە، وەکو گوتمان.

مەبەست لە چەند پەرەگرافی پێشوو نیشاندانی پێگەی هەمەدان لە شارستانیی کوردو ئێرانیدا.

دائیرەتولمەعاریفی م. ئادینفەر مێژووی دروستبوونی هەمەدان بۆ نزیکەی یازدە سەدە (هەزارو سەد ساڵی) پێش زایین دەگەڕێنێتەوە، واتە ئێستا تەمەنی لە سێهەزارو سەد ساڵ زیاترە.

دەنووسێت کە ناوی هەمەدان یەکەمجار لە نووسراوەی "تیکلاب یا لسەر"ی یەکەمین پاشای ئاشوور بەرچاو دەکەوێ، کە بە "ئەمدانە" ناوی بردووە.

لە نووسراوەکانی هەخامنیشان بە"هەکمەتان"و، هێردۆتی مێژوو نووسی ناودار بە"ئەکباتان" ناوی بردووە.

هیرۆدۆت نووسیویەتی کە " دیوکسی=دئیوك=دیاکۆ"، یەکەمین پاشای دەوڵەتی میدیا، ساڵی ٧٠٨-٦٥٥ پێش زایین، شاری هەمەدانی دروستکردووە.

ساسانییەکان لە ساڵی ٢٢٦ز ناوەڕاستی سەدەی هەفتەمی زایینی، شاری هەمەدانیان وەك جاران بایەخ پێدان، گرنگترین گۆڕانکاری هەمەدان لەباری دیموگرافیو شارستانیەوە، لەسەردەمی ساسانیان، ئەوەبوو کە شاژن "سۆسەن" کە ژنێکی جووبوو، پاشای ساسانی ڕازیکرد تا جووەکانی ئیرانو دەرەوەی لەشاری هەمەدان نیشتەجێبکات، چونکە لە جێگاکانی دیکە کەوتبوونە بەر جیاوازیگەریو ئازاردان. لە کۆتایی سەدەی هەڤدەهەمی زایینیشدا، لەسەردەمی شا عەباس، ماوەیان دا بە میسۆنە مەزهەبیەکان (موبەشیرەکان)ی کاسۆلیکی مەسیحی تا لەهەمەدان جێگەیان بکرێتەوە، ئێستاش لە هەمەدانەدا جوورو مەسیحیو موسڵمانو پەیڕەوانی زەردەشتی و یاراسانو کوردو ئازەریو فارس پێکەوە دادەنیشن، یاراسان (کاکەیی) گەڕەکێکی گەورەیان هەیەو، شوێنەواری کۆنیان بەرچاوە. ئەو کوردانەی لە هەمەدانو گۆرانو موکریو لوڕو فەیلیو شێوە زارەکانی دیکەن.

بەدرێژایی مێژوو شەڕو داگیرکردنی ئێرانو ڕووداو گەلی جیا جیای هەمەدان کەوتووتە ژێر دەسەڵاتی چەندین لایەنەوە، وەك دەسەڵاتی عەرەب دوای دەرکەوتنی ئیسلام، دواتر فەرمانڕەوایی دەیەملە، سەلجوقی، مەغوول کە هەمەدانیان وێرانکرد، تەیمور لەنگ ژمارەیەکی زیادی دانیشتوانی بەکۆمەڵ کوشت. ئەحمەد

پاشای عوسمانی ساڵی ۱۷۲۳ز هەمەدانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی. دوای شەش ساڵ نادر شای ئێرانی هەمەدانی وەرگرتەوەو، جارێکی دیکە کەوتەوە دەستی عوسمانیەکان، تا حوزەیرانی ساڵی ۱۷۳۱ز، بەپێ ی پەیمانی نێوان ئێرانو عوسمانی، شاری هەمەدان گەڕایەوە سەر ئێران، کە تا ئەمڕۆ وەها ماوتەوە.

بەشی گرنگی شاری هەمەدان، کە ئەکەوێتە داوێنی چیای ئەلوەند چەندین قەزاو ناحیەی هەیە وەك: ئەسەد ئاباد، رەزن، کەبووتەر ئاهەنگ، سیمنە ڕوود، شەراو پیشخۆر.

## هەمەدان لە شیعری باوە تاهیردا:

بابا لە چوارینەکانیدا شانازی بە هەمەدانەوە دەکاو ناوی دووپات دەکاتەوە، ئاماژە بە چیای ئەلوەندیش ئەکات، کە هەمیشە پەنای بۆ بردووەو لەوێ هەندێ جار بە گۆشەگیری ژیاوە تا لە بیدەنگیدا ڕازو نیازی دڵی خۆی لەگەڵ پەروەردگار دەربڕێت.

هەر وەخت بابا تاهیر باسی بەهارو گوڵزارو بولبولو چمەنو هەڵاڵەی کۆسارانی کردووە ئەو جوانی سروشتی ئەلوەندو دەوروبەری دەربڕیوە دەڵێ:

"ئەمنو ئەو سپیە بازەم هەمەدانی کە هێلانە لە کێوە نیهانی..."

لێرەشدا مەبەستی لە کێو: چیای ئەلوەندە.

یا کە دەڵێ:

"زەمانی لالە زاران هەفتەیەکە....." مەبەستی لالەزاری چیاو دەشتی هەمەدانە.

کە دەڵێ " چەند دانیشتووم لە سەر کێوی بەرز " مەبەستی "چیای ئەلوەندە.

" لە بناری ئەلوەن گوڵێکم چاندووە، بەیانیو ئێواران بەفرمێسکی چاو ئاوم داوە، لەو وەختەبوو کە خەریکبوو بپشکوێو بۆنی عەتری بپەخشێنی، ڕەشەبا هەڵیکەنو بۆ نساران (نزاران)ی برد...".

دەربارەی (ئەڵوەن) کە هەم ناوی چیایە، هەم نـاوی ڕووبارەکەیـە بەهەمــەدانا تێدەپەڕێ، بابا تاهیر جارێکی دیکە دەڵێت:

"هـــەر ئانکـــە ئەڵوەنـــد دامـــان مـــوو نیـــشانی
"دامـــان ئـــەز هـــەردوو عالـــەم دەر کـــشانی
"ئەشـــك خـــونین پـــا شـــەم ئـــەز راه ئەلوەنـــد
"تاکـــە دلبـــەر بـــە پـــایش بـــەر فـــشانی"

-باقی شەفیعی (سەیاد) ئەم چوارینەی کردووە بە هەورامی، دەڵێت:

"وەختـــەی چـــە ئەڵوەنـــد دەر مـــەدەی چـــاکان
"جـــە هـــەردوو عالـــەم مەکیـــشی دامـــان
"هەلـــــسیو نیـــــنم پاشـــــورای ئەڵوەنـــــد
"تـــا خـــاك نەنیـــشۆ بـــالآی وەش ســـامان"

چوارینەیەکی دیکەی بابا تاهیر

بـــشووم بـــە ئەڵوەنـــد دامـــان مـــەو نـــشانوم
دامـــەن ئـــەژ هـــەردوو گـــێتی هاوشـــۆنم
نـــــشانوم توولـــــەو مودیـــــوم بـــــەزاری
بـــی کـــە بولوبـــول هـــەنی دا دلّ نیـــشاندم

-سدیق بورەکەیی (سەفی زادە) ئەم چوارینەیەی بەم جۆرە شەرح کردووە:

واتە: بچم بۆ کێوی ئەڵوەندو دوایـنی مێـو ببـەمو لەویـدا ببـینم(بنێـژم) توولـە مێوەکان بە ئاهو زاریو شێوەن بنێژم، بەڵکو بولبولێکیش بـیتە لای گوڵو وەکو من لە تەنیشتی ئەو مێوانە بناڵێنێ.

بۆرەکەیی، هەروەها ئاماژە دەکات کە بابا تـاهیر لەهەمــەدان مـردووە، ئارامگـای لەسەر تەپۆلەکەکدا نێژراوەو لەو ئارامگایە، جگە لە تەرمی بابـا تایـەر دوو کەسـی تریش تێدا نێژراوە کە یەکێکیان دایـەنی خۆیـەتیو شـیری داوەتـێو نـاوی فاتیمەیـە، ئەویتریشیان فاتیـمەی لووڕەی دڵخوازییەتی.

له (ئینسایکلۆپیدیای گشتی) ی یاسین صابر صالح، چاپی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤، ز، دەربارەی هەمەدان هاتووە.

-هەمەدان، شارێکی کوردستانی خۆرهەلأته کەوتۆته خۆرهەلاتی شاری سنەوە، و لە بناری چیای ئەلوەندا، دانیشتوانی نزیکەی نیو میلۆن کەسە، کە کوردو تورك و فارسن. مەلبەندی پارێزگای هەمەدانە. لە کۆندا گریکەکان (یۆنانیەکان) پییان دەوت (ئەکباتان) کە مەلبەندی مەملەکەتی میدیای کۆن بوو. پاشان بووە پایتەختی هەخامنیشیەکان، کە داریۆشی یەکەم دایمەزراندووە، لە ناوچەیەکی شاخاویدایە، پاشماوەی دێرینی سەردەمی برۆنزی لێیە. سەنتەرێکی بازرگانیە. گۆڕی (بابا تایەری عوریان)ی لێیە، کە شاعیرێکی کوردی لوڕییە. (ل ١١٢٢). هەروەها گوری زاناو پزیشکی ناسراو(ئەبو سیناش لە شاری هەمەدانەوە چەندین شوینەواری مێژووی سروشتی تێدایە، بەتایبەتی ئەشکەوتێکی سەر سوڕهێنەر بەناوی(غاری عەلی سەدر، دەریاچەیەکی درێژی تێدایە، گەشتیاران، بەناویا هاتووچۆ دەکەن و سەهۆلی دەیان هەزار سالە بەدیوارەکانیا بەستوویە.

**ئەم کتێبە:**

لەم کتێبەدا کە لەبەردەستانە، ماموەستا هەیاس کاکەیی بابەتێکی گرنگی هەلبژاردووەو چەندین دەق و لێکدانەوەو شەرحی چوارینەکانی بابا تاهیر ێکداوەتەوە، خۆی ماندووکردووەو گەڕاوە بەشوێن سەرچاوە و زانیاری، تازەو بردا، لە هەزارەمین سالەی کۆچی دوای بابا تاهیر هەمەدانیدا بەرهەمێکی جوانی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردستان کوردووهانی دام بۆ نووسین.

لەو پێشەکییە زیاتر نامەوێ شتێکی دیکە بلێم کە پەراوێزە بۆ ئەم کتێبەی ماموەستا هەیاس، بە گەرمی پیرۆزبایی لێدەکەم و چاوەڕوانی بەرهەمی ڕەنگینی دەهاین. سوپاسی ئەکەم کە ڕێگەی داوە تائەم چەند لاپەرەیە وەك پێشەکی کتێبی (لێکۆلینەوەو ووردبوون لەسەر چوارینەکانی بابا تاهری هەمەدانی و ژیانی) بلاوبکرێتەوە. شادوو سەرفرازبن.

**فلك الدين كاكەيی**

سەرچاوەکان:

-دائیرەتولمەعاریف (بە فارسی)، ئامادەکردنی م. ئادێنفەر، تاران، ١٣٤٨ ك.

-سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، مێژووی ویژەی کوردی، بەرگی یەکەم، بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ز.

-سدیق بۆرەکەیی، بوزرگانی یاراسان، چاپ خۆشە، تاران ١٣٦١ ك.

-باقی شەفیعی (سەیاد)، دیوانی بابا تاهیر هەمەدانی (بەهەورامی)، ناوەندی بلاوکردنەوەی پرتەو بەیان، سنە، ١٣٨٤ کۆچی.

-ڕووباعیاتی خەییام، شێخ سەلام کردوویە بە کوردی، چاپخانەی کەکەی فەلاح، سلێمانی، ١٩٨٠.

-سید حسین صدر، پلایە حکماء مسلمین، دار النهار للنشر، بیروت، (الگبعە الپانیە)١٩٨٦م.

-مەلا خەلیل سلێمانی(مشەختی)، جار بەندین بابا تاهر، بە کرمانجیا ژووری، چاپخانا زاگرۆس. میدیا، سوید، ١٩٩٩م.

-دکتۆر محمد نوری عارف، وشەو زاراوەکانی بابا تاهیرو بەراورد کردنیان لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوریدا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەهاوکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧م.

-ئەحمەد شاڵی، چوارینەکانی خەیام، (بەسۆرانی)، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩م.

-کاروان عوسمان عەلی، چوارینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی (بەسۆرانی)، پێداچوونەوەی صالح هەلاج، بەهاوکاری سەنتەی مرواری بۆ گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی لە خانەقین، ٢٠٠٩ز.

-ئەحمەد دلزار، گەنجینە، بەشێك لە چوارینەکانی بابا تایەری هەمەدانی، دلزار کردوویەتی بە سۆرانی. چاپی دووەم، بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧ز.

-دكتۆر مهـدى الهـى قمـشەیی، رباعیـات بابـا تـاهر( راڤـە بـەزمانی فـارس)، چاپخانەی پەیام، چاپی یەکەم، تاران، ١٣٧١ کۆچی.
-اسماعیل شاهرودی (پێشەکیو چاککردنەوە بە فارسی)، رباعیات بابا تاهر عریان همدانی، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی فخر رازی، تاران، ١٣٧٠ کۆچی.
-جـەمال نەبـەز، فەلـسەفەو رامـانی یارسـانی لـە فەرهـەنگو کۆمەڵگـەی کوردەواریدا، چاپخانەی مناره، هەولێر، ٢٠٠٩ز / ٢٧٠٩ ك.
-شێخ محمد خاڵ، بابا تاهیری هەمـەدانی مەشـهوور بـەعوریان، بـەرگی یەکـەمی گۆڤاری زانیاری کورد، چاپخانەی کۆری زانیاری، بەغدا، ١٩٧٧.
-یاسین صابر صـالح، ئینـسایکلۆپیدیای گـشتی، چـاپی یەکـەم، دەزگـای سـەردەم سلێمانی، ٢٠٠٥ز.

تێبـینی:

لەسەرچاوەکان دەردەکەوێ کە چەندین نووسەری هێژا تێکۆشاون بۆ زیندوکردنـەوەی کەلەپووری بابا تاهیرو، دارشتنەوەی بەشێوە زاری دیکـەی کـوردی: سـۆرانی، کرمـانجی سەروور، هەورامی، جگە لە چەندین پێـشەکیو لێکۆڵینـەوەی سـوودمەند، هیـوادارم هێشتاش بایەخبدرێت بە شیعرو فەلسەفەی باباتاهیرو ئەدەبـیاتی کلاسـیکی کـوردی کە گەنجیەیەکی دەوڵەمەندن.

## پێشەکی

باباتاهیری هەمەدانی بە سەر کاروانی شیعرو ئەدەبی کوردی دەژمێرێت لەدونیای شیعرو ئەدەبیدا، بەچوارینەی زێرینەوە هاتەمەیدانی دونیای ئەدەب و شیعرەوە[1]*. هەر لەسەرەتای کۆکردنەوەی چوارینەکانی**. هەوڵ دراوە بۆ لێکدانەوەو شیتەڵ کردنیان. وەهەر لەوەدەمەشەوە هەوڵ دراوە بۆ گۆڕینی ناسنامەي باباتاهیر بەدەستکاری کردن و تێ هەڵکێش کردنی ووشەی فارسی وەك شێخ محمد خاڵیش پشتگیری ئەو ڕایە دەکات و لە ل٢٨٧ کەدەڵێت(چەند جار شیعرەکانی نوسراینەتەوە لەلایەن ئێرانیەکانەوەهەر جارێ چەند وتەیەکی کوردی لێ کراوە بەفارسی) . کوردیش هەوڵ و کۆششي کردوە بۆ پارێزگاری کردنی چوارینەکانی باباتاهیر لەرەسەنایەتی خۆیی، روخسارە کوردی لورییکەي. هەروا طاجیکەکانیش هەوڵی خۆیان هەیە بۆ ڕاکیشانی بۆ لای خۆیان ئەمەش هەمووی بەهۆی ئەوەوە بوەکە دەست نوسێکی شیعرەکانی باباتاهیر دەستنەکەوتووە و بەڵکو هەر لەو زەمانەدا تۆمارنەکراوە، بە زارەکی بڵاو بووەتە ناوچەکەدا، و دانیشتوان و موریدانی ڕێبازەکەی لە بەریان کردووە، یان لە هەندێ بەیازي پارساندا لەم دواییانەدا دەست کەوتووە و کۆکراوەتەوە.

هەر لەسەرەتایی هەفتاکانی سەدەی پێشوو، کاتێك کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی علاء الدین سەجادیم خوێندەوە، دەربارەي باباتاهیر و چوارینەکانی کەوتمە خولیای خوێندنەوەو ووردبوونەوە، لە باباتاهیر خۆیی و چوارینەکانی چونکە پێشتر لەزۆر دانیشتن و کۆڕدا پیاوە بەساڵاچووەکان و پیاوە ئاینیەکان زۆر باس و خواسی باباتاهیریان دەکرد، وە بەپلەو پاییەی بەرز دەنەرخینرا.

---

[1] م. فؤاد حسين احمد لەکتێبەکەی ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا لە ل٣٨٧ دەڵێت:- "کۆنترین هۆنراوەی کوردی کە لەبەر دەستمان بێ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (٣٣٠-٣٢٠پ.ز) . ئینجا چوارینەکانی باباتاهیر (٣٢٦-٤١٠ ك) واتە (٩٣٧-١٠١٩ ز) وەکو یەکەم بەرهەمی مێژوویی _ دیوانی شیعر _ بەدەستمان گەیشتووە، دوای ئەمە نزیکەي ١٤٠٠ ساڵ دیوانی کوردەواری بێ دەنگ بووە و هیچ جۆرە هۆنراوەیەکی بۆمان بەجێ نە هێشتووە.

ژ.(پاشان مامۆستا علاء الدين سجادي باسي پەیوەندی باباتاهیری کردبوو لەگەل یارسان، کە هەندێ لەچوارینەکانی ناردووە بۆ ناو یارسان و پەیرەوانی رێبازي خۆی. کەژمارەی ئەو چوارینانە ١٣ دوو نیوە دێر (بەیتن) کەوتووەتە ناو بەیازەکانیان، بەشێوەی سروودی پیرۆز دەیخوێننەوەو دەیپارێزن. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی وروژاندم و هاندانم بۆ گەران و پشکنین و خوێندنەوە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەتی باباتاهیر و چوارینەکانی.

ژیاني باباتاهیر و کاریگەری لە بواری ئەدەب و هونەر و بواری سۆفیگەری یارسان لەکۆتایی سالی ١٩٧٩ ز دا نووسیمەوە، وەلە سالی ١٩٩٧ ز لەگۆڤاری ڕامان (١٤) بلاو کرایەوە. بەلام زیاتر دەستم دایە بۆ شیتەلْ کردنەوەی چوارینەکان و ووردبوونەوە لێیان، چونکە بەزۆری زاناو نوسەر و ئەدیبان، لێدوانی ئەدەبیان هەبوو دەربارەی چوارینەکانی باباتاهیر، هەرچەند هەندێکیان یان بەشێکیان کرد بووە بواری خواناسی و ئامۆژگاری وە بەشێکیان بواری خۆشەویستي و ئەوین[1]. بەڕای من چوونە ناخی چوارینەکانی باباتاهیر دەردەکەوێت غەزەلی باباتاهیر مەجازیە. ڕوویەکي سۆفیگەری خواناسی تەواوی لێ دەبینرێت، ئەو بارەی کە پیدا دەلێت مەعشوقەی هەمیشەییەو پێروانی ڕێبازە پیرۆزەکەیەتی، بۆیە شەیدای سروشت بووە و لەبناری ڕووباری ئەلوەند و چیاکانی لورستاندا لەنگەری گرتووە، دەستی لەتام و چێژی ژیان هەلگرتووە، تەنها بەدوای دیارنەبووندا دەگەرێ و چاوی پێی کەوێت و شاد بێتەوە و یەکبوون لەنێوانیاندا دروست بێت.

دان بەوە دادەنرێت کە باباتاهیر لوڕستانیەو بەزمانی لوڕی هۆنراوەی ووتوە، بە لام لەماوەی ئەو هەزار سالە یان زیاتر چەند جار هۆنراوەکانی چاپ کراوە، ووشەی فارسی کەوتووەتە ناویانەوە، ئێرانیەکان دەلێن شاعیرێکی ئێرانی فارسیە یان بەلای خۆیانە زیاتر بیبەن لەمێژووی ئەدەبیاتی فارسیدا هاتووە لە لا ٣٤١دا دەلێت:- "کوردەکان لەو زەمانە بە زمانی باباتاهیر ئاخاوتنیان کردووە، وە ئەدەبیاتی ئێران بەزمانی پارسی(پەهلەوی) بووە، واتە کوردەکانیش نزیك ئێرانیەکان بوون، ئەی چۆن لە ئەدەبیاتدا شەرێك نەبن؟ د.مارف خەزنەدار لەلاپەرەی ١٩١دا دەلێت ئەوەی

---

[1] لەروخساردا ئەگەر تەماشای چوارینەکان بکەیت، بۆنی خۆشەویستي لێ دێت بەلام دیوەکەی تری تەسەوفە.

ئاشكرایه ئەوەیه كه زمانی پەهلەوی (فارسی ناوەراست) لە دەوروبەری ساسانیەكاندا باو بووە. د. جەمال نەبەز لە كتێبیی (فەلسەفە و رامانی یارسانی لە فەرهەنگ و كۆمەڵگای كوردەواریدا) لە لاپەرەی٦٦ دەڵێت: "دەركەوت بۆم كه پەهلەوی (فارسی ناوەراست نییە) بەڵكو زمانێكە پەیوەندیەكی رێزمانی و دەنگ سازی وشە نامەیی بەشێوەزاری گۆرانی و فەیلییەوە هەیە كه بنەزاری كوردی هەورامانی بەفەهلەویات نێو دەبرێ. وە لەلاپەرەی ٩٥ دەڵێت: ساسانیەكان مەڵبەندی فەرمان رەواییان كوردستان بووە وەزمانی دەوڵەتەكەیان پەهلەوی بووە"[1]

چوارینەكانی باباتاهیر ژمارەیان نزیكەي (٣١٣) چوارینەیە كه بەهی ئەو دادەنریت وەك لە كتێبەكەی عباس رەجویدا هاتووە كه ئەویش چاپی (وەحیددەستكردي) بە سەرچاوەی داناوە لەگەل (٤) شیعری غەزەلیدا، بەڵام لەمێژوو ی ئەدەبی كوردی د.مارف خەزنەدار هاتوە كە (١١) چوارینە دۆزراونەتەوە هی باباتاهیرە، تۆماركراوە لەبەشی چوارینە دۆزراوەكاندا. وە لەدیوانی باباتاهیر(بە چوار زمان) بە كۆششی مەسعود میرزایی هاتووە كە نزیكەی(٤٩) چوارینە گومان دەكرێت هی باباتاهیر نەبێت، تۆماركراون لەبەشی چوارینە گومان لێ كراوەكان.

عباس رەجەوی دوو چاپی هەیە، چاپی كۆن كەلەوانەیە دەگەرێتەوە بۆ پەنجاكان یان شەستەكانی سەدەی پێشوو چونكە سالی لەچاپ دانی دیاری نەكراوە لەسەر كتێبەكە، بەڵام چاپی نوێ سالی ١٣٨٣ فارسی چاپكراوە. ئەمەیان لەلایەن رێنووس و چاپەوە رەوانترە. هەر چەندە جیاوازی بچووك لەنوسین ووشەكاندا هەیە بەپێیی توانا هەولم داوە چوارینەكان بە رێنووسی كوردی بنووسمەوە و لەگەل پارێزگاري فۆنۆتیكی لوری، وە ووشە لوری و فارسیەكان ماناكانی بەكوردی لەبنی چوارینەكەوە دانراوە، لەگەل هەندێ لێكۆلینەوە جگە لە وەرگێرانی هەندێ چوارینە بۆ سەر زمانی كوردی بەشێوەی خۆی هەروا لەلایەن (دلزار، د.مارف خەزنەدار، م.فؤاد حسین علي،

---

(١) طیب طاهیر لە كتێبی تاریخ و فەلسەفەی سەرنجام ل ٥٩٢ دەڵێت قەبالەكانی هەورامان كە سالی ١٩١٣ دۆزراونەتەوە دەری دەخەن كەشێوەزاری هەورامی یان گۆران درێژەی زمانی پەهلەویە، هەروەها لە كتێبیی شەرف نامەی شەرف خانی بەدلیسی كە مامۆستا محمد جمیل رۆژبەیانی وەریگێراوە بۆ زمانی عەرەبی چ٣، بەغداد، ل٧٨ . دەڵێت ( زمانی پەهلەوی بناغەی زمانی كوردی ئێستایە كە دابەش بووە بۆ چوار زاراوە كرمانجی گۆرانی، لوری، كلهوری) وەنزیك تریان بۆ پەهلەوی زاراوەی لوریە .

م.فەهمی کاکەیی، د.صدیق بۆررکەیی) بۆ ئەوەی زیاتر ئاسانکاری بێت بۆ تێگەیشتنی ناوەرۆکی چوارینەکە، وە بە پوختی بکەویتە ژێر دەستی خوێنەران وە بەدلیان بێت.
هیوادارم توانبێتم کەلێنێکی کتێبخانەی کوردەواریم پڕکردبێتەوە لەبواری ئەدەبی و هونەردا، وە تیشکێکمان خستبێتە سەر ناسنامەی باباتاهیری هەمەدانی.
وەپاش تەواو کردنی ئەم بەرهەمە سەردانی گۆری بابا تاهیرم کرد لە هەمەدان لە وڵاتی ئێراندا، بینیم بایەخێکی باش دراوە کە شایانی ئەو نەمرە پایە بەرزەیە وە خەڵکێکی زۆر رۆژانە سەردان دەکەن جگە لەوەی دانیشتوانی شارەکە هەندێکیان یا لەناوچەکانی تر خۆیان بە موریدی بابا تاهیر دەزانن زیارەتی دەکەن.
لە ئەنجامی سەردانەکەمدا لەهەندی برادەر و شناس گەنجێکی حازر بوو لەوی لەگەڵ شمشاڵ ژەنێك بە ئاوازێکی ناسك لاوانەوەیەکی پڕ جۆش و ماتەمی کرد تەزی هێنایە گیانمدا هنۆی جولاندم وە فرمێسکی گەرم بۆ رۆحی پاکی رژاند.

هەیاس کاکەیی
٢٠١٠

# باباتاهیری هەمەدانی ناسراوە بە "عوریان"

**باباتاهیر و نازناوەکانی:-**

پێش دەست پێکردن بەو باسانەی پەیوەندیان بەباباتاهیری هەمەدانیەوە هەیە وام بەباش زانی واتای بابا و هۆی لکاندنی ئەم ووشە یە بەناوی تاهیرەوە روون بکەمەوە. ووشەی "بابا" وەك لەبەرگی سێیەمی دائیرەتو لمەعاریفی ئیسلامیدا هاتووە لە لا ۲۳۱ دەڵێ: ووشەیەکی تورکییە بەمانای باوك بەڵام بابا لەزمانی کوردیدا مانای باپیرە دەبەخشێت، هەروەك لەزمانی تورکی رۆژهەڵاتا. بەزۆریش لەزمانی تورکمانیدا وتورکیدا باوك بەووشەی "بەبە" یان "دەدە" ناو دەبرێت. جا لە زمانی تورکیدا واتای (باوکی هەبێت) ناوەکە واتایی (باوکە تاهیر) دەبەخشێت. لەتوررکی رۆژ هەڵات یان کوردیدا واتای (باپیرەی) هەبێت ناوەکە واتای (باپیرە تاهیر) دەبەخشێت. لە هەردوو باریشدا بۆ رێز لێنان و خۆشەویستی بووە. مامۆستا فەهمی کاکەیی لە گۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(۱۱)و(۱۲) لە لا ۸٤ دا دەڵێت:-نازناوی بابای بۆیە دراوەتێ چونکە پیرێکی خواناس و سۆفییەکی هەردەگەر بووە، جگە لەوەی بابا بە مانی باپیرە یان پیرەمێرد دێت، هەروەها پلەو پایەی ئاینیشە وەبەمانای (الاب)ی دیانەکان دێتەوە. د.مارف خەزنەدار لە لا ۱۸٤ ی مێژووی ئەدەبی کوردیدا دەڵێت:- بەکارهێنانی ووشەی بابا لەپێش ناو بۆ رێبەرانی ئاینی یارسان وە رێبازی دەروێشیزمی ئیسلامی لەکوردەواریدا هاوشانی ووشەی پیر بەکاردەهێنرێت.

بابا لای بەکتاشییەکان بەواتای (شێخ) دێت، کە نووسەری نامە لە دائیرەتولمەعارفی ئیسلامیدا لەبەرگی چوارەم لە لا ۳۷ دا دەڵێت:-

بەکتاشییەکان دان بـە هەڵـەکانیان دادەنێن لای بابا واتـە (شێخەکانیان)و داوای لێبووردنی لێ دەکەن، هەروا م.فەهمی کاکەیی بەزمانی د.محمد نوری عارفەوە دەڵێت: هەندێ کەس دەڵێن بابا یەکێکە لە ناونیشانەزۆر باشەکانی بەرەی بەکتاشیەکان وە بەو هۆیەوە بابایان داناوە بەیەکێ لەسۆفیەکانی خۆیان و دووریان کردۆتەوە لە ئەهلی هەق هەر وا دەڵێت:- لەراستیدا هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان ئەوەی باباتاهیر سەر بە بەکتاشییەکان بێت یان ئەهلی هەق چونکە ڕێبازي بەکتاشی زۆر لە ئەهلی هەقەوە نزیکە، بە ڕاي من لە ڕەچەڵەکدا هەر یەك ڕێبازە بەڵام بەکتاشییەکان لەگەل ڕێبەرەکەیاندا(مەحەمد وەلی بەکتاش) جیابوونەتەوە پاش ئەوەی تریقەتی لە سان سەهاك و سید ئەبو الوفا وەرگرتووە.

مامۆستای خوا لێخۆش بوو عەلائدین سجادی لەکتێبەکەیدا مێژووی ئەدەبی کوردی لە لا ١٧١ چ٢ دەڵێت ئەم ووشەیە لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەی لەبنەماڵەی شێخی ئاینین دادەنرێت بەتایبەتی بۆ ڕێز لێنان و خۆشەویستی، وە لە بەرگی سێیەمی دائیرتولمعارفی ئیسلامیدا هاتووە(ئەم ووشەیە بەناوی هەندێك ئەولیاوە ناونراوە)، زانا مەحەمد ئەمین زەکی لە خولاسەی مێژووی کوردو کوردستاندا لە لا ٢٩٢ دا لە باس کردنی عەلی ئیلاهیدا دەڵێت "کۆنترین وە گەورەترین پیاو لایان وەلییەك بووە بەناوی _بابا بزورك- باوکە گەورە)، بابابزورك یەکێك لە فریشتەکانی هاوچەرخی باباتاهیر بووە کەسەر بە بابا خۆشین بووە. لای ئەهلی هەق و عەلی ئیلاهییەکان هەروەها بەگەورەکانی کۆمەلی شاگردان ووتراوە بابا کە مافی ئەوەیان هەبووە ناوی(شاگرد) بدەن بەقوتابیەکانیان. وەك چۆن نووسەر لە دائیرەی مەعارفي ئیسلامیدا باسی کردووە لەبەرگی سێیەم بەهەر حاڵ ئەو ووشەیە بۆ ڕێز لینان و خۆشەویستی بووە، چونکە بابا تاهیر یەکێك بووە لەپیاوە پایەدارەکانی ئاینی ئەهلی هەق. جا ئەگەر سەرچاوەکەی

هەر لایەنێك بێت، بەکتاشییەکان کە بەزمان تورکن یان لە زمانی فارسیدا یان لای ئەهلی هەق و عەلی ئیلاهیەکان لە کوردستانی ئێراندا بەزۆری ئەو ووشەیە دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕایەکی ئاینی وە ئەو لایەنانە هەموو لەبیرو رای ئاینی زۆر لێکەوە نزیکن یان یەك سەرچاوەن. باش دەزانرێ کە ئەهلی هەقەکان زۆر پیاوی ئاینی تریشیان هەیە هەر بەم ناوە ناو نراوە وەك "بابایادگار، باباحەیدەر، باباسەرهەنگ، بابا ناوس....هتد"

باباتاهیر بە ناوی هەمەدانی و بەناوی لوریش ناو براوە چونکە یەکێك بووە لە شاعیرە گەورەکانی کوردی لورستان و هەمەدان ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکی لورستانەو لە هەمەدانەدا ژیاوە وەك لەم چوارینەیەیدا هاتووە لە کتێبی عەباس رەجەوی لە لا ٨٢ :

موئـــان ئەســـپیدە بـــازم هەمــــەدانی
لانـــــەدەر کـــــۆە دارم دەر نیهـــــانی
بـــەباڵی خـــود پـــەرەم کۆهـــان بـــە کۆهـــان
بەچـــــنگی خودکـــــەرەم نەخـــــچیرەبانی

فەهمی کاکەیی لەنووسینەکەیدا لە لا ٨٥ ی گۆڤاري مامۆستای کورد ژ(١١) و (١٢) بەم شێوەیە وەرگێراوەتەسەر زاری سۆرانی:

مـــن ئـــەو هـــەڵۆ ســـپییەم هەمـــەدانی
لانـــــەم لەکێوانـــــە بـــــە پـــــەنهانی
بـــەباڵی خـــۆم دەفـــڕم کێـــوان بـــەکێوان
بـــە چـــنگی خـــۆم دەکـــەم نەێـــچیروانی

وە دەڵێـت:- (لـە شـاری هەمـەدان هاتۆتـە دنیـاوە بۆیـە نازنـاوی هەمـەدانی وەرگرتـووە، هـەروەها دەڵێـت ئـەو زمانـەی کـەباباتاهیر چوارینەکانی خۆی پێ نووسیوە لەسەرەتادا دەبێ لورییەکی پەتی یان

لوری تێکەڵ بە فارسی بوویێت). باباتاهیر بێ شك بەلوریەکی پەتی هۆنراوەی نووسیوە، واتە بەشێوە زمانی ئەو ناوچەی کە لێی پەروەردە بووەو ژیاوە، هەرچەندە لەوانەیە لێرەو لەوێ لە هەندێ چوارینەدا ووشەی فارسی دزەی کردبێتە ناو هۆنراوەکانیەوە بە هۆی دراوسێتی هەردوو زمان وە هەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانە:

بەڵام لە کاتی چاپ کردنی چوارینەکان وەکۆکردنەوەیان زیاتر بەلای زمانی فارسیەوە وەریان چەرخانوە بە دەستکارییەکی زۆرەوە وەك لەکاتی بەراوورد کردندا زۆر بە ئاشکرا دیارە. ئەگەر وورد بینەوە لەم چوارینەیەی صدیق بۆرەکەی لەمێژووی ووێژەی کوردیدا بەرگی ٦ لە لاپەرەی ٩٣ دا بڵاوی کردۆتەوەو لێکی داوەتەوە بە روونی دەردەکەوێت، هەروەها د.مارف خەزنەدار لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردي بەرگی ١ لە ل٢٠٢ دا لەگەڵ صدیق بۆرەکەیی هەمان رایان هەیە لە نووسین و لیکدانەوەی ئەم چوارینەیە، وە ئەمەش دەقی چوارینەکەو لێکدانەوەی هەردوو ئەو بەرێزانەیە لە خوارەوە:-

ا-صدیق بۆرەکەیی:

ئەز ئان ئەسپیدە بازوم هەمەدانی
بەتەنهایی کەرۆم نە چیرەوانی
هەمە بەمنەو دیرنەد چەرخ و شاهێن
بەنام من کەرنەد نەچیرەوانی

واتەکەی: من ئەو بازە سپیە هەمەدانییەم کە بەتەنیایی نێچیرەوانی ئەکەم هەموو بەمنەوە چەرخ و شاهێنیان هەیە و بە ناوی منەوە نێچیرەوانی ئەکەن. ووشەی(ئەسپیدە باز) یان (بازی سپی) کە باباتاهیر لەهۆنراوەکەی دا هێناویە نازناوێکە بۆ خواناسانی پاییە بەرز کەلەو سەردەمەدا بە خوا ناسانیان داوە.

ب-د.مارف خەزنەدار دەلێت: ئەم دوو بەیتە هەنیٚ لەبیرو راکانی یارسان شی دەکاتەوەو دەخاتە روو، باباتاهیر کە خۆی بە بازی سپی دادەنێت لاسایی پێشەوایان و پیروانی یارسان و سۆفیزمی ئیسلامی دەکات، ئەمانە هەموویان خۆیان بە بازی سپی دادنێن، کردەکاریش شا بازە واتە شای بازان لە سەر ئەنجامدا باز عارفی تەواوە لە پاییەی پیردایە. شاباز رەنگدانەوەی یەکێتی بوونە هەموو بازانی تر بۆ ئەوە دەچن وە لە ناو یەکتریدا دەتوێنەوە.

هەروەها سیرۆس ئێزدی لە کتێبە کەیدا مێژووی ئەدەبیاتی فارسی لە ل٣٤٠ دا دەلێت:- زمانی لوری نزیك زمانی ساسانیەکان بووە کە(پارسیە) وە کوردەکانیش بەهەمان زمانی باباتاهیر قسەیان کردوە.

ئەمانە هەمووی ئەوە دەگەێنێت کە بابا تاهیر بە پێی جێگەو ناوچە نازناوی پیٚ دراوە خۆیشی لە یەك جیگەدا جێگیر نەبووە، وەك خۆرهەڵاتناس (سی، جی، ئەدمۆندز) لەکتێبی (کورد، تورك، عەرەب) لە ل١٧٧ دا دەڵێت:- باباتاهیر بەگشتی ناو دەبرێت بە هەمەدانی وە ئەمە هیچ گومانی تیادا نیە کە زۆربەی ژیانی لە هەمەداندا جیٚگیر بووە وە شارێکی زۆر دوورە لە لۆرستان، لەگەل ئەوەشدا کەبەهەمەدانی ناوی دەرکردووە خۆی بە غەریب زانیوە بەپێی یەکێك لە چوارینەکانی وەك لەکتێبی عەباس رەجەویدا هاتووە:-

موسـلمانان سـە دەرد ئـامو بەیـەکبار
غـەریبی و ئەسـیری و غـەم یـار
غـەریبی و ئەسـیری سـەهل ئـایۆ
غـەم یـار موشـکلە تاچـوون شـودکار

بەڕایی من ئەو غەریبی و ئەسیریەی باباتاهیر لێی دواوە مەجازیە کەخۆی لەم دونیایە بەغەریب و ئەسیری ژیان دەزانیٚ هەرچەندە ئەوانە

ئاسانن لەچاو ئەوەی غەمی هەرە گەورەی ئەو ئەوە بووە بگاتە خزمەتی مەعشوقەکەی لەرێبازی سۆفیگەری خۆیدا کە پەروەردگارە.بەڵام زۆر کەسان وا لێکی دەدەنەوە گوایە لە لورستان دوورەو لەشاری هەمەدان خۆی بە غەریب دەزانیٚ.

هەروەها بابا تاهیر پێی دەوترێت لوری ووشەی لوریش لورەکان دەگرێتەوە کە بە رەگەز کوردن وە لە خۆرئاوای ئێراندا جێنیشینن. وەخۆشی بەخەلکی لورستان ناسیوە پێش هەمەدان، کەبەزمانی پاراوی لوری چوارینەکانی هۆنیوەتەوە وەك فەهمی کاکەیی دەلێت لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١) و (١٢) لە لا ٨٥ دا ئەو زمانەی کە باباتاهیر چوارینەکانی خۆی پیٚ نووسیوە لەسەرەتادا دەبیٚ لوریەکی پەتی یان لوری تێکەل بە فارسی بوو بێت. " بە دلنیاییەوە زمانەکەی لوری بووە بەڵام زمانی دەسەڵات و زۆری بەربلاو زالٚ بووە وە کاریگەری خۆی کردووەتە سەری وەك فەهمی کاکەیی جارێکی تر دەلێت:- زمانی فارسی کارێکی زۆری تێکردوون وەهەندێك لە چوارینەکان تام و چێژو بۆن و بەرامە لوریەکەی خۆیان لەدەست داوە". وەیاخود دەستکاری کراوەو زیاتر بە لای فارسیان بردووە بۆ ئەوەی ناسنامەی فارسی بسەپێتە سەر باباتاهیر وەك شاعیر و بوێژێکی فارسی. هەروەها کاکەیی چوارینەیەکی باباتاهیر دێنێتەوە وەك نموونە کە زمانی لوری تیادا مولکایەتی دەردەکەوێت وە روالەتی لوریان پێوەماوە وەك:-

چە واچم هەرچە واچم واتەشان بی
سوخەن ئەز پێش واز کەم واتەشان بی
بەدەریا مو شودەم گەوهەر بەر ئارم
هەر ئان گەوهەر کەدیدەم واتەشان بی

وە لە هەمان کاتدا د.صدیق صفی زادە لەکتابەکەی نام ئاوەران یارسان لە لا٧٥ دا دەڵێت:- لە کتێبی سەرئەنجامدا هاتووە کە شاخوشین لورستانی (٤٠٦-٤٦٧ك) لە هەمەدان چووەتە دیداری باباتاهیر، وە باباتاهیر یەکێك بووە لە یارانی شاخوشین لە سەر رێبازەکەی.

هەروەها باباتاهیر نازناوی عوریانی دراوەتیٚ، سوك کراوەتەوە بۆ ئوریان لە کوردیدا ووشەی عوریان ووشەیەکی عەرەبیە بە واتای (رووت) ئەمەش لەگەل ئەو چیرۆك و بیروباوەرەی لای ئەهلی هەقەکان هەیە دەگونجێت کە دەڵێت:- باباتاهیر هیچی نەبووە واتا نەداراو نەبوون بووە وەگاوانی شاری هەمەدانی کردووەو لەشی رووت بووەو تەنها عەبایەکی شالٚ لەشی داپۆشیوە، لە سەرەتای ژیانیشیدا نەخوێندەوار بووە، وەبۆ زیاتر پشتگیری ئەو بروایە لە یەکێك لەچوارینەکانیدا دەڵێت:-

نەزونەم لوخت و عوریونم کەکردە
خودم جەللاد و بێ جونم کەکردە
بدە خەنجەر کەتاسینەم کونم جاك
ببینم عیشق پر جونم چە کردە

وەیان

بەبەندەم شال میپوشم قەدەگرا
بنازم گەردش چەرخ وفەلەکرا
بگەردم ئاب دەریا ها سەراسەر
بشویەم هەردوو دەست بێٚ نمەکرا

فەهمی کاکەیی لە گۆڤاری مامۆستای کورد ژ. (١١) و (١٢) لا٨٤ دا بەم شێوەیە ووشەی عوریان لێك دەدەتەوە:- نازناوی عوریان(رووت)ی

وەرگرتووە بەمانای بێ بەش لە مالی دونیاو سامان ودارایی، ئەم نازناوە (زاهیر-دونیا)یە، نەك (باتن-ئایین)ی بێت. چونکە عوریان بەمانای(باتنیەکەی-عورفانیەکەی) بەکەسێك دەوترێت کە پێشتر زاتێکی پێ بەخشرابێت پاشان ئەو زاتەی لێ وەرگیرابێتەوە واتە رووت کراوەتەوە.

هەروەها شێخ محمد خال دەربارەی هەژاری و نەبونی باباتاهیر لە گۆڤاری کۆری زانیاری کورد بەرگی(٥) لا٤٧، ١٨ لە سالی ١٩٧٧ز دەلێت:- لەشی جلی دراو و تەنك دایدەپۆشێت، بۆیە ناوبانگی دەرکرد بە عوریان واتە نەبووە. دووبارە دەلێت:- باباتاهیر وەك لە چوارینەکانیدا دیارە هەمیشە لە چیاکانی ئەلوەندا گەراوە و بە رۆژ گیای دەشتی دەخوارد لە جیاتی خۆراك وە لە شەودا بەردێکی دەنایە ژێر سەر لە چۆلەوانیدا لەجیاتی سەرین. دلزاریش زیاتر پشت گیری ئەم بروایە دەکات لە کتێبەکەیدا چوارینەیەکی باباتاهیر وەردەگێرێ بۆ زاری سۆرانی کە دەلێت:-

موئـان رەنـدەم کـەنامم بـی قەلەنـدەر
نـەخان دیـرم نـە مـان دیـرم نـە لەنگـەر
چـو روز ئایـە بگـەردم گـەردی گێتـی
چـو شـەو ئایـە بەخـشتێ وانـەهم سـەر

واتە:-

مـن ئـەو رەنـدەم کـەوا ناومـە قەلەنـدەر
نـە خـانم هـەس نـەمانم هـەس نەلەنگـەر
کـە رۆژ داهـات لـە دونیـادا ئـەخۆم خـۆل
کـە شـەو داهـات بەسـەر خـشتێ ئەکـەم سـەر

دەقی ئەم چوارینەیە لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی د.مارف خەزنەدار بەرگی یەکەم لا٢٠٤ دا هاتووەبەم شێوەی خوارەوە لەگەل

وەرگێرانی بۆ زاری سۆرانی کە خەزنەداردەڵێت باباتاهیر دوور بێ(مجرد) لەهەموو شت لەگێتی مەتریالیدا نیە ئەگەر لەوێ بێ مەبەست تێکدەچێت لەم لایانەوە دەڵێت:-

موئـــان رەنـــدەم کـــە نـــامم بـــی قەلەنـــدەر
نـــە خـــوون دیـــروم نـــەموون دیـــروم نـــە لەنگـــەر
چـــو رۆچ ئـــایۆ بگـــەردوم گـــەردی گێتـــی
چـــو شـــەو ئـــایۆ بەخـــشتێ وانەهـــەم ســـەر

واتە

مـــن ئـــەو رەنـــدەم کـــەناوم قەلەنـــدەرە
نـــە مـــالم هەیـــە نەســـامانم هەیـــە نەلەنگـــەر
کـــە رۆژ دادێ لەســـەر زەوی دەســـورێمەوە
کەشـەو دەکـشێ سـەرم لەسـەر خـشتێك دادەنـێم

وە لەپێشەوە روونمان کردەوە باباتاهیری هەمەدانی پیاوێکی پایە دار بووەو خاوەنی ریز لێنان بووە لە هەرجێگایەك ژیابێت هەرچەندە بەهەژاری ژیاوە، بەڵکو بەشوێنی تەنگ و چەلەمەی ژیاندا لەیەك جێگەدا جێگیر نەبووە، لەسەرەتاوە لە لورستان و پاشان لە هەمەدان و لە چیاکانی ئەلوەندا کە بەناوی لوری یان هەمەدانی یان عوریان نازناوی بۆ دانراوە.بەڵکو بیرو بروای ئەهلی هەقەکان وای لێکردووە کە هەمیشە بەناویاندا بگەرێ و بەسەریان بکاتەوەو ئامۆژگاریەکانی بلاو بکاتەوە ئەمە جگە لەوەی شاعرێکی سۆفی بەناوبانگ بوو لە دانانی چوارینەدا.

فەهمی کاکەیی لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١) و (١٢) لا٨٥ دەڵێت باباتاهیر سۆفیەکی عاشقی هەردەگەڕ بووە، لە شاری هەمەدان هاتۆتە دونیاوە بەم بۆنەیەوە نازناوی هەمەدانی وەرگرتووە.
راستە نازناوی هەمەدانی وەرگرتووە چونکە لەوێ ژیاوە بەڵام خۆی لوڕیەو لورستانیە، چ لەزمانەکەیدا دەردەکەوێت چ سەردانەکەی شاخۆشینی لۆرستانی سەردانی کردووە لەهەمەدان چونکە بابا تاهیر موریدێکی رێبازەکەی بووە لەدونیای سۆفیگەریدا.

## مێژووی ژیانی باباتاهیر

زۆربەی نووسەران و مێژوو نووس و خۆرهەڵات ناسان بریار دەدەن کە باباتاهیری هەمەدانی لە کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە وەك مامۆستا خوا لێخۆشبوو (علائدین سجادی) لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا چاپی(٢) باسی دەکات وە دەڵێت:-"لەسالی ٣٢٦ك-٩٣٥ز دا لە دایك بووە وەلەساڵی ٤٠١ك-١٠١٠ز دا کۆچی دوای کردووە لە هەمەدان" . واتە بە پێی ئەم مێژووە باباتاهیر ٩٥ ساڵ ژیاوە و گوایە هەر لەهەمەداندا مردووەو گلکۆي لەوێدایە. هەروەها مامۆستا مەحەمەد ئەمین زەکی لەمێژووی کوردو کوردستاندا لەلا٣٣٤دا هەمان مێژووی مردنی باباتاهیر دیاری دەکات، هەروەها د.صدیق صفی زادە(بۆرەکەی) لەکتێبی نام ئاوەران یارسان لە لا٧٤دا مێژووی ژیانی باباتاهیر لەنێوان ٣٩٠-٤٥٠ك دیاری دەکات واتە تەمەنی ٦٠ ساڵ ژیاوە. وە دەڵێت لە سۆفیگەری سەدەی پێنجەمی کۆچی بووە. مستەر براون لە دائیرتولمعارفی ئیسلامیدا لە بەرگی (٣) لە لا٢٣٢ دا دەڵێت:- کتێبی راحة الصدور و آیه السروری راوەندی دەستنووسێکی فارسی کۆنە لەکتێبخانەی پاریسدا لەلا٤٣ دا دەڵێت:-کاتێك تغرول سوڵتانی سەلجوقیەکان لە ساڵی ٤٤٧ك-١٠٥٥ز دا چووەتە ناو شاری هەمەدان لەسەر کێوی خدر تووشی باباتاهیر و هاوڕێکانی باباجەعفەر و حەمشاددەبێت لە

پێش چوونە ناو شار لەشکرەکەی رادەگرێت وە پیادە دەبیت دێتە لایان باباتاهیر ئامۆژگارییەکی کردوە ووتویەتی:- "ئەی تورك تۆ چی ئەکەی بەو موسلمانانە؟ ئەم مێژووە وادەکات کەساڵی کۆچ کردنی باباتاهیر پاش سالی ٤٤٧ك بووە. ئەم چیرۆك و مێژوویەش لەگەل مێژوویەکەی د. صدیق صفی زادەدا دەگونجیٚ کەتا ساڵی ٤٥٠ك ژیاوە. بەڵام لەگەل مێژووی لەدایکبوون کۆچی دوایی کەخوا لێخۆش بوو علائدین سجادی تێك ناگرنەوە. هەروەها بەمانای ئەم کورتە چیرۆکەی تغرول سوڵتان باباتاهیر هاوچەرخی ابن سینایە کە لە هەمەداندا مردووە لە ساڵی ٤٢٨ك ١٠٣٧ز داو پێش عمر خەیام بە سەد ساڵ لە دایك بووە وەك دلزار لە گەنجێنەکەیدا باسی دەکات. هەروەها بۆ زیاتر چەسپاندن مامۆستا رەشید یاسەمی لەگۆڤاری کۆری زانیاری کورد بەرگی (٥) لا ١٢٧ ساڵی چوونی سوڵتانی سەلجۆقیەکان لە هەمان مێژوو دیاری دەکات، د. مارف خەزنەدار لە لاپەرەی ١٨٥ دا دەڵێت: رەزا قولی خانی هیدایەت دەڵیٚ هەندیٚ بەهاوچەرخی سولتانی سەلجوقی دایدەنێن ئەمە راست نییە، بابا تاهیر لە شێخە کۆنەکانی هاوچەرخی دیلەمییەکان بوو، لە ساڵی ٤١٠ی کۆچی پێش عونسری وە فردوسی وە هاوچەرخەکانی ئەوان کۆچی دوایی کردووە. ئەم هەموو مێژوو و بەڵگانە ئەوە دەگەیەنن کەلەدایك بوونی باباتاهیر لەسەدەی چوارەمدا بووە. لێکدانەوەیەکی چوارینەکانی باباتاهیر زیاتر ئەو بروایانە دەچەسپێنێت بۆ ژیانی یەك لەوانە کەدەڵێت:-

مەن ئان بەحرەم کەدەر ظرف ئامەدەستم
چون نوقطە بەر سەر حەرف ئامە دەستم
بە هەر ئەلفیٚ قەدی بەر ئایەد
ئەلف قەدم کە دەر ئەلف ئامە دەستم

صديق بۆرەکەی لەمێژووی ووێژەی کوردیدا بەم شێوەییەی نوسیوەو راڤەی کردوەلە لا٨٦دا:-

مەن ئان بەحرەم کەدەر ظرف ئامەدەستم
چون نوقطە بەر سەر حەرف ئامە دەستم
بە هەر ئەلفی قەدی بەر ئایەد
ئەلف قەدم کە دەر ئەلف ئامە دەستم

واتە من وەکو ئەو زەریاو دەریایەم کە لەپیالەیەك دا دەرکوتووم وەمن ئەو نوختەو خاڵەم کەلەسەر پیتێکدا پەیدا بووم لە پایان و دوایی هەر هەزار ساڵدا ئەلف (هەزار) ئەندامیێ دەردەکەوێت وەمن لەو ئەلف ئەندام و باڵا راستەی وەك ئەلفم کە لە ئەلف یا هەزارەدا هاتوومەتە جیهانەوە.
لێکدانەوەی ئەم چوارینەیە لە دائیرەتولمەعاریفی ئیسلامیدا کەهی (مەهدی خانە) یان (میرزا مەهدی خان) کە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد لەبەرگی پێنجەم دا هاتووە ئەم لێکدانەوەیەش لەگۆڤاری(جمعیە الاسیویە) لە (بەنغال) یان(مجمع ئاسیای بەنگالێ) ژ.(٢) ساڵی ١٩٠٤ز بلاو کراوەتەوە وە دەڵێ: من ئەو دەریایەم کە چووەتە ناو کەمۆلەیەکەوە من ئەو خاڵم چووتە سەر پیتێك، لەهەر هەزارێکدا (واتا هەزار ساڵ) پیاوێکی راست دەردەکەوێ دەڵێ وەك هەزار (الف قەد) من ئەو کەسەم کە لە هەزارە داهاتووە. واتا وەك نووسەر دەڵێ لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کولاد ژ.(٥) ساڵی ١٩٧٧ز لە لا ١٢٧ دا ( خۆی بەیەکێك لەو پیاوە گەورانە داناوە کە لەسەری هەموو هەزار سالێکدا خوا یەکێکیان دەنێرێ).
ووشەی(الف قەد) یەکسانە لەژمارەدا بە ٢١٥ وەیەکسانە بە ووشەی دەریا کە دەڵێ:- کە ووشەیەکی فارسییە بەمانای(بحر) و هەروا یەکسانە بە ووشەی (تاهیر) کەناوی شاعیرە.ئەگەر ووشەی (الف قد)مان خستە سەر هەزار کە یەکسانە بە (١١١) ئەنجامی کۆدەبێتەوە(٣٢٦) ئەم ژمارەیەش

یەکسانە بە هەزارەی فارسی. هەروا نووسەر دەڵێ :-بەم شێوەیە (مهدی خان) مێژووی لە دایکبوونی باباتاهیر لێك دەداتەوە، واتە: باباتاهیر تاساڵی ٤٠١ك ژیاوە و لەهەمان کاتدا دەڵێ:- بەڵام ئەم لێك دانەوەیە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسترێ و راست بێت!!. د. مارف خەزنەدار لەلاپەرەی ١٨٦دا ئەم چوارینەیە بەم شێوەیەی خوارەوە لێك دەداتەوە مێژووی لەدایکبوونی باباتاهیر مامۆستای خوالێخۆشبوو (عەلائەدین سجادی) و (مهدی خان) یەك مێژووە (٣٢٦ك-٩٣٥ز) هەروا کۆچی دوایی لە(٤٠١ك-١٠١٠ز) بە پێی ئەو لێکدانەوانەی پێشوویان.لەهەمان کاتداوا دادەنرێت کە هاوچەرخی(سلطنة ابو طالب رستم بن فخرالدولة)بووە کە نازناوەکەی(مجدالدولة)یە لە ساڵانی(٣٨٧-٤٢٥ك)دایە. لەنوسینەکانی مامۆستا فەهمی کاکەییدا هاتووە لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١)و(١٢) لا٨٢ دەڵێت:-لە(مجمع الفصحی)دا هاتووە باباتاهیر بەر لەساڵی(٤١٠ك) کۆچي دوای کردوە.

وەلێکدانەوەیەی کە د.مارف خەزنەدار هەیە دەربارەی ئەو شعرەی باباتاهیر وپاشان دەڵێت:- ئەم دووبەیتە نهێنی و معمایەکی زۆری تیادا هەیە. (بروانە مێژووی ئەدەبی کوردی بەرگی(١) لا١٨٦ وە ئەسنەوی فەلسەفەی باباتاهیر دەخاتە روو لەبارەی یەکێتی بوونەوە)، لە کۆتای لێکدانەوەکان بەگشتی فەهمی کاکەیی دەڵێت:- من پێم وانیە ئەم لێکدانەوەی د.مارف ڕاست بێت هەروا دەلێت نە مەتەلێکی قورسە وەك مامۆستا علائدین سجادی دەڵێت نەنهێنی معمایەکەی زۆری تیادایە.

ئەگەر بەشێوەیەکی قوول و فەلسەفیانە وورد بینەوە لەشعرەکانی باباتاهیر ماناو واتای دی دەبەخشێت زۆر فراوانتر لە ناخی ڕێبازی سۆفیگەریتیدا، بەمانا مەجازیەکەی، کە لە پاشاندا لێی دەدوێین لە لێکدانەوەی چوارینەکاندا.

لە لایەکی ترەوە (تەیفور ئابادی)لە(معجم البلدان)بەشی شەشەم لا۸۰دا لەسەر زمانی (شیرەوەیە بن شەهردار) دەڵێت:-"تاهیر کوری عبدالله کوری عمر کوری یحیا کوری عیسا کوری ماهیلە ئبابەکری زاهیدە لە ساڵی۲۰٤ك کۆچی دوایی کردووە وە لەگۆرستانی (نەشیتە) لە هەمەدانە وە خەلك رۆژانە زیارەتی دەکەن وە زۆر بەرچاوە". بەڵام شێخ مەحەمەدی خاڵ لەبەشی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد لا۳۰دا دەڵێت:- "خوابگاهی باباتاهیر لەسەر تەپلۆکێکی بچووك لەژووری خۆرئاوای شاری هەمەدان وە لەگەرەکی(بن بازار) لەلایەن موسلمانەکان وە هەموو خەلکی دی زیارەت دەکرێ" لێرەدا جیاوازیەکی دیاری کراو هەیە لەبوونی خوابگاهی باباتاهیر لەنێوان بۆچوونی تەیفورئابادی و شێخ محمدی خاڵ". دەبێ ئەو باباتاهیرەی تەیفورئابادی باسی دەکات ئەوە نەبێ کەشێخ مەحەمەد خاڵ باسی دەکات.

دەربارەی نەسەبی باباتاهیر کەدەکاتە برای باباعلی هەمەدانی لەنامێلکەی(الاوراد الکسنەزانیە) لا۲۷دا هاتووە:-"بابا علی همەدانی کوری سید یوسفی هەمەدانی کوری سید مەحەمەدی منصور کوری سید عبدالعزیز کوری سید عبدالله کوری سید اسماعیل کوری ئیمام موسای کازم". کە بەراوردیان بکەین لەگەل ئەوەی تەیفور ئابادی باسی دەکات لەسەر زمانی شیرەوەی بن شەهردار جیاوازیەکی ئاشکرا بەدیدەکرێت لە نەسەبی باباتاهیری هەمەدانی. لەهەموو ئەو لێکدانەوەو گوفتارانەی پێشوودا دەردەکەوێت کە باباتاهیر لەکۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچی و سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچی ژیاوە، زۆربەشیان مێژووی لەدایکبوونی لە۳۲٦ك وەکۆچی دوای لەساڵی ٤۰۱ك دەستنیشان دەکەن، بەڵام صدیق بۆرەکەیی(صفی زادە) لەمێژووی ویێژەی کوردیدا لە لا٨٦ روونکردنەوەیەکی فراوانتر دەداتە میدان وە دەڵێ:-"باباتاهیر لەنێوان

٣٩٠-٤٥٠ك ژیاوه هەروەك لەکتێبی نام ئاوەرانی یارسان هەمان مێژووی دیاری کردووه که لەپێشەوه ئاماژەمان پێی کرد. هەروەها گەلێ لە زانایان لایان وایه که باباتاهیر هاوچەرخی سەلجووقیەکان بووه بەڵام لە راستیدا وانیه، کەچی لەسەردەمی دەیلەمیەکان ژیاوه لەساڵی ٤١٠ك ماڵئاوای لە ژیان کردووه.

## باباتاهیر کێ بوو.....؟

خەلکی لورستان و دانیشتووی شاری هەمەدان بووه وەك باس کرا لەکۆتای سەدەی چوارەمی کۆچی لەو ناوچانەدا ژیاوه، خووشکێکی هەبووه بەناوی (فاتمه لەره)، شیخ محمد خال لە لاپەرەی ٣٠ی دا لە بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆری زانیای کورد دەڵێت هەندێ بە خوشکی دازانن وەهەندی بە موریدی راستەقینەی بابا تاهیر دەزانن وەهەندێکیش بە دایانی دەزانن وە ئەحمەد تاقانەش لە لاپەره ١٣ی کتێبەکەیدا هەرهەمان بۆچونی شیخ محمد خالی هەیه. وه هەندێ لە مێژوو نووسان خۆرهەڵات ناسان و نوسەران باسیان کردووه که باباتاهیر برایەکی هەبووه بەناوی بابا عەلی هەمەدانی وه هەنێکیشیان دەڵێن گوایه بابا عەلی کوری خوشکیەتی بەمانای خوشکەزای باباتاهیر بووه، واته پەیوەندی نێوان خاڵۆ خوارزایەتیه، بۆ روونکردنەوەی ئەم پەیوەندیانەش لەپاشان بەدرێژی باس دەکرێت. باباتاهیر گاوانی شاری هەمەدان بووه بەپێی بروای ئەهلی هەقەکان، بەلگەشیان بۆ ئەم مەبەسته ئەوەیه کەچوارینەیەکی باباتاهیر دەگێرنەوەو باسی دەکەن وەك لەکتێبەکەی عباس رەجەویدا هاتووه لە لا٥٣دا:-

ئەگــەر دەســتم رەســد بەرچــەرخی گــەردوون
ئــەز و پرســەم کــەئین چوونەســت وئــان چــوون
بەیـــەکیٚ را دادەئـــی ســـەد گونـــە نیعمـــەت
بەیـــەکیٚ را نـــان جـــۆ ئـــالودەی دەرخـــوون

لـەباس کردنـی ئـەم چـوارینەیە دەڵـێ گوایـە ئێوارەیـەك لـەگاوانی هاتۆتـەوە نانی لـەماڵان کۆکردۆتـەوە سەگێك پەلاماری داوەو برینـداری کـردووە خـوێنی برینەکەی رژاوەتـە سـەر نانـەجۆکان کەبەدەستیوە بـووە، لـەژێر ئـازارو ئەشـکەنجەی ژیـان و ئـەو رووداوەی بەسـەریا هـاتووەرووی کردۆتە ئاسمان و ئەو چوارینەیەی گووتووە.

لە هەمان رۆژدا باباخۆشین[1]* مێوان بووە لەماڵی دا، لەگەرانـەوە لێـی پرسیوە چی دەوێت؟ وە لەمێژووی وێژەی کوردیدا د. سدیق بۆرەکەی لە لاپەرەی ٨٨دا هەمان شت روندەکاتەوە ئەگەر وابێت لە دایـك بـوونی شا خۆشی لە ساڵی ٤٦٠ی کۆچیدا بێت وە لەدایك بونی بابا تاهیر لـە ٣٩٠ی کۆچیدا بێت، شاخۆشین ١٦ سـاڵ پاش لـەدایك بـونی بابـا تـاهیر لـەدایك بـووە واتـا هاوچـەرخی یەکـەن هـەروا کۆچـی دوایـشیان بابـا تـاهیر لـە دەوروبـەری ٤٥٠ی کۆچـی بـوە وە بابـا خۆشـی لـە ٤٦٧ی کۆچـی بـووە. بەڵام د. مارف خەزنەدار بڕوایەکی کەی هەیە لـە لاپـەرەی ١٨٨دا دەڵێـت بابا خۆشی پێنج سال پاش کۆچـی دوایـی بابا تـاهیر لـەدایك بـووە، وەلـە کتێبـی نـام ئـاوەرانی یارسان د. بۆرەکەی لە لاپـەرەی ٦٥دا دەڵێـت: کـە شاخۆشـین لـە سـاڵی ٤٠٦ی کۆچـی لـەدایك بـووە وە لـە ٤٦٧ی کۆچـیدا

---

[1] بابـا خۆشـین، شاخۆشـین، مبـارەك شـا، یەکێکـە لـەنوێ کـەرەوەی رێبـازی یارسـان وە سەرپەرشتیکردنی، باباتاهیر نزیکترین کەس بووە لێی سەفەری کـردووە بـۆ ئەلوەنـدو هەمـەدان ئاشنایی لەگەڵ باباتاهیر پەیدا کردوە (د. گولمردا مورادی).

کۆچـی دوایـی کـردووه وه باباتـاهیر دەسـت نیـشان کـردووه لـه (٣٠٩ بـۆ ٤٥٠)ی کۆچـی پەیوەندیـشیان بـەپێی بروایـان فریـشتەی چـوارەمی باباخۆشین بـووه، ئەحمـەد تاقانـه لـه لاپـەرەی ٢٤ دا دەڵێت دۆزینـەوەی کتێبی سەرەنجام کتێبی رێبـازی ئـەهلی حـق توانیویـەتی بـه شێوەیەکی چەسپاو بابا تاهیر له جێی راستەقینەی خۆیدا دابنێت لـه نـاو بیر و بـاوەری ئەم رێبازه بەڵام له هەمان کاتدا دەگێرنەوه باباخۆشین بۆته مێـوانی فاتمـه لـەرەی خوشـکی ئـەو کەهاتووەتـەوه لەخۆشـی ئـەو مێوانـه ئازیزەی بـەتاو رۆیـشتوه بـۆ مالـەوه تـا ببینێـت سـەری دەرگـەی مالەکـەی داوەو خـوێن بەسەرو چاویدا هاتۆته خوارەوه نـان بەدەستی بـووه لەگـەل خـوێن رەنـگ بووه جا ئەو چوارینەیەی ووتوه له حوزوری شاخۆشیندا ئـەویش تووەبووه بەڵام خوشکی تاهیر داوای لێبووردنی بۆی کردوه، ئینجا ئەویش بەپرسیار ووتویەتی گەنج و خەزێنەی دەوی؟

برادەرێکـی خـەلکی شـاری مەنـدەلی گێرایـەوەو ووتـی:- بـروا وابـووه کـه باباتـاهیر کـەرێکی هـەبووه وەبـژێوی رۆژانـەی بـەو کـەره پەیـدا کـردوه، جارێکیان لەسواری کەرەکەی به پارچـه ئاسنێك یـان تێلێکـی نـووك تیـژ لـه ملی کەرەکەی دا بۆ ئەوەی هانی بدات خێرا بـروات کەچـی برینـدار بـوو وه خـوێن هاتـه خـوارەوه ئـەو نانـەی بەدەستیەوه بـوو خوێنـاوی بـوو وه چوارینەکەی پێشەوەی ووت.

بـەڵام شێخ مەحەمـەدی خـاڵ دەڵێـت بـه زمـانی زانایـەکی ئینگلیزیـەوه بـەناوی(ئـەدوارد هـرن) گوایـه باباتـاهیر لەپێـشان دار فـرۆش بـووه داری لەچیاکانی هەمەدانەوه هێناووه وه فرۆشتوویەتی و پێی ژیاوه، له سـەرەتای ژیانی نەخوێندەوار بووه پاشان چووه بۆ یەکێك له قوتابخانه ئایینیەکان.

ئـەم دار فرۆشـییەی باباتـاهیر دەگونجێـت لەگـەل ئـەو بروایـەی خـەڵکی شـاری مەنـدەلی گوایـه کـەرێکی هـەبووه، دەبێـت بـەو کـەرەی دار و

سووتەمەنی لەچیاکانەوە هێناوە بۆ فرۆشتن و وە بژێووی ژیانی. بڕوایەکی تر هەیە لە لایەن ئەهلی هەقەکان گوایە باباتاهیر پیاوێکی زاناو کەرامەت دار بووە، بۆ هەمان مەبەست عەباس ڕەجەوی لەکتێبەکەی بەناوی دیوان کامل باباتاهیر عوریان کە بە زمانی فارسیە پاڵ پشتی ئەو بڕواییەی ئەهلی هەق دەکا و دەڵێ:- لە باس کردنی یەکێك لە کەرامەتەکانی باباتاهیر ڕۆژێك دەروێشێك چووە بۆ دیتنی باباتاهیر لە هەمەدان لە کاتی نیوەڕۆ دەگاتە لای لەبەر ئەوەی باباتاهیر هەژار بووە خۆراکی نەبووە تابۆ دەرویشەکە بهێنێ بەڵام پێی دەڵێ لای من نیوە ڕۆژەکەت بکە خوا خۆی ڕازقە، دەروێشەکە لەگەل باباتاهیر نوێژیان دەکرد لە غەیبەوە سفرەیەك خۆراك هاتۆتە پێشیان کە جورەها خۆراکی لێبوو، بەدەروێشەکەدەڵێت ناوی خوا بهێنەو خۆراك بخۆ، دەروێشەکە دەستی درێژ کردووە بۆ سفرەکەنان بخوات تەماشای کردووە هیچ لەپێشی نیە، وای زانیوە باباتاهیر خەریکی سحر کردنە، بەڵام بابا زوو تێی گەیشتووە کەچی لەمێشك دایە پێی ووتوە:نەخێر یادەروێش تۆ ناوی خوات نەهێنا، ناوی خوا بێنەو چیت دەوێ بخۆ، دەروێش بەقسەی دەکات و دەست دەکاتە خواردن. لە هەمان کاتدا دەلێن گوایە باباتاهیر لەخەودا فێری ئوسولی ئایین و زانست دەکرا.

زیاتر مامۆستا علائدین سجادی پاڵپشتی پەیوەندی نێوان باباتاهیر و ئەهلی هەقەکان دەکات لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا دەڵێت:- ناسین و زانینی نێوان باباتاهیرو ئەهلی هەقەکان ئەوەیە کەبابا بە فریشتەی چوارەمی خۆشین دەزانن، چونکە لە سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی ئەهلي هەق یەکەم جار لە لورستان دواجار لەنزیکی سیروان و ئازر باینجان بوو، لەهەمان کاتدا نووسەری دائیرەتولمعارفی ئیسلامی بەرگی(٣) دەڵێت:- شاخۆشین کەشێوەی خوایی بووە لەلورستاندا دەرکەوت وە ئەم

فریشتانەی هەبوون کەبەریز دێن(بابابزورگ، کاکە رەدە، کوڕ فەقی، باباتاهیر، مامە جەلالە) باباتاهیر یەکێکە لە دانەری بروای ئەهلی هەقەکان و هاوچەرخی باباخۆشینە نەك وەك مامۆستا علائەدین سجادی دەڵێت( دایدەنێن بە فریشتەی چوارەمی خۆشین) . باباتاهیر پەیوەندیەکی تەواوی هەبووە لەگەل ئەهلی هەقەکان و هەمیشە شیعرە سۆفیەکانی دەنارد بۆیان ئەوانیش پەیوەندی تەواویان هەبووە بەهۆی ئەو بڕوایەوە.

مەحەمەدی حەمەی باقی لەکتێبەکەیدا(مێژووی مۆسیقای کوردی)لا٣٢ دەڵێت:- موبارەك شا پیاوێکی سالم و ناسك بووە وە لەماوەیەکی کورتدا دیدەنی باباتایری شاعیری ناسراوی کردووەو دواتر رێی کرمانشا گرتووەتە بەر بەڵام مردن مەودای نەداوە وە لەدەورووبەری هەرسین لای خۆرئاوای کرمانشا لەرووباری گاماسی ئاب( گاماسیاو) دا خنکاوە.

یاخود باباتاهیر سەرۆکێکی ئایینی ئەهلی هەقەکان بووە مامۆستا عەلی سەیدۆ گۆرانی لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی(٢) بەشی (٢)دا لە لا١١٠ دەربارەی لور-لورستان نووسیویەتی و دەڵێت:- "خۆیان لە ئەهلی هەقن کەناسراون بە علی ئیلاهی وە سەرۆك ئاینی گەورەیان شاعیری بەناوبانگ باباتاهیرە". واتە بڕوای ئەهلی هەق بڵاو بووە لە ناوچەکانی کوردستان وە هەڵگری ئاڵای ئەو بڕوایە باباتاهیرو هاوچەرخەکانی بوون.

زۆربەی شعرەکانی پلەیەکی بەرزی هەیە لەکتێب و ئەدەبیاتی ئاینی ئەهلی هەقدا، روداو و چیرۆکی زۆر دەگێرنەوە دەربارەی رەوتی ژیانی هەروەها دەڵێ هەر یەکێکیان بەهۆی بڕوایان بە خودی خۆی و بڕوا ئایینیەکەی جێگیر بۆتەوە. باباتاهیر زۆربەی ژیانی لە هەمەداندا بردۆتە سەر بەڵگەش بۆ ئەوە مێژووی ژیانی وەبوونی خوابگاهی لەوشارەدا، لە لورستاندا ناوی گەرەکێك بە ناوەی باباتاهیرەوە ناونراوە بەهۆی کاریگەرێتی بەسەر ناووچەو دانیشتواندا هەروەك دەردەکەوێت کۆچەر و

سۆفیەکی خوایی بووە وە جوانی و پاکی سرووشتی خۆش ویستووە وە زۆربەی ژیانی لەچیاکانی ئەلوەندا بردۆتە سەر لەنێو گوڵ و گوڵاڵکی ناوچەکەدا وە ئەو هونەرو بیرانەشی لەسحری سروشتەوە وەرگرتووە. وەك باسمان کرد باباتاهیر خوشکێکی هەبووە بەناوی( فاتمە لەرە ) وە هەندێك ناوی دەبەن بە (بیبی فاتمە) بەڵام هەندێك لە نووسەران جیایان دەکەنەوە کە گوایە (فاتمە لەرە) خوشکی بووە وە (بیبی فاتمە) دایانی بووە، ئەم ڕایەش مامۆستا علائدین سجادی دەیدرکێنێ لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا لەلا ١٧١ دا دەڵێت:-"خوابگاهی خوشکەکەی (فاتمە لەرە) لەگەڵ یەکێکی تردا کەپێی دەووترێت فاتمە لەگەڵ میرزا عەلی کەوسەر کەلەدەروێشەکانی بوون لەهەمەدان دایە لە کوچەی (بن بازار) لەسەر بەرزاییەکی بەر چاو دایە". زۆری کەش ئەو بیبی فاتمەیە بەدایەنی باباتاهیر دەزانن کە یەکێك بووە لە خێڵی شاهی لە گۆران وە خزمەتی باباتاهیری کردوەو هەر لەهەمان جێی باباتاهیریش بەخاك سپێدراوە وەك دەردەکەوێت باباتاهیر دوو ئافرەتی فاتمەناوی لەگەڵ دابووە یەکەمیان فاتمەلەرەی خوشکیەتی دووەمیان بیبی فاتمەی دایانیەتی، بەڵام هەندێکی تر لەیەکیان جیا ناکەنەوە بەیەك کەسیان دەزانن کە ئەو دوو نازناوەیان پێ دراوە. وەك سی جی ئەدمۆز لەکتێبی (کورد-تورك-عەرەب)دا لەلا ١٧٥ دەڵێت:-"فاتمە لەرە هەر ئەو بیبی فاتمەیە بووە کەخوشکی ئەسحابەی بەناوبانگ باباتاهیر بووە". شێخ مەحەمەدی خاڵ لە بەرگی سێیەمی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا لە لا ٢٣٨ بەزمانی مسیۆ(کلیمانت هیوا) دەڵێت:-"باباتاهیر و خوشکەکەی بیبی فاتمە ناسراو بوون لەئێراندا بە دوو مرۆڤی پاك و خواپەرست". لەهەمان کاتدا مستەر جۆبینۆ لەکتێبەکەیدا کەلەپاریس لەساڵی ١٨٥٩ز چاپ کراوە وەلەلا٣٤٤ ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی بەرگی سێیەمدا دەڵێت:-"ئەهلی هەقەکان ڕیزی

سۆفییه بەناوبانگەکانیان دەگرن وەزۆربەی شوێنەکانیان به ناوی ئەوانەوە ناودەنێن بەپێی بروایان به تایبەتی باباتاهیر که زۆر ریزی شعرەکانی دگرن که بەزمانی لوری نوسراوە هەروا خوشکەکەی بیبی فاتمە". بەپێی بیرو رای ئەوانە باباتاهیر تەنیا خوشکێکی هەبووە هەندێ جار به فاتمه لەرە وە هەندێ جاریش به بیبی فاتمە ناوبراوە. له بۆچوونێکی تری د. گوڵمراد مرادی لەکتێبەکەی بەزمانی فارسی بەناوی نیگاهی گوذارا بەتاریخ وفەلسەفەی ئەهلی هەق(یارسان) له لا٧٦دا دەڵێت:-" دەڵێن فاتمه لەرە شەریك ژیانی باباتاهیر بووە چوونەته خزمەت شاخۆشین و هاورێکانی".
د.صفی زادە لەکتێبی دانشنامەکەی لەلا٧٥دا دەڵێت:-"کاتێك شاخۆشین چووە دیدار باباتاهیر له هەمەدان فاتمه لەرە ویستی ببێت بەهاورێی شاخۆشین و بڕوات بەڵام باباتاهیر کەلەزووەوە حەزی له هاوسەری فاتمه بووە له دلی خۆیدا دەیویست به شاخۆشین بلێت و داخوازی بکات شاخۆشین لەخواستی ئەو بەئاگابووە پێی ووتوە هاوسەری ئێوە لەرۆژی(پەسلاندا)دەبێت". ئەحمەد تاقانە له لاپەرەی ٢٥دا بەم شێوەیە باسی دەکات: فاتمە دەیەوێ شوێنی پێی سولتان هەڵبگرێت سەری دەخاتە سەر رانی و گیان دەسپێرێ لەبەر ناوچونی فاتمەش سولتان دڵی بابا تاهیر دەداتەوە بەڵێنی به فاتمه گەیینی رۆژی پەسلانی دەداتێ هەروەکو بەلێنی مەجنون وە لەیلا به پێی بۆ چوونی د. صفی زادە فاتمه لەرە خوشکی باباتاهیر نەبووە، بەهەر حال تێکەڵاویەك هەیە لەبۆ چوونەکاندا بەڵام به گشتی بڕوای ئەهلی هەقەکان وایە کەفاتمە لەرە خوشکی باباتاهیر بووە، دەبێت ئەو فاتمەی کەناوی دەهێنن ئەوە بێت کەباباتاهیر ویستوویەتی هاوسەری لەگەڵدا بکات وە شاخۆشین بەو شێوەیە وەڵامی داوەتەوە.

فەهمی کاکەیی لە گۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١)و(١٢) لە لا(٨١)دا دەڵێت:-" باوکی باباتاهیر ناوی فەرەیدوون بووە پشت بە چوارینەی ژ.٢٥٧دەبەستێت هەروەها کوڕێکی هەبووە بەناوی فەرەیدوون پشت بە چوارینەی ژ.٨٣ دەبەستێت کەیەکەم چوارینە باوکی مردوە پێیدا ووتوە وە لە دووەمدا گۆرەکەی مردووەو پێدا ووتوە، بەپێی ئەوبروایە دەبێت هاوسەری هەبووبێت، بەڵام لەبڕوای یارسان باباتاهیر نەچووەتە دونیا ئەمەش لەراستیدا زیاتر نزیکە، کیٚ دەڵێت باباتاهیر بەخێڵی فەرەیدوونی نەبێت کە زارادەشت یەکێك بووە لەنەوەکانی خێڵەکە و هەڵکەووتوە وەك پێغەمبەرێك ئاینەکەی بڵاوبووەتەوە وە بناغەی یارسان لەسەرەتادا دەگەرێتەوە سەر ئەو ئایینە، هەرچەندە لەپاشاندا چووەتە ژێر چەتری ئیسلامەوە وەك رێبازێك.

ووشەی بیبی پێناسە کراوە لەزمانی عەرەبیدا بەمانای ئازادکراو دێت، کەلەزمانی ابن بطوطة وە نووسراوە لەگۆڤاری (العربي) کوێتی ژ.(٢٤٥) لەساڵی ١٩٧٥ز هەروەها جارێکی تر لە ژمارەیەکی تری ئەو گۆڤارە کە ژ.(٢٤٨)ە لە ساڵی ١٩٧٩ز لەلا١٣٩دا ئەو ووشەیە پێناسە دەکەن و دەڵێن:- "بیبی ووشەیەکی تورکی رۆژهەڵاتە یان هندیە وە نازناوێکە بۆ خانمی ماڵ هاتووە ویان نەنك دەگرێتەوە" لەگەرمیاندا بە دادا ناودەبرێت واتەدایکی دایك، بڕوای ئەهلی هەقەکان وایە باباتاهیر تەنیا خوشکێکی هەبووە بەناوی فاتمە لەرە هەردووکیان لەو ناوچانەدا ناسراون واتە ئەو بیرو باوەڕە ئایینیە لەبنچینەدا لە لوڕستان سەری هەڵداوەو باباتاهیر یەکێك بووە لەو کەسانەی بڕوای پێی هەبووە وەگەیاندویەتیە ناوچەی هەورامان لە ناوراستی سەدەی یازدەی زاینیدا وە لەوێدا ناوبانگی دەرکردوە تانزیکەی پەنجا ساڵ، وەیەکێك بووە لەگەڵ شاخۆشین سەر پەرشتی وەرابەڕایەتی ئایینەکەی کردووە، کاریگەرێتی بەهێزی بووە بۆ

بڵاوبوونەوەی ئەو ئایینە لەناوچەکانی کوردستاندا بەزۆریش بەهۆی توانای بەرزی صۆفیەتی و بەهرەی گەورەو بێ هاوتای شیعر و ئەدەب و رەوشتی بێگەرد و خاوێن وە دەروونێکی پاك و بێ هاوتای واتە گونجاوی سیفەتەکانی لەگەڵ بڕوای ئایینی وای کردوە زیاتر بەرێز و پایە بەرز بێت وە بچێتە دڵەوە. بەهۆی ئەوە هەندێ چوارینەی باسی ئیمامی حەسەن و ئیمامی حوسین وە رووداوەکانی کەربەلاء دەکات هەندێك بەشیعە لەقەلەمی دەدەن، وەك ئەم چوارینەیەی کە دڵزار گۆریەتی سەر زاری سۆرانی لەکتێبەکەی گوڵزار لەلا١٥١دا دەڵێت:-

ئـــــەو دڵـــــــدارە گیرۆدەی بەڵایـــــــە
ئـــــەیوب ئاســـــا بـــــەکرمان موبتلایـــــە
حەســـــەن ئاســـــا بنۆشـــــێ کاســـــەی ژەهـــــر
حوســـــین ئاســـــا شـــــەهیدی کەربەلایـــــە

وەك زانراوە بیرو ڕای ئەهلی هەقەکان لەسەردەمی ئایینی ئیسلامدا سەری هەڵداوەو گەشەی کردووە وە باباتاهیر یەکێك بووە لە جەمسەری بەهێزی ئەو ئاینە، شتێکی شاراوە نیە کە ئایینەکە تێهەڵکێشی تیادا روویداوە وە کاری کردۆتە سەر شیعرەکانی باباتاهیر. لێرەدا مامۆستا مەحەمەد ئەمین زەکی لەمێژووی کوردو کوردستان لە لا٢٩٢دا پاڵپشتی ئەوە دەکات و دەڵێت:-"لوڕی بچووك بڕوایان زۆر سەیرو شاراوەیە کەلەبڕوای علی ئیلاهی دەچێت، کە هیچ پەیوەندیەکی ئەو تۆیان بە ئیسلامەوە نیە". لە لایەکی ترەوە شێخ مەحەمەد خاڵ لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی پێنجەم لا٢٣ دا دەڵێت:-" باباتاهیر هیچ جیاوازیەکی نەکردوە لەنێوان کەعبە و کەنیسە و دێر وجێگەی پت پەرستی، چونکە ئەو هەموو شوێنانە بۆ پەرستنی خودا دانراوە!!! ".

چوارینەیەکی باباتاهیر ئەوبڕوایەی ئاشکرا کردوە وەك لەکتێبەکەی عباس رەجەویدا هاتووە بە ژ.(٢٣) کەدەڵێت:-

خۆشا ئانوون کە ئەز پاسەر نەزونەند
میوان شعلە خشك و تەر نەزونەند
کەنشت وکەعبە وبتخانە و دێر
سەرائی خاڵی ئەز دلبەر نەزونەند

ئەمەش بڕوایەکی سەرەکی ئەهلی هەقەکانە و دەگەڕێتەوە بۆ بڕوا ئایینە کۆنەکان و پەیوەندیان پێکەوە وەك ئاینێکی کوردی رەگەز، وەك باسمان کرد لەسەرەتای ژیانی باباتاهیر نەخوێندەوار بوو پاشان چووەتە مزگەوتێك فێری خوێندەواری بوو، عباس رەجەوی لە کتێبی (کلیات باباتاهیر عوریان) لە لا١٣٧دا باسی رووداوێکی سەیر دەکات و دەڵێت:-"لە هەمەداندا لە مزگەوتەکەدا باباتاهیر لە قوتابیانی پرسی چۆن فێری خوێندن و زانست دەبن ئەوانیش بەگاڵتە پێیان ووتوە دەبێ شەوێك لە زستانا لەناو حەوزێکی ئاوی ساردا بمێنیتەوە ئەوجا فێر دەبی". ئەو واتانە دەچێتە عەقلیەوە شەوێکی زستان دەچێتە حەوزی ئاوی مزگەوتەکەوە تا رۆژ دەبێتەوە ئینجا دێتەوەو لە غەیبەوە فێری خوێندنو خوێندەواری دەبێت تەماشای کردووە زۆر زانستی زانی و وەپێش قوتابیان دەکەوێت. شێخ محەمەد خال لە لاپەرەی ١٤دا دەڵێت: پاش ئەو کردارە گەرمیەکی خوایی لە لەشیدا پەیدا بووە کەس نەیئەتوانی نزیك بکەوێ لە تاوی ئەو گەرمیەدا، وە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا لە لاپەرەی ٣٦ لە بەرگی ٣دا هاتووە بابا دەروێش بۆ ماڵ و حاڵی نەبووە هەمیشە دەگەرا و سەری هیچ دای ناپۆشی بەردی دەکردە سەرین لە شەواندا وە نارەحەت بوو دەربارەی عەشقی خوایی هەمیشە بەغەم داگیر بوو بوو وە هیچ دڵی ناکردەوە تەنها دڵی ناخۆشی نەبوایە.

وەك دەزانین دەروێش و سۆفی عاشقی ڕێگای خوا ناسین ماڵ ودارایی دونیا لایانەوە گرنگ نیە وەك گرنگی ڕێگەی ڕاستی و هەق و ڕەزای خودایی وە ئومێدی بە هەشت لە دونیای داهاتوو ی پاش مردن. بۆیە باباتاهیر هەمیشە بەتەنگی ماڵ و حاڵەوە نەبوو وە عیشقی ئیلاهی وای کردووە بە پلەیەکی بایەخدار بیر لەو شتانە نەکاتەوە، جگە لەڕێگەی خواناسی و سۆفیگەری و ڕەهبەری موریدانی بە بڕواو ئاینەکەیدا نەبێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت پێشتر خوێندەواری نەبووە هەروەها وەك خۆی لە چوارینەکاندا دەیسەلمێنێ زیاتریش ئەمە ڕووندەبێتەوە لە کتێبی عباس ڕەجەویدا هاتووە لەلا٧٤دەڵێ:-

هەما یۆنم سەر کۆهم وەتەن بی
سەیر عالم گیرم هەرجار چەن بی
نەخون دارم نەمون دیرم نەسامون
دەم هەردن پەرو بالم کفن بی

لو چوارینەیەکی تردا کە (ڕازی) گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی ل لا٧٨ دا دەڵێ

دلم بەدەردی تۆیە غەمگینە
سەرینم خشتە دۆشەگ زەمینە
تاوانم تەنیا هەر دڵداریە
هەرکەس دڵدار بێ ژیانی شینە

مەبەستی باباتاهیر لێرەدا ئاشکرایە کە تەنیا تاوانی ئەو دلداریەو عیشقی خوداییە، وەك پتروس بوستانی لەئینسکلۆپیدیاکەیدا لەبەرگی حەوتەم لا٦٨٢ پاڵپشتی ئەو شتانە دەکات و دەڵێ:-" زۆر خۆیان بەستووە بەو ڕێگاییەی کەگرتوویانە و گەرەترین فەرز لایان هەژاری و ساکاری وپاکییە،

جل و بەرگی هەرزان و ساکار لەبەر دەکەن وپێی خاوس و سنگ بەرەللا دەسورێنەوە".

ئەوان دەروونی خۆیان جۆش دەدەن تاوەکو قالْ بن و مەیلی خۆشیەکانی ژیانیان نەبێت، ببێتە دیلی تام و چێشی ژیان، هەموو غەم و پەژارەی ئەوان لەباری سۆفیگەریدا نزیك بوونەوە لەوەی کە بەعیشقێکی مەجازی سەرگەرم بوونەو دڵیان پڕ غەمە، وەك خۆی دەڵێ لەچوارینەیەکدا:-

درەخت غەم بەجانم کردە ریشە
بەدەرگاه خودا نالْم هەمیشە

وەیان دەڵێت:-

سەرێ دارم کەسامانش نمیبۆ
غەمێ دارم کەپایانش نمیبۆ

واتە ئەو غەم و پەژارەی رێبازی سۆفیگەری لەو ساتە تەواو دەبێت کەنزیك بێتەوەو بگاتە دلدارە هەمیشەیەکەی وەدونیای کاتی بەجێ بهێڵێت و بگاتە دونیای هەقیقەت.

## باباتاهیر و سەیدەکانی بەرزنجە:-

بەرزنجە دێیەکە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری سلیمانی دانیشتوانی ئەو دێیە پێیان دەووترێت بەرزنجیەکان، ئەو سەیدانەی لەکۆمەڵگای کوردەواریدا هەن سەجەرەیان دەگەرێتەوە سەر بەرزنجیەکان نەوەی شێخ عیسای بەرزنجینە کە لەگەلْ شێخ موسای برای لەوێ جێنیشین بوونە پاش هاتنیان لەهەمەدانەوە. شێخ موسا نەوەی لەدوا بەجێ نەماوە هەردووکیان کوری باباعلی هەمەدانین، هەرچەندە پەیوەندی باباتاهیر و باباعلی لەگەل بەرزنجیەکاندا زۆربەی نوسەران بەشێوەی جۆرارو جۆر لێکیدەدەنەوە. لێرەدا دەمانەوێت ئەو پەیوەندیە روون بکەینەوە پاش بەراورد کردنی بیرورای ئەوانە، چونکە هەندێك نووسەر باباعلی بەبرای باباتاهیر دادەنێن وەهەندێکی تر بەبرازای یان بەخوشکەزای، بەهەرحالْ پەیوەندیەکی تەواو هەیە لەنیوان باباتاهیر و سیدەکانی بەرزنجە بۆیە پاش خۆی خولی ئاینی و سەرۆکایەتیان گردووە بەدەستەوە. وەك سي.جي.ئەدمۆندز لەکتێبی (کورد، تورك، عرب) لەلا٦٩٧دا دەڵێت:-" دەوترێت گوایە دامەزرێنەری خێزانی بەرزنجە شێخێك بووە بەناوی عیسی نور بەخش کوری باباعلی هەمەدانیە وەبرازای باباتاهیری هەمەدانی بووە". وە ماموستا مەحەمەد ئەمین زەکی زیاتر روونا کی دەخاتە سەر ئەو رایەی ئەدمۆندز ولە کتێبی مێژووی سلێمانیدا لە لا٢٢٣دا دەڵێت:-" ساداتی بەرزنجە هەموویان نەتەوەی شێخ عیسابوون کە کوری باباعلی هەمەدانیە وەبرازایی باباتاهیری هەمەدانی بووە". هەروەها لەلا٢٢٩دا دەڵێت:-" وابۆم دەرکەوتووە لە کتێبی دەسنووس کەبینیم لای شێخ مەحمودی حەفید کە ئەو پیاوەی ناومان برد خۆی کوری شەهابەدین یوسفە وبرای باباتاهیری هەمەدانیە". واتە لێرەدا روونەدەبێتەوە کەشێخ عیسی کوری باباعلی هەمەدانیە جا ئەگەر برای

باباتاهیر بووه یان برازای دەگەڕێنەوە سەر یەك رەگەز". وەك نور علی ئیلاهی لەکتێبەکەی (بورهان الحق) لەلا٢٧دا دەڵێت:-" لەرەگەزدا دەگەڕێتەوە ئیمام موسای کازم(ر.خ)". لەهەمان کاتدا ئەدمۆندز لەلا١٧٥ دا لەکتێبی (کورد، تورك، عرب) ئەو ڕایە دەدرکێنێ و پاڵپشتی نورعلی ئیلاهی دەکات ودەڵێت:-" ئەگەر وورد بینەوە دەبینین کە پاش هەشت پشت دەگەڕێتەوە سەر ئیمام موسای کازم". هەروەها بۆ زیاتر روونکردنەوە لەناميلکەی (الاوراد الکسنزانیه) داهاتوه لەلا٢٧دا دەڵێت:-" باباعلی هەمەدانی کوری یوسف کوری مەحەمەد تاحەوتەمین پشت ئیمام موسای کازمی دێت ". بەڵام لەکتێبی دووبیتەهای باباتاهیر چاپ(١) ساڵی١٣٨٢ فارسی(قم) لەلا٦١دا دەڵێت:-" ناوی باوکی باباتاهیر فریدونە)، وە فەهمی کاکەیی لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١) و(١٢) لەلا٨٦دا پشتگیری ئەو واتەیە دەکات وەك لەچوارینەیەکدا دەڵێت:-" حەقیقەت بشنەو ئەز پور فریدون".

مەبەستیش لێرەدا (عیسا نور بەخش)ە، واتا ساداتی بەرزنجە دەگەڕێنەوە بۆ(باباعلی هەمەدانی) و (باباتاهیر همەدانی)، ئەوانیش لەرەگەزدا دەگەڕێنەوە بۆ (ئیمام موسای کازم). مامۆستا عبدولقادر بەرزنجی لە کتێبەکەی(سادات بەرزنجە) لەلا٤٧ دا دەڵێت:-" سید یوسف باوکی باباعلی هەمەدانی بوو، رۆیشت بۆ ئێران و لەوێدا جێگیربووە لەشاری هەمەدان و خوشکی شاعیری کوردی بەناوبانگ باباتاهیر هەمەدانی خواست و کوڕێکیان بوو ناوی باباعلی هەمەدانی بوو پاش مردنی یوسفی باوکی خاڵی باباتاهیر بەخێوی کرد!! لەهەمان کاتدا مامۆستا مەحەمەد عبدولکریم لەکتێبی (شجره السادات) لە لا ٩٨ دا دەڵێت:-" پاش مردنی باوکیان فێری زانیاری بوون و زانیاری زاهریشیان لای خاڵیان باباتاهیری هەمەدانی خوێندووەوگەیشتنە هەقیقەت". هەروا

ناميلكەی (الادوارد الكسترانيه) لە لا٢٧دا هەمان شت دەربارەی باوكی باباعلی هەمەدانی دەڵێت:- "باوكی ناوی يوسف كوری مەحەمەد منصور...تا حەوت پشت دەگاتە ئيمام موسای كازم. واتا لێرەدا روون دەبێتەوەكە باباتاهير خاڵی سەيدەكانی بەرزەنجە بووە". بەڵام وەك زانيمان باباتاهير خوشكێكی هەبووە بەناوی (فاتە لەرە) كە لە (دونيا نەرويوە) لەگەڵ بابا تاهير وەك دەروێشێكی خاوێن ژياون. بڕوای ئەهلی هەقەكان وايە گوايا (فاتمە لەرە) هاتووە بۆ خزمەتی باباتاهير شەيدای بڕوای ئايينی بووە و وەك خوشك و برا پێكەوە ژياون، چونكە ئەوی بگاتە پلەيەكی بەرزی سۆفيەتی تەركی دونيا دەكا و دەست لە هەموو شتێك بەردەدا وهەموو ئەوانەی لەدەورو بەری بەخوشك وبرای خۆی دەزانی ئەوی تەنيا لەمێشكدايە خودا پەيرەوی رێگەی هەقە.

وەك باباتاهير لەچوارينەكەی بە روونی دەڵێت:-" كە هيچ كەسی نەبووەو تەنيا خودا نەبێت كەسی ئەوە". كەلە كتێبی عباس رەچەوی

دا هاتووە لە لا٣١دادەڵێت:-

خواوەنـــــدا بـــــەفرياد دڵـــــم رەس
كـەس بـێ كـەس تـوئی مومانـدە بـێ كـەس
هەمــە گويەنــد طــاهــر كەســی نــەدراوە
خــــودا يــــار منـــە چ حاجــــەت كــــەس

وە لە لايەكی تردا (سی .جی . ئەدمۆندس) لە لاپەرە ١٧٥ی كتێبەكەی (كورد- تورك- عەرەب) دەڵێت: بيبی فاتمەی بەناوبانگ خوشكی ئەسحابە بابا تاهير بووە واتە خوشكی بابا عەليش بووە، ئەم واتەی ئەدمۆندز بە پێچەوانەی واتەكەی تريەتی لە لاپەرەی ٦٨دا كە دەڵێت: بابا عەلی برازای بابا تاهير. تا ئێرە سەرنج دەدەين پەيوەنديەكی نێوان

بابا تاهیر و سەیدەکانی بەرزنجە زۆر ئالۆزو تێکەڵاوە پێویستی بە زیاتر لێکۆڵینەوەو رونکردنەوە هەیە بەهەر حال هەموو لایەنەکان دان بەوەدا دەنێن کە بابا تاهیر شاعیرێکی کوردە و سۆفیەکی بەناو بانگ بووە و شەیدای حەقیقەتو راستی و سروشت بووە.

## زمانی باباتاهیر

شتێکی رووت و ئاشکرایە باباتاهیر خەڵکی لوڕستانە و دانیشتوویی هەمەدانە وەهەمیشە هاتووچۆی کردوە لەنێوان ئەو دوو ناوچەیەدا وچوارینەکانی بەزمانی لوڕی ووتوە، لەکتێبی دووبیتەهای باباتاهیر لەلا٨دا هاتووە دەڵێت:-" چوارینەكاني باباتاهیر هەندێك جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانی فارسی، نزیکە لەزمانی لوڕیە". شێخ مەحەمدی خاڵ لە لا٢٦دا دەڵێت:-" باباتاهیر کورێکی لوڕە، کەلوڕ ناوی تیرەیەکی گەورەیە لەکورد، ئەم چوارینانەش بەزمانی لوڕییە. لوڕو لوڕستان[1]* دەکەوێتە خۆرئاوای ئێرانەوە رەگەزی کوردن (الطیري) لەکتێبی (معجم البلدان) دا

(1) لەپەراوێزدا باسی ناوچەی لوڕستان دەکات ودەستنیشانی دەکات لە ناو سنوری ئێراندا بەم شێوەیە:- تیرەی لوڕ لەلوڕستان دادەنیشن کەدەکەوێتە باشوری رۆژئاوای ئێران، بەم ڕەنگە رۆژئاوای لوڕستان لە خاکی ئێراندا لەبەرامبەر سنوری (مەندەلی)ەوە دەست پێدەکات تا بەرامبەر سنوری (عەمارە) هەر لەخاکی ئێران، سنوری رۆژهەڵاتیشی لەخوارووی شاری (کرند)ەوە دەست پیێ دەکات لەباکور هەتا نزیك شاری (دیزفول) لەخواروو.چیای (کەبیرکوە) لەباکوری ڕۆژئاوای ئێرانە و بۆ خوارووی ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە. ئەم قەلەم ڕەوە دەکات بە دووبەشەوە:- ١- بەشی ڕۆژهەڵات (پێشکۆە) کەلوڕی ئەسلی تێیدا دەژین. ٢- بەشی رۆژئاوا (پشتکۆە) کەفەیلییەکان تیا دادەنیشن. لە د.م.ا لە لا ٤١٧ دا مینوروسکی دەڵێت: لور نەتەوەیەکن لە خواروی رۆژئاوای ئێرانەوە دەبنبە چوار بەشەوە (مامەسەنی- کوهگێلۆلی- بەختیاری- لوری ئەسل).

لەبەرگی(٧) و لەلا٢٣٧دا دەڵێت:-" لوڕ نەتەوەیەکی کوردن لەنێوان چیاکانی ئەسفەهان و خوزستان دەژین ئەو ناوچەیە بەووڵاتی لوڕ ناسراوە وپێی دەووترێ لوڕستان. لە هەمان کاتیشدا هەندێ شیعری ووتوە بەزمانی گۆرانی. چونکە بەناویانا گەڕاوە ئەوانیش لەسەر بڕوای ئایینی ئەو بوون، هەندێ لەشیعری سۆفیەکان لەکتێبەکانیدا هەیە لەم بارەیە شەوە مامۆستا مەحەمد ئەمین زەکی لەکتێبی مێژووی کورد و کوردستان بەرگی یەکەم لەلا٣٤٤دا دەڵێت:-" شیعرە غەزەلیەکانی و چوارینە ئاینیەکانی (بەاسلوبی-متصوفین) نووسراوە زۆر قوڕس و داخراو دەزانرێت بەشێوەی گۆرانی دەزانرێ کەئێستا شێوەی (هەورامی وەزەنگەنە و باجەلان وشێخان وکاکەیی وشەبەك.......) هەموو لەرەگەزەدا دەگەڕێتەوە بۆ گۆران. گۆرانیش دەکەونە ناوچەی کوردستانی ئێرانەوە، دڵداریش دان بەکوردی زمانی باباتاهیر دەنی لە گەنجینەکەیدا لەلا١٣دا دەڵێت:- "باباتاهیر پیاوێکی ئیسلامییە لەکەڵچەردا و بوێژێکی کوردە لەزمان و نووسین و شێوەی پیشانگای و چۆنیەتی دڵداری کردنی لە هەمان کاتدا دەربارەی گەلچەری ئیستسلامی مامۆستا دلزار لە لاپەرەی ٨دا دەڵێت ئەو گەلچەرەیە کە بە زۆر بوو بە ئیسلامی نەك بە خواستی خۆی وە دەرکەوتووە ئەگەر هاتوو گەلچەرێك بەزۆر بوبە ئیسلامی یان غەیرە ئیسلامی هەرگیز شێوەو ریشەی خۆی ون ناکات بەڵکوئەیپارێزی وەتا رادیەك لەسەر ریشەی خۆی دەمێنێتەوە بەسەر ریشەی مامۆستا عزەدین مستەفا رەسول لەکتێبی (الواقعیە في الادب الكوردي) لەلا٥٩دا دەڵێت:- " دەربارەی کورد بوونی باباتاهیر شاعیرێکی کوردە" (لای ئێمە بەڵگەی زانیاری زۆرە کە ئەیچەسپێنی لورەکان کوردن) هەروەها ڕای خۆی دەردبرێ و دەڵێت:- بڕوای ئێمەش بەم راستیە ئەوەیە کە شیعرەکانی هەڵکوتنی شیعری کوردی نوێ یە. مامۆستا محەمەدتوفیق وەردی لە

کتیبه‌که‌ی صفحات من لنضال الکوردی له لا ٤٠ دا ده‌ڵێت :باباتاهیر هه‌مه‌دانی ده‌گه‌ڕێته‌وه له گه‌ڵچه‌ردابۆ سه‌رعه‌شیره‌تی له‌ك که‌ عه‌شیره‌تیکن له فه‌یلیه‌کان وشیوه زمانی دووه‌می له‌کییه.وه‌هه‌مو دانیشتوانی لورستان زۆر به‌م شێوه گفتو گۆ ده‌که‌ن.

هه‌موو ئه‌وانه‌ی باسمان کردن روونی ده‌کاته‌وه که‌باباتاهیر کورده و شیعره‌کانی به‌کوردی و شێوه‌ی لوڕی هۆنیوه‌ته‌وه‌و بوونیشی له ناوچه‌ی کوردستاندابووه هه‌رچه‌نده له‌یه‌ك شوێن جێگیرنه‌بووه، به‌ڵام له‌سنووری کوردستاندا ده‌رنه‌هاتووه ورابه‌ری بڕوا و ئایینه‌که‌ی کردووه له‌ناوچه‌که‌دا. زۆربه‌ی کوردی ئه‌و ناوچانه‌ی لێی بووه چونه‌وه سه‌ر ڕێره‌و و بڕوای ئه‌و ڕێزو پله‌یه‌کی تایبه‌تی بۆ داناوه شیعره ئاینیه‌کانی پارێزراوه، هه‌رچه‌نده هه‌ندێ که‌س به‌فارسی داده‌نێن چونکه وا دیاره شاره‌زای ته‌واوی ده‌رباره‌ی باباتاهیر و زمانه‌که‌ی ئه‌و ناوچه‌ی که‌لێی ژیاوه نه‌بوون. هه‌روا ده‌رباره‌ی بیروباوه‌ڕو ئایینه‌که‌ی که کوردی ره‌گه‌ز و هه‌رچه‌نده تێهه‌لکێش بووه له‌گه‌ڵ هه‌ندێ بیروڕای ئیسلامیدا. وه‌ك خۆرهه‌ڵاتناس مینۆرسکی له ئینسکلو پیدیای ئیسلامی به‌رگی(٣) له‌لا٢٣٤دا ده‌ڵێت:-" ناتوانین حاشا بکه‌ین که‌په‌یوه‌ندیه‌کی زۆر هه‌یه له‌نێوان ده‌قه‌کانی چوارینه‌کانی باباتاهیر وله‌نێوان زمانی فارسی ئه‌ده‌بی". بۆ ووه‌ڵامی ئه‌وه ڕای مامۆستا علائدین سجادی که ده‌ربڕیوه له ده‌قه‌کانی ئه‌ده‌بی کوردی له‌لا٤٤ وه‌رده‌گرین که نووسیویه‌تی و ده‌ڵێت:-" فورسه‌کان و کورده‌کان هه‌ریه‌ك ده‌ستیان به‌روون کردنه‌وه‌ی ژیان و له‌دایکبوونی باباتاهیر کردوه که‌هه‌ریه‌کێکیان وا دایده‌نی له‌خۆیه‌تی". له کتێبی (تأريخ أدبيات فارسي) نووسینی (یوگنی ادوارد ویچ برتلس) وه‌رگێرانی سیروس به‌زمانی فارسی له‌ساڵی ١٩٥٧ز تهران ١٣٧٤فارسی له‌لا٣٤١دا ده‌ڵێت:-" چه‌ند ساڵ پێشتر له‌به‌رلین چوارینه‌کانی باباتاهیر وه‌رگێراوه بۆ سه‌ر زمانی کوردی

سۆرانی یا کرمانجی بۆ ئەوەی خوێنەری کورد لێی بگات". وە باباتاهیر لە زنجیرەی ئەدەبیاتی کوردی دەژمێرن، هەرچەندەمەبەستیان لەسیاسەتە، بەڵام راستی ئەوەیە لەو زمانە کورد هەرهەمان زمانی باباتاهیریان هەبوو پێی ئاخافتنیان دەکرد. ئەی بۆچی شەریك نەبین؟ هەروا تاجیکەکان دەڵێن:-" باباتاهیر لەشارێك بووە بەناوی غرم لەتاجیکستان لەنزیك سنوری چین. بەڵام مەحەمد تۆفیق وەردی زیاتر ئەمەووردتری دەکاتەوە لەکتێبی (صفات في نضال الشعب الكوردي في ايران) لەلا ۲۱ کە دەڵێت:-" باباتاهیری هەمەدانی لەرەگەز بۆ عەشیرەتی (لەك) دەگەڕێتەوە کە عەشیرەتێکن لە فەیلیەکان وە هەموو دانیشتوانی لوڕستان بەزۆری بەم شێوەیە گفتوگۆدەکەن". شێخ محەمەد خاڵ لە لاپەرەی ۲٦دا دەڵێت ئەگەر ئێمە ورد بینەوە لە چوارینەکانی بابا تاهیر دەبینین کە پڕە لە وتەی لوڕی وەك (ئیمون) لە جیاتی (ئیمان) وە (بارون)لە جیاتی باران وە بیا بون لە جیاتی بیابان (تە) لە جیاتی (تۆ) دەرمون لە جیاتی (دەرمان) (دەستون) لە جیاتی (دەستم) و (دیر) لە جیاتی (دوور) وە (نوم) لە جیاتی (نام، ناو) وە (نومە) لە جیاتی (نامە) کە ئەمانە هەمووی لەزوبانی لوریدا بەکاردێن.

واتا شکی تێدانیە وەك زۆربەی زاناو نووسەران دانیان بەوە داناوە کەباباتاهیری هەمەدانی شاعیرێکی لوڕەو لوریش بەشێکە لە کورد، تەنانەت بیروڕای ئاینەکانیشی بەکوردی بڵاوکردوەتەوە ئینجا چ بەشێوەی لوڕی بێت یان گۆران وە بەڵگەش بۆ ئەوە زیاتر پاشماوەی شیعرو بڕواکانیەتی لەنێوان ئەهلی هەقەکاندا . لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامی چاپی ئینگلیزی لەلا ۳۳ دا هاتووە:-" باباتاهیری هەمەدانی شیعری بەدیالیکتی گۆران وتووە بۆبڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی هەقەکان لەناو گۆرانە نەخوێندەوارەکاندا". ئەمەش زیاتر ئەوە دەچەسپێنیت کەباباتاهیر شیعرەکانی سەرەڕای لوڕی بەگۆرانیش هۆنیوەتەوە واتە سەلماندنی

کوردبوونی باباتاهیره. وەهەروەها بۆ زیاتر رونبونەوە مامۆستا عەلائەدین سوجادی لە دەقەکانی ئەدەبی کوردی لاپەرەی ٤٤ دەڵێ رون بۆتەوە و دان بەوە دانراوە کە بابا تاهیر شیعرەکانی بەشێوەی لوری دانراوە وە ئەمەش ئەیچەسپێنێ کە شاعیرێکی کوردە یان بونو ژیانی بابا تاهیر لە ناوچەکانی لورستان و هەمەدان وە بونی شێوە زمانی ئەو ناوچانە لە زمانەکەیدا هەبێ کە نزیکن لە شێوە زمانی فارسیەوە وەك (مینورسکی) دەڵێ لەلاپەرە ٢٣٤ ی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا لە بەرگی سێ یەمدا.

فارسەکان دەستکار چوارینەو شیعرەکانیان کردوە بۆ ئەوەی لەزمانی فارسیەوە نزیك بێت وە بەشاعیرێکی فارسی دایبنێن، لەوانەیە ئەوەش وای لێکردبێت کە هەندێ کەس بەشاعیرێکی فارسی ناو ی دەبەن.

## باباتاهیری سۆفی

سۆفی مرۆڤێکی ئاساییە وە رەوشتی تایبەت بە خۆی هەیە لە سنوری جیهانی سۆفی گەریدا، بە پێی بیر و رای ئەو رێبازەی گرتویەتیە بەر وە بڕوای پێوی هەیە وەك بترس بستانی لەبەرگی چوارەمی ئینسکلۆپیدیاکەیدا لەلا٧٣٣دا پێناسەی دەکات و دەڵێ:-" سۆفیەکان بروایان بەیەك خوا هەیە کە لە هەموو شتێکدا خۆی دەنوێنێت، مرۆڤیش لەجەوهەریدا بەشداری دەکات، پاشان هەموویان لەناخی خۆی دەگرێت وە هەمووبروایان بە یەکێتی بنچینەیی هەموو شنێك هەیە تەنانەت ئەگەر دیاریش نەبوو بێت، جیاوازیەکی زۆری هەیە وەك خێرو شەر، ژیان و مردن".

باباتاهیری هەمەدانی یەکێك بووە لەسۆفیەکانی هاوچەرخی خۆی کە لەو سەردەمەدا سۆفیەتی باو بووە، مامۆستا عزدین مصطفی رسول لەکتێبەکەیدا لە لا٩٥ دەڵێت:-" بڵاو بوونەوەی فەلسەفە لەوەختی

عەباسیەکاندا کاری کردوەتە سەر ڕێگەی دەربرینی تێگەیشتن". هەروەها ماموستا محمد ئەمین زەکی لە مێژووی کوردو کوردستان پاڵپشتی ئەو بیروڕایەدەکات لەلا٢٤٤دا دەڵێت:-" باباتاهیر شاعیرێکی سۆفی خوایی بووە، وەشیعرە دڵداریەکان و هەڵبەستە لاهوتیکانی بۆ ڕێگەی سۆفیەکان نووسراوە". واتە باباتاهیر سۆفیەکی ئەو سەردەمە بووەو سۆفیەتی کاری تێکردووە لە هۆنراوەو خوورەوشت و خواناسینی. دەتوانین بڵێن سۆفیەتی ڕێگەی بڕوای ئایینەیەکەیەتی، بۆ ئایینداری و خواناسین زۆر لەمیدانی سۆفیەتی دوواوە تەنانەت (٢٢) نامەی داناوە دەربارەی زانیاری پاش سروشت( میتافیزقیا). کە هەندێکی بڵاو کراوەتەوە، نامەیەکی تەواو بەناوی (الکلمات القسار) لەچاپ خانەی ئەرمەغانی کە پێك دێت لە ٣٦٨ نموونەی عەرەبی دابەش کراوە بۆ ٢٣ بەش، وە نامەیەکی تریش بەناوی (الفتوحات الربانی في إشارات الهەمەدانی). مینۆرۆسکی دەڵێت ئەم نموونانە لەنێوان سۆفیاندا بڵاو ناسراو بوون کەلێکدانەوە دەربارەیان نووسراوە، یەکێك لەوانە باس کردنێك بە زمانی عەرەبیە کە هی( عین‌القضات الهمدانیة) کە لەساڵی ٥٣٣ك دا مردووە، وە یەکێکی تر کەنازانرێت هی کێیەو کە دانەیەکی بەزمانی عەرەبیەو وەدانەکەی تر بەزمانی فارسیە کەهی ( مەلا سولتان عەلی کتابادیە)، لەگەل شەرحی فارسیەکەی کەچاپ کراوە لەساڵی ١٣٢٦ك-١٩٠٦ز. چەند نموونەیەك دەربارەی سۆفیەتی باباتاهیر ووتویەتی هەندێکیان لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامیدا هاتووەوەك (الحقیقة المستقات بعد علم الیقین) ژ.٦٨، ( الوجد فقدان الموجودات و وجود المفقودات) ژ.٩٦، (ومن حل به قضا الله یبقی من غیر حرکة ومن غیر ارادة/ ٣٦٨)( ومن قتله الجهل لم یعیش ابدا ومن قتله الذکرلن یموت ابدا/٣٠ ) هەندێکیان لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد هاتووە لەبەرگی(٥) وەك (التصوف لایسعه الشيء وهو یسع الأشیاء کلها

والصوفي يكون له كل شيء ولا يكون هو شيء) ژ.٣٣٠. (العلم موكل بالكلامو الوجود موكل بالخرس/١١)، (الذكر الخض الذي يخفي عن القلوب/١٣٢)، (انتهاء العقد الى التحير و انتهاء التحير الى السكر/٦٥)، (الغفلة عن الله كفر و الغفلة عن حقية ذات الله توحيد/٣٢١)، (النفس سجن الروح و الدنيا سجن النفس/٦٦)

مامۆستا فوئاد حوسين احمد لەکتێبەکەیدا بەناوی (ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا لە لا٤٠دا پرسیارێك ئاراستەدەکات و دەڵێت:-" باباتاهیری هەمەدانی لەچ قۆناغێکی تەمەنیدا موتەسەوف بووە وە چۆن هۆنراوەی دلدارییەتی ووتوتەوە؟". هەر خۆشی دەڵێت مامۆستا علائدین سجادی تێکۆشاوە وەلامی ئەم پرسیارە بداتەوە بۆیە ووتویەتی:-" باباتاهیر ماوەیەك بەم جۆرە رائەبووێرێ وە لەپاشان ئەو دڵەی کە فریشتەی سەر زەوی هۆشی لێ سەندبوو سەودای عیشقی راستەقینە شاباڵ ئەکێشێ بەسەریاو لەدەست کەمەندی مارەوان رزگاری دەکات". هەروەها قۆناغەکانی شیعری باباتاهیر جیادەکاتەوە بۆ دوو قۆناغ دڵداری و تەسەوف. بەڵام د.کامل بصیر هەردوو قۆناغەکە بەیەکدا دەبەستێت وە لەو جۆرە دلداریە تەسەوفەدا بەسەر کردەی رێبازێك لەدیوانی کوردەواریدا دەزانرێت.

# باباتاهیری شاعیر

وەك بۆمان دەركەوت لەپێشەوە باباتاهیر لەناوچەكانی لوڕستان و هەمەدان وە چیاكانی ئەلوەندا هاتوو چۆی كردوە و گەڕاوە جگە لەوەی كەبەناو یارەكانیدا لەگۆران و هەورامان گەڕاوەو تا وای لێهاتووە سروشتی خۆش بووێت حەز بە جوانی سروشتی كوردستان بكات وەك شیعرەكانی لەو ناوچانەدا بلاّ بێتەوە نەوە بە نەوە بیلێنەوە چ وەك پەند یان ئامۆژگاری ئایینی، وەك عاشقێكی خوایی دڵناسك وەهەستیار شیعرەكانی بەشێوەی ئاسان ووتوە كە پارێزگاری خۆشی و ناسكی و سحری خۆی كردووە، لەكتێبی تاریخ ئەدەبیات فارسی لەلا٣٤٠دا هاتووە دەڵێت:-" بابا تاهیر شیعرەكانی بە زمانی ئەو ناوچانەی نزیك هەمەدان نووسیوە بۆ ئەوەی خەلكی ئەو ناوچانە لێی تێبگەن، هەر وەك چۆن جەلالەدین رومی شیعری بە توركی نووسیوە لە بازاری قۆنیەدا یان قاسم الأنوار كە بە زمانی فارسی و ئەزەری شیعری نووسیوە. باباتاهیر یەكەم كەس بووە لە دانانی شیعری چوارینە لەئەدەبی كوردیدا وەپێش عومەری خەیام بەسەدساڵ كەوتووە، بەڵام جێی داخە كە چوارینەكانی باباتاهیر لەسەرەتادا لەچاپ نەدراون تا سەرەتای سەدەی رابردوو. ئەوەی كۆكراوەتەو لەیاران و موریدەكانیەوە وەرگیراون كە لەبەریان كردووەو ووتویانەتوە وەك پەند یان ئامۆژگاری وە زۆریان بەكار هێناوە هەرچەندە هەندێ لەو چوارینانە بەهی باباتاهیر دانراوون بەڵام گومانی لێ دەكرێت. وەك خۆرهەڵات ناس مینۆرۆسكی لە ئینسكلۆپیدیای ئیسلامی بەرگی (٣)لەلا٢٣٥دا دەڵێت:-" لێرەدا دەرفەتێك هەیە بۆ پرسیار دەربارەی ئەو چوارینانەی كە بەهی باباتاهیر

دانراوون هەروەك ئەوانەی عومری خەیام[1]". ئەم ووتەیەی مینۆرۆسكی وادەردەخات كەچوارینەكانی باباتاهیر هەندێكیان شكی تیادایە كەهی ئەو نەبن خزابێتە ناو چوارینەكانیەوە هەروا چوارینەكانی بەگشتی رێك و پێك كۆنەكراوەتەوەو لە چاپ نەدراوەو لەوانەشە هەندێكیان دەستكاری كرابن. هەروەها مینۆرۆسكی بە زمانی زۆكۆفسكیەوە دەڵێت:-" چوارینەكانی باباتاهیر لە دیوانی مەلا مەحەمەد الصوفی المازندەرانی دا هەیە كە لەسەدەی ١١ كۆچیدا مردەوە". شاتر بێك مەحەمەد دەڵێت كە شاعیرێكی نوێیە لە هەمەداندا گوایە خۆی خاوەن هەندێ چوارینەی كوردی فەهلەویە[2] كەبەهی باباتاهیر دانراوە". لێرەدا مینۆرۆسكی وای پیشان داوە كە هەندێ لەچوارینەكان هی باباتاهیر نیە وە بەناوی ئەوەوە بڵاو كراوەتوە.

---

[1] شێخ مەحەمد خالۆ لە لا٢٥دا دەڵێت:-" مەردوم ئەگەر وورد بێتەوە لەشیعرەكانی باباتاهیر وەبەراووردی بكات لەگەڵ زۆر لە شیعرەكانی عومر خەیام لەرووی علمی نەفسەوە، دەبینین كەئەم دووانە زۆر لەیەكەوە دوورن، چونكە تا ئێستا بابا هیچ ئاورێكی نەداوەتەوە بەلای خۆشی و خۆش رابوواردنی جیهانەوە، بە پێچەوانەی خەیام". جگە لەوەی كەشیعرەكانی خەیام بەهیچ كۆلۆجێك تورسكەیەكی تەسەوفی لێوە نایەت هەروەك لەشیعرەكانی باباوە دێت بەزۆری.

[2] باباتاهیر خۆی دان بەوە دادەنێت كەزوبانی پەهلەوی شارەزایە وەك لەم دوو بەیتەدا (٣٧، ٣٨) لە یەكەم پارچە شعرە غەزەلەیەكانی دادەلێت :

زوبانی پەهلەوی را ئوستادام كتاب عاشقی را مەسدەۆ ستم

و. د.جمال نەبەز لە لا (٦٦) كتێبەكەی (فەلسەفە و رامانی پارسانی ...) دەلێت : پەهلەوی زمانێكە پەیوەندی بە شێوەزاری گورای و فەیلیە وە هەیە كە بنەزاری كوردی هەورامانی بە فەهلەویات نێو دەبرێ.

لەکتێبی (دیوان باباتاهیر) چاپی قوم پشتگیری ئەو ڕایەی مینۆرۆسکی دەکات و دەڵێت بەشێك لە چوارینەکانی باباتاهیر شکیان هەیە کە هی ئەو نیە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ٤٩ چوارینە لەکۆی ٣٦٢ چوارینە هەروەها عباس رەجەویش ئەم پشتگیریە دەکات بەڵام وەحید دەستکردی دەڵێت ژمارەی چوارینەکانی باباتاهیر ٢٩٦ چوارینەیە ئەوانەی گومانیان لیٚ دەکرێت نزیکە ٧٠چوارینەیە واتە ژمارەی گشتی دەکاتە ٣٦٦چوارینە.
بەڵام لەکتێبی دوو بەیتەهای باباتاهیر لەلا٩٧-١٠٠دا هاتووە دەڵێت:- "چوارینەکانی باباتاهیر ژمارەیان ٢٦٤ چوارینەیە لەگەڵ چوار شیعری غەزەل وەك ئەوەی عباس رەجەوی دەڵیت وە ٥٩ چوارینە شك لەسەری هەیە هی ئەو نەبێت".
زۆربەی هەڵبەستەکانی باباتاهیر لەکتێبی کۆکردنەوەی شیعرەکاندا هاتووە کەلەسەدەی (١٨و١٩ )دا لەچاپ دراون بەڵام هەندیٚ لەشیعرەکانی بابا تاهیر لەکتێبی ئایینی پیرۆزی ئەهلی هەقەکاندا هاتووە وەك مامۆستا علائدین سجادی لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا لەلا١٧١دا بەزمانی د. سعید خانەوە دەڵێت:-"پیاوێکی غەیری ئیسلام دەڵێت باباتاهیر هەندیٚ لەشیعرەکانی بەزمانی گۆرانی سادە نووسیوەو ناردوویەتی بۆ ئەهلی هەقەکان بۆ ئەوەی لەبیرو باوەری یەکتر تێبگەن".
ئەمەش صدیق بۆرەکەی لەمێژووی ووێژەی کوردی بەرگی یەکەم لەلا٨٩دا دووبارەی دەکاتەوەو پالپشتی ووتەکەی مامۆستا علائدین سجادی دەکات، لەهەمان کاتدا مینۆرۆسکی لەکتێبەکەی (ملاحظات وانطباعات) لەلا٩٩و١٠٣دا دەڵێت:-" گەلیٚ هەڵبەستی ناتەواو کە بەزمانی باباتاهیرەوە نووسراوە هەیە". ئەو هەڵبەستانەی باباتاهیر پاش ١٧ساڵ کەوتم بەدواییە بەرچاوم کەووت لەدەفتەرێکی دەست نووس لەنزیك شاری موسل کە ژمارەیان ١٤ نەك ١٣، د. مارف خەزنەدار لەلاپەرەی

١٨٨دا دەڵێــت مینۆرۆســکی١٣ دوو بــەیتی باباتــاهیری لــە کتێبــی سەرئەنجامدا دۆزیوەتەوە هاورێکانیشی لە یارسانانی ئەهلی حەق ٣١ دووبەیتی تریان بۆ ڕەوانە کردووە هەروەها لەلاپەرەی ١٩٠دا دەڵێت ئیتر نابێت بیر لە شیعرەکانی بابا تاهیر بکەینەوە بەبێ ئەوەی رەچاوی ئاینی یارسان بکرێت، هەروەها مینۆرۆسکی دەڵێت لەساڵی ١٨٨٥ز خۆرهەڵات ناس هیوار هەستا ٥٩ چوارینەی لەچوارینەکان باباتاهیر بۆیەکەم جار بڵاوکردوە پاشان ٥٩ دیکەش. وە لەساڵی ١٩٠٨ز جارێکی تر بڵاوی کردەوە لەگەڵ یەکێك(لە هەڵبەستە خۆشەویستیەکانی بەڵام پاشان خۆرهەڵات ناس ( هرون ئەلن) و٨٠ چوارینەی لەگەڵ یەکێك لە هەڵبەستەکانی بۆ زمانی بیانی گۆری لەساڵی ١٣٠٦ك- ١٩٢٧ز.خاوەنی گوڤاری ئەرمەغان ی فارسی لەتەهران سەید حوسین وەحید دەستگردی الاصفهانی دیوانەکەی لە چابدایەوە، شێخ محمد خال دەلێت لە لاپەرەی ٢٧دا، وەحید دەستکردی ئیسفەهانی نوسەری گۆڤاری ئەرمەغانی فارسی دیوانی بابا تاهیری لەچاپداوەو بلآوی کردەوە کە ٢٩٦ چوارینەیە و چوار چامەیە وە ٦٢ چوارینەی تریشی کردوە بە پاشکۆی ئەم دیوانە کە دەریهێناون لە کەشکۆڵ و بەیازی دەست نوس وە جارێکی تر لە ساڵی ١٩٣٢ز دووبارە لە چاپی دایەوە لە گەڵ پێشەکیەك بەناوی ماموستا(رەشید یاسەمی)یەوەبۆیەکەم جار، وە ١٠ چوارینەی کەشی لەگەلدا بوو کەلە کومەلە دەستنووسێك د ۆزیبویەوە. باشترین کتیب کەجیی متمانە بیت کتیبی(عەباس رەجەوی) بە ناو نیشانی (کلیات باباتاهیر)چاپی تەهران کەزۆر لەنووسەرو زانایان ناوی دەبەن کە ئەویش زیاتر پشتی بەستوە بەچاپەکەی وەحید دەستکردی.

کۆمەلەی چوارینەکانی باباتاهیری هەمەدانی لەگەڵ هەلبەستەکانی بەگشتی بەپێی ناوەرو کە کە ی کراوە بە سێ بەشەوەکە ئیمە دەقی ئەو

بەشانەدەنوسـینەوەوەك لـە كتیبەكـەی دلـزارو ماموسـتا عـەلا ئـەددین سجادی(دەقەكانی ئەدەبی كوردی) داهاتووە بەم شیوەیە :-

١. **خوشەویستی راستەقینە :-**

ئەمەئـەوە دگەیـەنیت كـە (فاتمـە لـەرە) نـاوی خوشەویـستەكەی بـووەو (ئیلـهاماتی) شـیعرەكانی بـووە. وەك دەردەكـەویت لـە شـیعرەكانی بەشیوەیەكی هەمیشەیی كە هەستی بەرامبەر جوانی فاتمە دەربریوە. ئێمە لێرەدا دەڵێن خۆشەویستی باباتاهیر مەجازی بووە، ئیلهاماتی شیعرەكانی فاتمە لەرە نەبووە، بەشێوەی خـەیاڵ خۆشەویستی دەربڕیـووە، پەیوەنـدی بـەناخی بیروباوەڕەكەیـەوە هـەبووە، چـونكە فاتمـە لـەرە وەك لەپێـشەوە باسمان كرد خوشكی بـووە یـان وەك هەنـدێك هاتووەتـە سەر بیروباوەڕی ئایینەكـەی گەیـشتووەتە خزمەتی و بەخوشـكێكی خـۆی دانـاوە كەپێكـەوە ژیـاون بوونەتـە پـیرو موریـد یـەكتر و ئـەم جـۆرە پەیوەندییـەش ئاشـكرایە شێوەی باب و فەرزەندەیان براو خوشك وەردەگرێـت وە لەیـەكتر مەحروم دەبن تـەنها عیشقی ئیلاهـی و تەریقەت پێكـەوە كۆیان دەكاتـەوە زیـاتر بـۆ روون كردنـەوەی ئـەم راسـتیەش(صـدیق بورەكـەی) لـە میـژووی ویـژەی كوردیدا لە بەرگی یەكەم باسی باباتـاهیر دەكـات لـە ٨٧لا دەڵیـت:- فاتمـە لـورە وپـستی لەگـەڵ شاخۆشـین بـروا بـەلام باباتایەركەماوەیـەكی زۆر بـوو دولبـەری ئـەو بـوو لـەدڵی خۆیـدا بیری كـردەوە بـە شاخۆشین بلـی فاتمـە لورەی بۆ مارە بكات، شاخۆشین لە بەر ئەوەی ئاگای لە بیرو دڵی باباتـاهیر بوو مزگێنی دایی كە پەیوەندی ژن ومێردی هەردوكیان لە رۆژی پەسلاندا وەكو لەیلاو مەجنوون ئەنجام دەدرێت.

٢-عیشقی ئیلاهی(خوایی) :-

ئەمە ئەوە دەردەبڕێت کە لە خۆشەویستیدا سەر نەکەوتووە وای لی کردوە بە گشتی دوور بکەوێتەوەو بۆ لایەکی تر بڕوا، بەلام لەراستیدا وانیە، چونکەباباتاهیر شاعیرێکی سۆفی و عشقی تەریقەتو خۆشەویستی خواو هەقیقەت لە ناو شیعرەکانی دەردەبڕێت جا بەشێوەی مەجاز بێت یان راستەو خۆ، خۆشەویستی بابا بۆ دونیاو دەروون نەبووە، بەڵکو وەك لەپێشان باسمان کرد لە سیفەتی سۆفیان ویستی دەروون و دونیا لەخاك بنێ بۆ ئەوەی بگاتە پلەی(کەمال) وەك جەمسەرێکی کاریگەری بیر وبڕوای ئاینەکەی لەو سەردەمەدا.

٣-ناو هێنانی (حوسین) ڕووداوەکانی کەربەلا ئەمەش ئەوە دەردەبڕێت کە باباتاهیر وەك لورەکان لەسەر مەزهەبی جەعفەری(شیعی)بووە، بۆ روونکردنەوەی ئەم ووتەیە وەك لەوەو پێش باسمان کرد باباتاهیر جەعفەری نییەو نەبووە هەرچەندە ئەمە بڕوای زۆربەی نووسەران و رۆشەنبیرانە، لەراستیدا بیرو بڕوای ئاینەکەی جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ هی جەعفەرییەکان لەزۆر ڕووەوە، بەڵام تێهەلکێش بووە لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا و بەتایبەت بیروڕایان بەرامبەر ئیمامی عەلی(ر.خ) وە ئیمامی حوسین وە رووداوەکانی کەربەلا. زۆربەی کەسانی تریش لەناودارانی ئیسلام بە هۆی بڕوای دۆنای دۆن (حلول وتناسخ) ەوە.

بەڵام فەهمی کاکەیی لە نوسینەکایدا لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژ.(١١)و(١٢) لەلا٨٥دا دەڵێت:-" دەتوانین شیعرەکانی باباتاهیر بکەینە دوو بەشەوە.

**یەکەمیان؛** شیعرە باتنیەکانی باباتاهیرن کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە ئایینی ئەهلی هەقەوە هەیە.

**دووەمیـــان**" شیعرە زارابیـەکانی باباتـاهیر کـەزیاتر بەمەبەستی دنیـای نووسیووتی بەڵام لـە نـاواخنی ئـەم شیعرانەدا زۆر جار بیروباوەڕی ئەهلی هــەق دەردەکـــەون. وەك لـــە لێکدانـــەوەی ئـــەم دوو چـــوارینەدا دەردەکەوێت:-

خۆشــــا انــــان کــــەهر شــــامان تەويننـــــد
ســــخن واتــــە گــــرن واتــــە نــــشينتند
گــــرم دســــرس نبــــی ایــــم تــــەوینم
بــــشم انــــان بــــوینم کەتــــە ویننـــــد

واتە:

خۆزگەم بەوانەی هەر شامیٚ* تۆ دەبینن شام=ئێواران
لەگـــەڵت دەدوێـــن لەگـــەڵت دادەنیـــشن
گــەر مــن دەســڕەم نــەبوو بــێم تــۆ ببیــنم
دەچـــم ئەوانـــە دەبیـــنم کـــەتۆ دەبیـــنن

زیـاتر روونـاکی دەخاتـە سـەر ئـەو چـوارینەیە لەسـەر زاری د.مـارف خەزنەدار کە ووتویـەتی:-" باباتـاهیر لێرەدا جاریٚ نەگەیشتۆتە تەویسالٚی مەعشوقەکەی بۆیـە بەناراستەوخۆ ئاواتـە خـوازە بیگـاتیٚ لـە ڕێگـای کـە سـانێکی تـرەوە کـە بەویـسالٚ گەیـشتوون"؟ ئـەو مەعـشوقەی باباتـاهیر پەروەردگارە. ئەمەش زمانی ئاخاوتنی سۆفیگەریە. یـان لـە چـوارینەیەکیدا کە باباتاهیر خودا دەدۆزێتەوە، ئیدی بـۆی دەردەکەوێت کـەماوای خـوا تـەنیا زەریانیـە، بگـرە لەسـارا و کێـو و دەشـت و هـەموو شـت و شـوێن و جێگایەکـدا مـاوای هەیـە. ئـەو خۆشەویستیەکە لـە هـەموو شـتێکدا بـەدی دەکرێت، ئەو عیشقێکە لەهەر زەڕەیەکدایە هەیە:

بـــــصحراء بنگـــــرم صـــــحرا تـــــەوينم
بـــــدريا بنگـــــرم دريـــــا تـــــەوينم
بهرجـــــا بنگـــــرم كـــــوه دەر و دشـــــت
نـــــشان از قامـــــت رعنـــــا تـــــەوينم

واتە

دەنۆررمـــە ســـارا لـــە ســـارا تـــۆ دەبيـــنم
دەنۆرمـــە زەريـــا لـــە زەريـــا تـــۆ دەبيـــنم
هـــەركوێ دەنـــۆڕم كێـــو ودەرو دەشـــت
نيـــشانەی باڵـــای رەعنـــای تـــۆ دەبيـــنم

## خوابگاهی باباتاهير

بـوونی خوابگـاهی باباتـاهير لەشـاری هەمـەدان لـە ئێـران و لەسـەر تەپۆڵكێ مام ناوەندە بەرزی كە دەكەوێتە ژووروی خۆرئاوای شارەكەوە لە كوچەی بن بازار زيارەتگاهی هەمووانە وە لەكۆنترين كتێب كەهی(حمد الله المـستوفی)يـە لەسـاڵی ٧٥٠ك كۆچـی دوايـی كـردوە نـاوی كتێبەكە(نزهت القلوب)ەباسی ئەو خوابگاهەی كردوە. شێخ مەحەمدی خاڵ لەگۆڤاری كۆڕی زانياری كورد بەرگی(٥)لەلا٣٠دا باسی گۆڕەكەی دەكا و دەڵێ:-" هەر لەو ژوورەشدا دوو گـۆڕی كە هەيە يەكێكيان هی دايانەكەيـــەتی كەفاتمەيەپاســـەوانانی گڵكـــۆی باباتـــاهيريش دەڵێن:فاتمەيەكی ديكە هەر لەو ناوەدا نيژراوە دەبێ تێكەڵی يەكدی نەكرێن وەك ئەحمەد تاقانە دەڵێت لەلا ٢٥ ی كتيبەكەيداهەر وا دەڵيت :ئازادهەمەدانی (ديوان لەلا١٦، ٢١) ژنەشيردەری باباتاهير (مامان) باسی دەكا و پەيوەندی نێوانيان بەشێوەيەكی مەدەنی بووە باسی دەكات،

ئەوی تریان هی(حاج میرزا عەلی فەقیێ کەوسەری)یە، هەرسیێ گۆڕەکە سندوقێکی داری لووس هابەسەریانەوە". ئەو خوابگاهە هەموو کەس بۆی هەیە زیارەتی بکات جگە لەیارو موریدەکانی ڕێگە و بڕوای باباتاهیر، چەند ژوورێکی تر هەن لەدەورو بەری بۆ نوێژکردن و حەسانەوە بەس لێرەدا پرسیارێك خۆی دەنوێنێ کە ئایا تەپۆلکەکەی خوابگاکە هەمان تەپۆلکەیە باباتاهیر پێشوازی و ئامۆژگاری سوڵتانی سەلجووقیەکانی کرد(تورغرل بێك)لەکاتی داگیرکردنی شاری هەمەدان یان نەء؟

بەڵام مینۆرسکی لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا بەرگی (٣) لەلا٢٣٧دا دەڵێ:-"(فاتمە لەرە) لەتەنیشتی گۆری باباتاهیر بەخاك سپێراوەو دەبێ لەنێوان ئەم فاتمەیەو فاتمەیەکی تر تێکەڵاوی نەکەین کەلە هەمان جێگەدا هەیە". واتا لێرەدا بەپێی ووتەی مینۆرسکی چوار گۆڕ هەیە لەو جێگایەدا وەك مەحەمد خاڵیش دەڵێ:-" گۆری حاج میرزا عەلی فەقیێ کەوسەریش لەوێ یە" هەروا عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی لەگۆڤاری(لوغة العرب) ژ.(٨)لەلا٦٠٨دا باسی خوابگاهی باباتاهیر دەکا لەشاری مەندەلی و دەڵێ:- قەلەم حاجیەکان تەکیەیەکیان هەیە زیارەتگاهێکی تیایە گوایە هی یەکێك لە ئیمامی گەورەکانە بەناوی ( شێخ باباتاهیر) هەر کەسێك بۆی هەیە بڕواتە ئەو شوێنە.

لە لایەکی کەوش عەلی سەید گۆرانی لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەشی دووەم بەرگی دووەم لەلا١١٠ باسی مەقامیکی تر دەکا بۆ باباتاهیر لەنزیك شاری پاوەی ئێرانی و دەڵێ:-" یەکێك لەپیاوە ئایینیەکان و پایەبەرزو شاعیری بەناوبانگ (باباتاهیر) کە مەقامێکی پیرۆزی هەیە گۆری شاهزادە ئەحمەدی تیایە لەنزیك ناوچەی (بێ ئاوْ) لەخاکی کەلەوەند بەرامبەر ناوچەی کۆس(مجێوری) ئەو یەکێکە لەسەیدەکانی خێڵی پاوە. زۆرتر بیرورِا وا دەچی کە خوا بگاهی باباتاهیر لەهەمەدان بێت بەڵام ئەو

جێگەیانەی کەمەقامیان هەیە(زیارەگاھ) دوورنیە لە خۆشەویستی بابا بێت ئەو مەقامانەیان دروست کردبێ لەتەکیەکاندا و زیاتر بایەخیان داوەتێ بۆ زیاتر رێز لێنان و جێگەی کۆبوونەوی ئایینیەکەیان.

## شیعرەکانی با شیعرەکانی باباتاهیر

(١)

تــــەن میحنـــــەت کـــــشی دیــــرم خودایـــــا
دڵ حەســــــرەت کـــــشی دیـــــرم خودایـــــا
زە شـــــــەوق مەســــــــکەن وداد غـــــــەریبی
بـــــە ســـــینە ئاتەشـــــێ دیـــــرم خودایـــــا

کشی =کێشی . تەن = گیان . دیرم =هەمە .مەسکەن =ماڵ . ئاتەش = ئاگر

ناوەرۆکی چوارینە کە ئەوەیە شاعیر وەك سۆفیەکی بێ ماڵ وحاڵ کە بە پاڕانەوە لە خوای گەورە دەڵێت:- من گیانم هەر لە ڕەنج ومیحنەتدایە ودڵم حەسرەتی هەیەو ئاواتەکانی نەهاتوەتەدی، کەلەم دونیایە غەریبم، هەمیشە بە پەرۆشەوەم بگەم بەجێگای هەقیقەتی لە حزوری تۆدا، بۆیە لەسینەمدا ئاگرێك هەڵبوە، بەهۆیسۆزو ئەوینی دیداری هەق .

دڵزار لە گەنجینەکەیداگۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی :

لەشـــی مەینـــەت کەشـــم هـــەس ئـــەی خودایـــە
دڵـــی حەســـرەت کەشـــم هـــەس ئـــەی خودایـــە
لـــــە تـــــاوی مەفتـــــەنو دادی غـــــەریبی
لەســـــینە ئاتەشـــــم هـــــەس ئـــــەی خودایـــــە

کشی= کێش، کیشم له کێشانەوەیە . ووشەی هەس زیاتر لە ناوچەکانی دەوروبەری خانەقین ونزیك کرمانشاه بە کار دێت، دیرم بە کار دێت لە لورستان بەگشتی.

لە دوو بەیتەهای بابا تاهیر لا ٣٦ ئەم خشتەیە بەم جۆرە هاتووە :

زە شەوق مەسکەنو جەور غەریبی، هەر وەها لە جیاتی دلّ حەسرەت نوسراوە دلّ با غەم

(٢)

بـــێ تـــە یـــاردب بـــە بۆســـتان گـــولّ مـــەرویا
ئـــەگر رویـــا کەســـــش هـــــەرگز مـــــەبویا
بـــێ تـــە هـــەر کـــەس بەخەنـــدە لـــەب کـــشایە
رەخـــش ئـــەز خـــوون دلّ هـــەرکز مەشـــویا

بێ تە= بێ تۆ. مەرویا =نارویێت .مەبویا =ئەبوو .کشایە =دێت مەشویا =دەشێ. ئەز =لە

واتە:- خودایا بەبێ فەرمانی تۆ گولّ لە گولّستان ناڕوێت، ئەگەر گولّ بڕوێ وخاوەنی گوازار هەر کێ بێت، بەبێ تۆ ئەو گولّە بزەیەك(خەندەیەك) بەسەر لیویدا بێنایەت، هرگیز دەشێت رەخشێ لە خوێنی دلّدا بتلیتەوە. زۆر دەچێتەوە سەر قسەی پێشینان کە دەلّێت: بێ فەرمانی خوا گەلاّ لە دار نایێتەوە.

لە دوو بەیتەهای بابا تاهیر نیوە دێڕی سێیەم بەم شێوەی خوارەوە هاتوە :-

بـێ تـە هـەر گـوڵ بەخەنـدە لـەب کـشایەد

(٣)

بەبەنـــدەم شـــاڵ و میپوشـــەم قـــەدەك ڕا
بنـــازم گـــەردش چـــەرخ و فەلـــەك ڕا
بگـــەردم ئـــاب دەریـــا هـــا سەراســـەر
بـــشوویەم هـــەردوو دەســـت بـــێ نمـــەك ڕا

بەبەنـدەم=بەجەسـتەم، بـەگیانم .میپوشـەم= لەبـەر ئەکـەم، ئەپۆشـم .قەدەك ڕا =سەر تا پ بنازم گەردش=سەیرانیك ڕیك خەم یان دەکەم . بگەردم= بگەرێم، بسوورێمەوە بشوویەم= بشووم.نمەك= خوێ
واتە:-خەرقەی سۆفیگەری بە گیانوجەستەم دەپۆشم تا دونیا سەراسەر بگەرێم، ئارەزوەکانی دڵ ودەروون پێ شێل بکەم تا بگەم بەو هیواو ئاواتەی لە سەری داوم، بەیەکجارەکی لەناخدا بدرەوشێمەوە ئەوەش بەرزترین پلەیە لە دونیای سۆفیگەریدا.

(٤)

تـــە کـــە نـــا خوانـــدی علـــم ســـەماوات
تـــە کـــە نـــابوردی رە دەر خـــەرابات
تەکـــە ســـوود وزیـــان خـــود نـــەدانی
بـــە یـــاروون ڕەســـی هـــەیهات هـــەیهات

تـە=تـۆ . ناخوانـدی=نەخویندووتـە .نـابوردە رە=ڕێـت نـەبردوە .بـە یاروون=بە یاران، دۆستان .نەدانی=نازانی .ڕەسی=دەگەی

واتە:-ئەگەر تۆ شارەزاییت نەبێ لە ئایین وئاین زانی ورەنجت نەدابێ ئاگات لە خێرو شەرنەبێتوسوودوزیانی خۆت نەزانی کەی دەگەی بە ئاوات لە ریزی یاراندا دەبیت.

دڵزار لە گەنجێنەکەیدالەلا٤١دا اکردویە بە سوورانی بە شێوەی خوارەوە:-

کەتۆ نەت خوێندوە عیلمی سەماوات
کە تۆ نابەیتە دەر ڕێ لە خەرابات
کە تۆ سوودو زیانی خۆت نەزانی
بە یاران کەی ئەگەی هەیهات هەیهات

(٥)

ئەگەر دڵ دولبەرو دولبەر کودامئەست
وەگەر دولبەر دڵو دڵ ڕاچەنام ئەست
دڵ و دولبەر نەهەم ئامێتە وینەم
نەدوونەم دلکەودولبەر کودام ئەست

کودام= کێ یە، کامەیە .چەنام=لەناوە، لە ناخدایە. نەهەم=نەغەم وهەم. ئامێتە= ئاوێتە، تێك ئاڵاو. نەدوونەم=نازانم . وینەم=دەبینم

مەبەستی بابا لیرەدا لە دولبەرەکەی ئەو عیشق و سەودایە خوداییە کە دڵی هەمیشە لێدانی لە ناخدا لە پێناوی ئەودایە، خۆی وا دەبینێ کە دڵ ودولبەرەکەی واتە ئەوین وسەودایی هەمیشە ئاوێتەی غەمن بە شێوەیەك گەیشتوەتە ڕادەیەك لیکیان ناکاتەوە.

فەهمی کاکەیی بەم شێوەیە کردوویە بە سۆرانی لە گۆڤاری مامۆستای کورد ژ(١١)و(١٢)دا:

ئەگـــەر دڵ دڵبـــەر بـــێ ئـــەی دڵبـــەر کێیـــە
گـەر دڵبـەر دڵبـێ دڵ لـەکام جێیـە(نـاوی چـییە)
هـــەم دڵ هـــەم دڵبـــەر ئامێتـــەی یـــەکن
نـــازانم دڵ کـــام ودڵبـــەریش کێیـــە

پاش دۆزینەوەی مەعشووق ونۆشکردنی جامی مەی و سەردانی دەمەو ئێواران، نەختە نەختە بابا خوورەوشت وخەسڵەتەکانی خۆی دادەماڵێت وبە خەسڵەت وسیفاتی ئەو خوودەگرێت ودەگاتە دوا پلەی سۆفیگەری کە قۆناغی نیستی(فەنا)یە وئیدی لەبۆی جودا ناکرێتەوە کە عاشق کێیە ومەعشووق کێیە.

صدیق بۆرەکەیی لە مێژووی وێژەی کوردی دا بەم شێوەی نوسیوە وە لێکی داوەتەوە :-

ئەگـــــەردڵ دڵبـــــەرو دڵبـــــەر کودوومـــــە
وەگـــــەر دڵبـــــەر دڵ ودڵ ڕا چـــــەنوومە
دڵ ودوڵبـــــەر وەهـــــەم ئاویتـــــە وێنـــــەم
نەزوونـــــەم دڵ کـــــەو دڵبـــــەر کودوومـــــە

واتە:-ئەگەر دڵ دڵبەرە ئەی دڵبەر کامەیە؟ ئەگەر دڵبەر دڵە ئەی دڵبەر ناوی چییە؟ دڵ ودوڵبەر پێکەوە تێکەڵاو و ئاویتە ئەبینم دڵ کام ودڵبەر کامەیە؟

لە مێژووی ئەدەبی کوردی د. مارف خەزنەدارلە لا ٢١١دا بەم شێوەیە هاتووە:-

ئەگـــــەر دڵ دڵبـــــەرە دڵبـــــەر چ نوومـــــە
وەگـــــەر دڵبـــــەر دڵـــــە ئـــــەز چ نوومـــــە
دڵ ودوڵبـــــەر بەهـــــەم ئامێتـــــە دێـــــروم
نەزونـــــەم دڵ کەهـــــە دڵبـــــەر کدوومـــــە

واته:-

ئەگـــەردڵ دڵبـــەرە دڵبـــەر نـــاوی چـــییە
ئەگـــەر دڵبـــەر دڵـــە دڵ نـــاوی چـــییە
دڵ ودڵبـــەر تێکـــەڵ بـــە یـــەکتری بـــوون
نـــازانم دڵ کێیـــەو دڵبـــەر کامەیـــە

ئینجا دەڵێت :- دڵبەر هەموو شتێکە ولە هەموو جیٚ یەکە، واتە بوون ئەوە یا لەوەوەیە، بابا تاهیر بەشێکە لە بوونی دڵبەر، لە یەکتر جیا نابنەوە ئەگەر چی وەکو دوو جەوهەر خۆیان دەنوێنن.بەڵام لە راستیدا یەك جەوهەرن.

هەروا رازش لە لا ٣٠ دا کردویەتی بە سۆرانی .

(٦)

شـــەب تاریـــك وسەنگـــستان وموەمەســـت
قـــەدەح ئـــەز دەســـت مـــو ئـــەفتادە نەشکـــست
نیگـــەدار نـــەداش نێـــك ونیگـــە داشـــت
وەگـــەر نـــە صـــەد قـــەدەح نـــەفتادە بشکـــست

شەب=شەو . قەدەح=کاسەی مەی .مو=من، ئێمە .نیك=چاکە، کاری باش.نەداش=نەی بوو، نیەتی.سەنگستان، سەنگ=بەرد، جیگای بەرد . ئەفتادە=کەوت، بەربووەوە

*فەهمی کاکەی لە گوڤاری ماموستای کورد ژ (١١)و(١٢) دا دەڵێت :-ئیدی لە خۆشی ئەوەی بابا خۆشەویستەکەی خۆی دەدۆزیتەوە، لە چاوی ئەو بادەی مەی نۆش دەکات، هەر بۆیە لە تاریکی شەوی تاراو لە ڕێگای پڕ لە کۆسپ وتەگەرەی هەق پەرستیدا ئەم مەستەوسەرخۆشە ...

مەستی عشقێکی یەزدانیە کە هیچ شتێکی دی جیگای بەو عیشقە لەق ناکات تەنانەت ئەگەر چی کۆسپ وتەگەرە بادەی عیشقەکەی لەدەست بخەن، بەلاّم بادە ناشکێت، چونکە لەپیناو ئەو خۆشەویستیەداهەموو جۆرە ناخۆشي وزەحمەتییەك قەبولْ دەکات وەگومانی لیی نییە، خەڵکی دی چونکە خوشەویستیان بناغەیەکی راستەقینەی نییە بادە هەر لە ناو دەستیاندا شکا .

* وەبەم شێوەی خوارەوە کردویەتی بە سۆرانی :

شەو تاریکە وبەردستانە ومنم مەست
بادە لە دەستم کەوت نەشکا
چاودێرەکەی چاك چاوی لێوە بوو(پاراستی)
وەگەر نا سەد بادەی نەکەوتوو شکا

(٧)

عەزیزا کاسەی چەشمم سەرایەت
مەیان هەردوو چەشمم خاك پایەت
ئەز ئان ترسەم کە غافلْ پا نەهی باز
نشینەد خار موژگانم بە پایەت

چەشم= چاو . پایەت=پییەکانت. ترسەم= دەترسێم. سەرایەت =دەشتی، راستی، چۆلّی . خار= درِك پانەهی=پیْ بنێی، پێت بکەوێت.
واتە:-

ئازیزم وەرە چاوانی من سەیرانگای توویە
پیْ بنی بەبان چاوانا، با بتگرمە ئامێز
دەترسێم لە غەفلەتدا پیْ(هەنگاو) بنیی
تیژی برژانگەکانم ئازاری بن پێت بدەن

ماموستا فوئاد حسین لە کتیبەکەیدا(ئافرەت لە هونراوەی کوردیداله لاه٥) دەڵێت :- لیرەدا چاو کە بەکلکترین ئەنداماني لەش دەژمێردرێت شاعیر دەیکا بە قوربانی بەر پێی خۆشەویستەکەی ولە برژانگەکانی دەترسی نەوەك زیان بە دڵبەرەکەی بگەیەنێت.

ئەم دوڵبەرەی بابا تاهیر کی یە؟! تا ئیستا لە چوارینەکانی بابا تاهیردا ناوی هیچ ئافرەتێك نەهاتووە دوڵبەری بابا بێت، وەك شاعیرەکانی دی ی کوردەواری، ئەو دوڵبەرەی بابا تاهیر

لە پەنهانە، لە پشت پەردەوەدایە هەموو کەس ئەگەر دەرکی پێ بکات بەلاَم نایبینیْ. بۆیە گۆشش وسکالاَی باباتاهیر هەمیشە بۆ ئەوەیە، لە پشت پەردەوە چاوی پێی بکەوی وشادمانبێت وپەنهانی بوو بابانەمێنی.

(٨)

بوود دەرد مو دەرمونم ئەز دۆست
بوود وەصلْ مو هیجروونم ئەز دۆست
ئەگەر قەصابم ئەز تەن واکرە پۆست
جودا هەرکز نەکردە جوونم ئەز دۆست

بوود= دەبیْ، دەشێ .دەرموون=دەرمان، دەوا . واکرە= داماڵێت، لێی کاتەوە .جوونم= گیانم

بابا دەڵیت:- دەبیْ دەرمانی ئەو دەردەی من کە گیروودەی بوومە لای دۆستەکەم بێت، دیێت لەم سەرگەردانی ووێڵی ودووریەم بگەم بە دۆست، ئەمن هەر ئەوینی ئەوم لەم ریگایەدا رەنج دەدەم ئەگەر قەسابیش پۆستم لەلەشم بکاتەوە من هەر عاشقی ئەوم لەوجودا نابمەوە، تادەیگەمیْ دلْ دادەمرکێت بەیەکجاری .

دلزار لە گەنجینەکەیدا بە شێوەی خوارەوە کردویە بە سۆرانی لە لا٩٥ دا:

لـــــه یارەوەیـــــــه دەردو دەرمـــــــانم
لـــــه یارەوەیـــــه وەصـــــڵ وهیجـــــرانم
قەســـــاب گـــــەر پێـــــستم لەبـــــەرداماڵێ
جیـــــا ناکاتـــــەوه لـــــەیار گیـــــانم

(٩)

تـــه دووری ئـــەز بـــەرم دڵ دەر بـــەرم نیـــست
هـــەوای دیگـــەرێ ئانـــد ســـەرم نیـــست
بـــەجان دوڵبـــەرم کـــز هـــەدوو عالـــەم
تەمـــەننای دیگـــەر جـــز دوڵبـــەرم نیـــست

تە= تۆ . بەرم= لەبەدەن . دیگەر= یەکیکی کە . نیست= نیە . ئاند سەرم = لە سەرما، لە نێو سەرما . کز= مەلول، کزی .چز= هیچ
واتە:-ئەی ئەوینی من لەدووری تۆیا دڵ لە بەدەنم لەگیانم نەماوە، گیرودەت بووم وغەیرە ئەوینی تۆ هیچ کەس لە مێشکدا نیە، سوێندت پێ دەخووم کە لە هەردوو دونیادا هەر مل کەچی تۆ بم، غەیرە ئەوەش هیچ ئاواتیکی دیکەم نیە .

(١٠)

خـورەم کوهـان خـورەم کوهـان خـورەم دەشـت
خـــورەم ئانـــان کـــه ئـــاین الا لیـــان گەشـــت
وەســـێ هەنـــدۆ وەســـێ شـــەندۆ وەســـێ یەنـــد
هـــەمان کـــۆه وهـــەمان هـــاموون هـــەمان دەشـــت

خورەم= خووشە، دڵگیرە .کوە= چیا، شاخ .ئانان= ئەوانە .ئاین الالیان=بەدڵ شادی . وەسێ= دەمێ، جارێ .هەند= سەیران .شەند= شایی، زەماوەند .یەند= ڕاو . هاموون = ماوە، نێوان .

رازی له لا ٧٢ دا کردویه به سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە.

(١٠)

خوشه شاخان خوشه چیا خۆشه دەشت
خۆشه هەموو بەدڵشادی بکەین گەشت
دەمێ سەیران دەمێ شایی دەمێ ڕاو
هەر ئەو کیوەکاڵی زانی بووە دەشت

واته:- گەشت وگوزار وگەڕان چەند خۆشه له ناو ئەو چیاو دۆڵ ودەشته، دەمێك سەیران کەی، دەمێك شایی ودەمێك ڕاو لەنێوان هەمان چیاو دۆڵ ودەشتدا .

(١١)

بەهار ئامەد بە سەحراو دەرو دەشت
جوانی هەم بەهاری بوودو بگودەشت
سەر قەبر جوانوون لاله روویەد
دەمێ کە مەهوشان ئاین بەگل گەشت

ئامەد= هات .لاله= هەڵاڵه جۆره گوڵێکه . روویه=شین بوو، سەوز بوو . بگودەشت=تێ دەپەرێ، نەگەرایەوە. مەهوشان= مەست ودڵ خۆش. ئاین= بەژانەوە .جوانون= جوانان، لاوان.

رازی له لا ٣٠ کردویه به سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە .

ئەوا بەهار هات گیاژیا یەوە
بەهاری جوانیم نەگەڕایەوە
لا له روا لەسەر گۆڕی جوانان
سەیرانگای مەستان وا بوژایەوە

واته:-

بـەهار هـات دایپۆشـی دەشـت ودەورو بیابـان
ئەو بـەهارە بـوو ڕۆیـشت نەگەرایـەوەو بـەجوانی
لــە ســەر گــۆڕی لاوان گــوڵی هەڵاڵــە ڕوا
دەمێك(ساتیك) دڵ خۆش وبوژانەوە لە ناو گوڵدا

(١٢)

نمـــی پورســـی ز یـــار دڵ فکـــارت
کـــەوا گیـــان گودەشـــت بـــاغ زبـــەهارت
تـــە یـــاد مـــو دەر ئـــین مـــودەت میکـــونی
نەدونـــەم واکیـــان بـــیٚ ســـەرو کـــارت

نمی پورسی= ناپرسی . فکار= غەمبار، ما ت ومەلول، دوو چاری برین. مـەکونی=دەکـەی دەر ئـین= لـەم ماوەیـە دا . نەدوونـەم= نـازانم . واکیان=کردنەوە، دەست پیٚ کردن
ئەحمەد تاقانە لە کتیبەکەی( باباتاهیری هەمەدانی ژیان وبەرهەمی)

لەلا٢٩٧داگوریویەتی بۆ سەر سورانی بەم شێوەیە :
تـــۆ ناپرســـی لـــە یـــاری دڵ زامـــارت
کـــە وەل کێـــت بـــردە ســـەر بـــاغ وبـــەهارت
ئـــەتۆ لـــەم مـــاوەدا لـــە منـــت نەپرســـی
لەگـــەل کـــی بـــوو نـــزانم ســـەروکارت

دەقەکەی لە کتیبی وەحید دەستکردی وەر گرتوە کە هەمان ئەو دەقەیە لە کتیبی عە باس رەجەویدا هەیە. بەلاَم لە جیاتی بڕگەی (کەولێ کێت بردە سەر) ئەم بڕگەیە هەیە (کەوا کیان گدەشت) .

(١٣)

شـیر مـەردی بـدەم دڵـم چـە زونەسـت
ئەجـەل قەسـدم کـرە شـیر زەیونەسـت
ژە مـو شـیر ژیـون پـڕ هێـز میکـەرد
تـەنم وا مـەرك جەنگیـدەن نەدونەسـت

رازی لە ٣٧ دا کرویە بە سۆرانی بەم شێوەیەی خوارەوە.

شـێری مـەردم بـەلاَم دڵ چـی ئـەزانی
ڕێـوی ئەجـەل هـاتوە بـۆ شـکانی
لـەڕۆم وەسـتاوە وەك شـێر بەهەڵمـەت
دەمـێ چەشـتی ئەلێـسێ بـەزوبانی

ژیـون= ژیـان . مـەرگ = مـردن .جەنگیـدەن= ئەجـەنگی، ئەچەشـێ.
نەدونەست= نازانێ . شیر مەردی= شێری مەردم

(١٤)

یـەکێ بـەرزیکری نـاڵون دەرئـین دەشـت
بەچەشـم خـون فـشان ئالالـە میگەشـت
هـەمی گەشـت و هـەمی گوفـت ئـەی دریٚخـا
کەبایـەد کوشـتەن و هێـشتەن دەرئـین دەشـت

خوون فشان=خوێن باران. میگەشت=ئەچەند. زیکری ناڵون=لەناڵەو زکردایە. میگوفت=ئەیووت. هیشتەن=بەجێهێشتن. کوشتەن=چاندن.

دڵزار بەم شێوەی خوارە کردوویەتی بەسورانی لەژێر لا۸۸دا:

وەرزێـــــریٚ لەئـــــەم دەشـــــتە ئەیناڵانـــــد
بەچـــــاوی خونبـــــار هەڵالـــــەی ئەچـــــاند
هـــــەر ئەیوەشـــــان و ئـــــەیووت درێخـــــا
ئـــــەبیٚ لـــــەم دەشـــــتە چـــــاندن و جێمـــــان

(١٥)

نـــــەقش شـــــومم بـــــەدونیا بـــــە هـــــەر ئانەســـــت
کەتـــــەن ئـــــەز بـــــەهر مـــــووران پەروەرانـــــست
نەدونەســـــتم کەشـــــەرگ بەنـــــدەکی چیـــــست
هـــــەرزە بـــــوورەم بەمەیـــــدان جیهانەســـــت

بـــەهرە=بـــەش. مـــووران=مێـــروو. هـــەرزەبوورەم=هـــەرزەکارم. نەدونەستەم=نـەمزانی. بەنـدەکی=بەنـدە. پەروەروانەسـت=پـەروەردە. چیست=چیە.

(١٦)

دڵـــــیٚ دیـــــرم خەریـــــداری موحەبـــــەت
کزئـــــوو گـــــەرم ئەســـــت بـــــازار موحەبـــــەت
لیباســـــیٚ بافتـــــەم بـــــەر قامـــــەت دڵ
زبـــــوود موحنـــــەت وتـــــار موحەبـــــەت

دیـرم=هەمـە. خەریـدار=کڕیـار. کـز=گـڕ، گڵپـە. بافتـەم=پۆشـاوە، لەبەرکردووە. بوود=پۆ. تار=تان.

دڵزار لەگەنجێنەکەیدا لەلا٣٥دا بەم شێوەیە کوورتی بەسۆرانی:

دڵـــێکم هەیـــە کڕیـــاری ئەوینـــە(موحەبـــەت)
گـــری زۆر گەرمـــە لـــە بـــازاری ئەوینـــداری
بـــــەرگێکم پۆشـــــیوە بەقامـــــەتی دڵ
لـەیادی بـێ ئـارامی و شـەوی تـاریکی ئـەوین

شێخ مەحەمەدخاڵ لەپەرتووکەکەی باباتاهیرهەمەدانی چاپی بەغداد ساڵی ١٩٧٧ لـەلا١٥دا دەڵێـت:-" باباتـاهیر شـاعیرێکی بـەرزو باڵایـە بەسروشـت و عاشقێکی دڵ سوتاوی دەروون برینـداره بـەجۆرێکی وا کـە کاڵایـەکی عاشـقانەی بـەباڵای خـۆی بڕیـوە کـە پـۆی مەینـەت وڕایـەڵی لەموحەبەت "وەك خۆی دەڵێ:

دڵـــێکم هـــەس کڕێـــداری موحەبـــەت
لـــەلای ئـــەو گەرمـــە بـــازاری موحەبـــەت
کراســـێکم بـــە باڵـــای ئـــەو بڕیـــوە
لـــەپۆی مەینـــەت و تـــانی موحەبـــەت

(١٧)

قـــەزا پێویـــستە دەر گۆشـــم بـــواچ
کـــەئین دەر دڵ تـــو و بـــێ عـــیلاج
ئەگـــەر گەوهـــەر بـــەبێ خواهـــوون نـــەداری
هـــەمی ئـــین جـــوون توکـــەبێ رەواج

دەرگۆشـم بـواچ=بـەگوێما بڵـێ. خواهـوون=داواکـار. جـوون=گیـان. هـەمین ئـین=هەمووئەمـە، گـشت ئەمـە.قـەزا=حاجـەت. گەوهـەر=لێرەدا مەبەستی گیان و روح.

(١٨)

زه دەســـت دیـــده و دڵ هـــەردوو فریـــاد
هــەر ئانــچە دیــده بینــەد دڵ کونــەد یــاد
بـــسازم خەنجـــەرێ نیـــشش زه پـــۆڵاد
زەنم بـــەر دیـــده تـــا دڵ گـــردەد ئـــازاد

ئانـچە= هەمووشـت، هـەر شـت... دیـده بینـەد= چـاو دەبینـی. کونـەد= دەکات. بسازم= دروست بکەم. نیشش= نوکی. زەنم= لێ دەم

*دڵزار له گەنجینەکەیدا کردویه به سورانی :- لـه دەس چـاو لـه دەس دڵ هەردوو فریاد

کـــە چـــاو هـــەر چـــی ببینـــێ دڵ ئـــەکا یـــاد
ئەکـــەم مـــن خەنجـــەرێ نـــووکی لـــە پـــوڵاد
ئـــیتر ئەیـــدەم لـــە چـــاو تـــا بـــێ ئـــازاد

م. علاء الدین سجادی له دەقەکانی ئەدەبی کوردیدالا٤٤دەڵێت:-( ئەم چـوار خـشتەکیانه بەرهـەمی هەست وسۆزی بـەرزی هونـەری رەنـد وقەلەندەر بابا تایەری هەمەدانی یه.

شیخ مەحەمەد خاڵ له پەرتوکی بابا تـاهیر لا ١٦ هـەمان ئـەو گورپنـەی دڵـزاری نوسـیوەتەوە، بـەلاّم دەڵێـت: ئـەم چـوارینەیە بەسـەر هـەر دڵ مردویـەکا بخوێنریتـەوە، زینـدوی دەکاتـەوە وتـەپوتۆزی مردنـی لێ دوور دەخاتـەوە. باباتـاهیر بـەزمانێکی کـوردی رەوان باسـی سـۆزو شـۆری دڵـی خـۆی دەکـات و سـازی بابـا لەگـەڵ تـاری دڵـی ئـەوانا ساز دەبـێ ورێـك دەکەوێ.

(١٩)

خــوڕڕەم ئانــان کــە ئــەز تــەن جــان نەدانەنــد
زە جانـــان جـــان زەجـــان جانـــان نەدانەنـــد
بـــەدەردش خـــوو گـــرن ســـالأن و ماهـــان
بـــەدەرد خۆیـــشتن دەرمـــان نەدانەنـــد

رازی لە ل ٦٧ دا کردویە بە سۆرانی ئەم شێوەی خوارەوە.

خۆشـــە گیانـــت لـــەرێی جانانـــە دانـــان
لـــە جوانـــان جـــوانی و گیـــان بـــۆ جوانـــان
بـــەم جۆرەبگـــەرێ ڕۆژ و مـــانگ و ســـاڵ
تگـــای دەرمـــان بـــۆ تـــە پیـــشەی نـــەزانان

خوڕڕەم= خۆشە .نەدانەند= نەزانێ، ئاگادار نەبێ .زەجانان جان= لە جوانان جوانی. خۆیشتن= پیشەی .خووگرن= جووگرتن، پیوەی بتلێ، بەر دەوام بوون.

(٢٠)

هــەر ئــان کــەس عاشقەسـت ئــەز جــوون نەترســەد
عاشـــق ئـــەز کنـــدە وزنـــدوون نـــە ترســـەد
دڵ عاشـــــق بـــوود گـــورگ کرســــــەنە
کـــە گـــورگ ئـــەز هـــی هـــی چـــوبان نەترســـەد

ئانکــەس= ئــەو کەســە، هــەر کەســێ .جــوون =گیــان . نەترســەد= ناترسێ.کندە= جەورو جەفا .زەندوون= زیندانی، بەند کردن .کرسەنە= برسی .چۆبان= شوان.

واتە :- ئەوەی توشی ئەوینی ڕێگای خوایی بێت، لە مردن ناترسێ وچی بە سەر دێت، وەلەبەندکردن وجەورو جەفا، دڵ عاشقی ڕەوتی سۆفی گەری بوو وەك گورگی برسی وایە، لە هات و هاوارو هەرەشە سڵ ناکاتەوە، دەیەوێ بگاتە مەبەست. ئەو مەبەستەش نزیك بوونەوە بە پەروەردگار.

دڵزاریش بەم شێوەی خوارەوە لە گەنجینەکەیدا گوریویەتی سەر سۆرانی لە لا٧٦دا :-

ئـــەو کەســـە عاشـــقە لـــە گیـــان نەترســـێ
عاشـــق لـــە جـــەورو زینـــدان ناترســـێ
دڵ عاشـــق بوەتـــە گـــورگی برســـی
کـــە گـــورگ لـــە هـــی هـــی شـــوان ناترســـێ

(٢١)

خۆشـــا ئانانکـــە هـــەر شـــامان تـــە وینەنـــد
ســـوخەن واتـــە کـــەرن واتـــە نـــشینەند
کـــەرم دەس ڕەس نـــەبی ئایـــەم تـــە وینـــەم
بـــشم ئانـــان بۆینـــەم کـــە تـــە وینەنـــد

تەوینەند= تۆ دەبینێ .ئانان کە = ئەوانەی کە . سوخەن= قسە .واتە= وتن، ووتە. کەرن= بکەن، دەست پێ بکەن. نشینەند=دادەنیشن. ئایەم= مرۆڤ .بشم ئانان=دانیشتن لای ئەوان . شام= ئێوارە خواردن، ئێوارە خوان.

فەهمی کاکەی لە گۆڤاری ماموستای کورد ژ(١١)و(١٢) دا لە لا٨٨دەلێت :-(باباتاهیر بەهۆی تاعەتەوە هەمیشە لەگەڵ دلدارەکەی

ژوانی هەیە، ئەگەر ئیوارەیەك غافلٚ بێت و پێی نەكرێت بچێتە خزمەتی ئەوا پەنا دەباتە بەر ئەوانەی ئەو ئیوارەیە لە تاعەت غافل نەبوون و دەچێتە زیارەتی ئەوان.

وە لە سەر زاری د. مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی كوردیدا ژ(١) دەڵێت :-" باباتاهیر لیرەدا جاریٚ نەگەیشتوەتە وِیسالی مەعشووقەكەی، بۆیە بە ناراستەوخۆ ئاواتە خوازە بیگاتیٚ لە ڕێگای كەسانێكی ترەوە كە بە وِسالی گەیشتوون."

صدیق بۆرەكەی بەم شێوەی خوارەوە نوسیویەتی و راڤەی كردوە لە كتێبی مێژووی وێژەی كوردی ژ (١) لا ٩٢دا :-"

خوشا ئانان كە هەر شامان تە وِینون
سوخەن واتە كەرون واتە نشینون
ئەگەر دەستوم نەوی كایوم تە وینوم
بشووم ئانان بوِینوم كە تە وینون

واتە:-خوزگە بەو انەی كە هەر ئیوارەیەك تۆ ئەبینن قسە لٚەگەلٚ تۆ ئەكەن لەگەلٚ تۆدا دائەنیشن، ئەگەر دەستم نەگات كە بێم تۆ ببینم، ئەچم ئەوانە ئەبێنم كە تۆ ئەبینن.شاخۆشین كە لەگەلٚ كۆمەلێك لە موریدانی ئەوینی ڕیبازی یارسان بوون چوونە هەمەدان، باباتاهیر یەكێك بووە لە هەرە یارانی نزیكی شاخۆشین(بە فریشتەی شاخۆشین زانراوە) بۆیە بەو شێوەیە ئەدویٚ، وەكو دلٚداریكی زۆر شەیدای دیتن وئاخافتن بێت لەگەلیدا، وە ئەگەر دەستی نەگات چاوی پێی بكەویت وبە دیداری شاد بێت ئیوارانیك، ئەوا دەچیتەلای ئەویارانەی كە بە دیداری شاد بوونە لەگەلیانا نازو رازی ئاین و ئاینزانی دەكات.د.مارف خەزنەدار بەم شێوەیە لێكی دەداتەوە: "ئەو یارە یاری هەمو كەسێكە، مەعشووقەی هەمو

عاشقانه. لەبەر ئەوەیە باباتاهیر ئەو کەسانە بەبەختیار دەزانی کە گەیشتوونەتە وِسالّی مەعشووقە، دیارە خۆی جاریْ هەر لە ڕێ یەو هیشتا نەگەیشتوەتە نازەنین، ئەگەر توشی ئەو کەسانە ببیْ کە بە مەعشووقە شاد بوون ئوا ئەویش بەختیار دەبیْ چونکە ئەو عاشقانە بۆنی مەعشووقەیان پێوەیە.

(٢٢)

خوشا ئانون کە واتە هەم نشینەد
هەمیشە با دلْ خوڕڕەم نشینەد
بود ئین ڕەسم عشق وعەشقبازی
کەکستاخانە ئایەند و تە وِینەند

ئانون= ئەوانە. نشینەد= دادەنیشن. خوڕڕەم= خوشە. بوود= دەبیْ. ئایەند=دێن، هاتن. تەوینەند=تۆ دەبینن.کستاخانە= جێی کۆبوونەوە و ئایین زانی.

واتەدەڵێت:- خووشە ئەوانەی لەگەلْ توو گفتووگۆ دەکەن ودادەنیشن، هەمیشە بەدلْ خۆشی، ئەبیْ ئەم جۆرە ئەوینەو ئەویندارییە لەگەلْ تۆ لە کستەخانەوە دێن وتۆ دەبینن.

(٢٣)

خۆشا ئانون کە ئەز پا سەرنەژونەند
مەیون شوعلەی خوشك وتەڕ نەژونەند
کەنشت وکەعبەو پوتخانە ودێر
سەرائیْ خالی ئەز دولبەر نەژونەند

مـەیون= لەمـەیان، لـەنێوان.خوشـك= ووشـك. كەنـشت= كەنیـسە. سەرائی=سەر

لە نووسینی شیخ مەحەمەد خالْ لە لا٢٣٧دا:- "ئانون بوەتە ئانونكە، نەزونەند بوەتە نەزونەند، مەیون بوەتە میانی، سەرائی بوەتە سەراپا. هەر وا شیخ دەڵیت :بابا لەو دلْ بێدارانەیە كە هەمیشە دڵی ئاوەدان بوە بە یادی خواو یەك هەناسە خوای فەرامۆش نەكردوە. بۆیەلای بابا فەرقیْ كەعبەو كەنشتەو كلیسە و دێرو پتخانە نەبوە، چونكە هەموویان بۆ ئەو چوون یەك جلیوەگاهی خوا بوون.

(٢٤)

لالـه كـاران دیگـەر لالـه مەكارید
باغـەبان دوو دەسـت ئـەز گـولْ بدارید
ئەگـەر عەهـد گـولاْن ئـین بـو كـه دیدەم
بـیخ گـلْ بـەر كونیـد وخـار بكارید

لالـه كـاران = لالـه نیـژان . مەكاریـد= مەچـێنە، دەچـێنی. باغـەبان= باغەوان.بداریـد= دەست بەردار بێت، دەست هەڵگریْ. بیخ گولْ بەر كونید= گولْ لە ریشەوە دەر بێنە . خار= درك. دیگەر= جارێكی تر. عەهد= پەیمان. خار بكارید= درك بچینین.

رزای لە ٢٩ دا كۆرویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە.

لا لـه نیـژان ئـیتر لا لـه مەچـێنن
باخـەوانان دەسـتان بـۆ گـولْ مـەهێنن
وەفـایی گـولْ هـەر ئەوەنـدە بووكـە مـن دیـم
هـەڵی كێـشن لـه جێـی درك بـچێنن

(٢٥)

مـه‌كون كـاریٚ كـه بـه‌ر پـا سـه‌نگ ئایـه‌د
جیهـان بـا ئـین فراخـی تـه‌نگ ئایـه‌د
چـو فـه‌ردا نامـه خواهـان نامـه خواهه‌نـد
تـو را ئـه‌ز نامـه خوانـدن نـه‌نگ ئایـه‌د

مـه‌كون كـاریٚ=كـاریٚ مه‌كـه.سـه‌نگ= بـه‌رد، گرفـت. ئایـه‌د= بیٚـت .فراخی= بۆشایی، گه‌وره‌یی. فه‌ردا= سبه‌ی. نامه خـوان=نامه خویٚندن، مه‌به‌ستی ڕۆژی حیسابه ده‌فته‌ری ده‌خۆیٚندریته‌وه. نـه‌نگ= لـه‌نگ، واتـه لاپه‌ره‌ت لار ده‌بیت وره‌ش ده‌بیت.

مه‌به‌ستی بابا تاهیر ئامۆژگاری كردنه كه نابیٚت كاری خراپه بكریٚت وده‌وروبه‌ر ته‌گه‌ره بخریٚته ڕیان، دونیا بـه‌و فراوانـی خۆییـه‌وه تـه‌نگ بیٚـت لـه‌بـه‌ر چـاوی به‌رامبـه‌ر، چـونكه سـبه‌ی ڕۆژ هـه‌ر ده‌مـرین ولاپـه‌ره‌مان ده‌خۆیٚندریته‌وه با لاپه‌ره‌ی تۆ به‌و كاره خراپانه نه‌نگ نه‌بیٚت .

فـه‌همی كاكـه‌یی لـه گوڤـاری ماموستای كـورد ژ (١١) (١٢) لـه لا ٩٢ دا ده‌لیٚـت :- دیـاره لـه قۆنـاغی پیریـدا كـه ئیـدی مـه‌رگی لیٚ نزیـك ده‌بیٚته‌وه‌ئاوریٚك له رابردووی خۆی ده‌داته‌وه وقۆناغی یاخیبوونی خۆی دیٚته‌وه به‌ر چاو به‌م شیٚوه‌یه ئاموژگاری خـۆی ده‌كات "خـۆت گوناهبار مه‌كـه سـبه‌ی رۆژ كـه رۆژی حیـسابه، تـۆ هینـده‌ت گونـاه كردبـیٚ كه‌لـه خویٚندنه‌وه‌ی كردار نامه‌كه‌ت شه‌رم داتبگریٚت.

(٢٦)

غـه‌م عیـشقت بیـابوون پـه‌روه‌رم كـه‌رد
هـه‌وای بـه‌خت بـیٚ بـالٚ وپـه‌ڕم كـه‌رد
بـه‌مو گـوفتی صـه‌بوری كـون صـه‌بوری

صــــەبوری تــــەرەف خـــاکی بەرســـەرم کــــەرد

بیابوون= بیابان، دەشت، چوولی.بەمو گـوفتی= بەمنت وت. تەرەف خاك= قوڕ.پەڕم= پژمین، پرمە پرم، خوتە خوت.

رازی لە لا ٢٥ دا بەم شێوەیە کردویە بە سۆرانی.

عەشــــقی تــــۆ بــــۆ بیــــانی کــــرد بــــەجێم
لــــــە ئـــــاگری دوری تـــــۆدا ئەســـــــوتێم
بــــەمن ئــــەلێت ئـــارام بگـــرە بـــێ ئـــارم
ئـــارام گـــرتن ئـــەزانی چـــی ئــــەکا پـــێم

مەبەستی بابا=لەگەڵ پەروەردگار دە ئاخا ڤی و دەڵێت من شەیدای تۆم وئەوینی تۆ دیوانەی کردووم لەو دەشت و بیابانانە دەسوڕێمەوە و پەروەردە بووم.هەوای بەختی من ناگەم بە تۆ وبێ پەڕو باڵم، هەر پێم دەڵێی ئارا مت بێ وصەبر بگرە، ئەوەندە سەبرم کرد تا خاکم بوو بە سەر.

(٢٧)

ئیلاهــــــی گــــــەردەن گــــــەردوون شــــــو خــــــورد
کــــــە فەرزەنــــد جیهـــــان را جوملــــەکی بــــورد
یــــــەکی نایـــــە فلانـــــــی زینــــــــدە وا بـــــــی
هـــــەمی گویەنـــــد فـــــلان بـــــن فـــــلان مـــــورد

شو خورد= ورد بێت. فەرزەند= مناڵ، ڕۆڵە. هەمی گویەند= هەمو هەر دەڵێن. مورد= مردن.وابی= هاتەوە، گەڕایەوە

(*) دلزار کردوویە بە سورانی لە لا٣٧دا بەم شێوەی خوارەوە :-

خودایــــە گــــەردەنی گــــەردوون بــــێ وورد
کـــــە ڕۆلانـــــی جیهـــــانی جملـــــەگی بـــــرد

یـــەکێ نــــەیووت فـــلاڵن وا زینـــــدو بـــووە
ئـــەڵێن گـــشتیان فلاڵنـــی کـــوڕ فـــلاڵن مـــرد

ئەحمەد تاقانە لەلا٣٢ دا لە جیاتی جوملەکی (هەر هەموو برد) داناوە، ئەوانی تر وەکی دلزارە.

(٢٨)

دیگـــەر شـــو شـــود کـــە مـــو جـــوونم بـــسوزد
گریبـــــان تـــــا بـــــە دامـــــوونم بـــــسوزد
بـــــەرای خـــــاتری یـــــەك ســـــەبز ڕەنگـــــێ
هـــــەمی ترســـــەم کـــــە ئیمـــــوونم بـــــسوزەد

دیگەر شو شود= ئیتر چی ببێ.جوونم= گیانم. گریبان= کراس یان یاخەی کراس. داموونم= دامێنم. ئیموونم= ئیمانم. بسوزد=بسووتێ
(*) دلزار لە لا٤٠ دا لە گەنجینەکەی کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

کـــە شـــەو داهـــات ئـــەمن گیـــانم ئەســـووتێ
لـــە یاخـــەتا بـــە دامـــانم ئەســـووتێ .
لـــە بـــەر خـــاتری نیگـــاری ســـە ووزە ڕەنگـــێ
ئەترســـــم مـــــن کـــــە ئیمـــــانم بـــــسووتێ

(*) ئەحمەد تاقانە لە کتیبەکەیدا لە لا ٣١ کردویە بە سورانی ولە کۆتایی نێوە دێرەکان لە جیاتی ئەسوتی کردویە بە بسووتێ

(٢٩)

خوشـــا ئانـــان کـــە ســـەودای تـــو دیرەنـــد
کـــە ســـەر پیویـــستە دەر پـــای تـــۆ دیرەنـــد

بـــه دڵ دیـــرم تەمـــەننای کـــە ســـانێ
کـــە ئـــان دەر دڵ تەمـــەننای تـــۆ دیرەنـــد

سەودا= ئەوین وخۆشەویستی.تەمەننا=ئارەزو، هیوا. دیرم= هەمە. ئان دەر دڵ=ئەوان لە دڵەوە.پەیوەست= پابەند

واتـە :ئـەوەی سـەودای وئـەوینی پـەروەردگاری هەیـە چـەند شـادن وخووشە، سەری منیش ئەوینی تـۆی تیایـە دەیـەوێ سـوجدەی بـەر پێت بکات. بەدڵ تەمەنناوهیوام لای ئەو کەسانەیە کە ئەوان بەدڵ هیـوای تۆیان هەیە خۆشەویستی تۆیان لە دڵدایە.

(٣٠)

خوشـا ئانوتکـە کـە هـەر ئـەز بـەر نەزونەنـد
نـــە حـــەرفێ وا نوپـــسەند نـــە بخونەنـــد
چـــوو مـــەجنون ڕوو نەهنـــد ئـــان بیابـــان
دەر ئـــین کوهـــان روون ئـــاهو چ ڕوونەنـــد

ئـــەز بـــەر= لـــە ســـینە، لـــە بـــەرکردن.نویـــسەند= نوســـین .بخونەند=خۆیندن.ڕوونەهەند=ڕوو دەکەنە.ئاند= ئەو.ڕوون ئاهو=ڕووی ئاسك، ناو چاوان. چ ڕوونەند=چەند جوانە

بابا لیرەدا دەڵیت:-خۆزکە بەو کەسەی هیچیان لە سینەدا نیە وناتوانن لە بەر بکەن وشتیان لە بیر بمینێ، ئەوانـەش کـە نـاتوانن ونـازانن وشـەیەك بنوسن و بخوێنن. وەك دێوانە وشێت ڕوو بدەنە بەر بیابان وچوڵی ودەشت وکێو، وەلە و کێوانە ئاسك کە دەژێت چەند جوان ونایابە.

(*) ئەحمەد تاقانە لەلا ٣١دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی:-

بـــەوان خۆزکـــەم کـــە نـــازانن بخـــوێنن
نـــە پیتێکـــی دەنووســـن نـــە دەخـــوێنن
وەکـــو مـــەجنوون لـــە ســـارا دادەنیـــشن
بـــە کێـــودا ڕێ دەکـــەن ئاســـکان دوێـــنن

(٣١)

مـــو کـــە یـــارم ســـرڕ یـــاری نـــەدارد
مـــو کـــە دەردم ســـەبکباری نـــەدارد
هـــەنو واچـــن کـــە یـــارت خـــواب نـــازە
چـــنو خوابـــە کـــە بێـــداری نـــەدارد

سەبکبار= سەردار. هەنو واچن= هەموو دەڵێن. خـواب=خـوب= باشـە. چنو =چۆن سرڕ= نهێنی

(٣٢)

شـــەوانم خـــواب دەر مـــەرز گـــولاَن کـــرد
گـــولَم واچـــید و خـــوابم رازیـــان کـــرد
باغـــەبان دیـــد کـــە مـــو گـــولَ دۆســـت دیـــرم
هـــەزاران خـــار بـــەر گـــولَ پاســـەبان کـــرد

خـواب= خـەو، نوسـتن. واچـید=توشـی زیـان بـوو. خـار= دڕك، خراپـەکاری. باغـەبان=باغـەوان، ڕەقیـب.پاسـەبان= پاسـەوانی، دەوری داوە. دید=بینی.

(#) ماموستا فۆاد حسین لە کتیبەکەی (ئافرەت لە هونراوەی کوردیدا) لە لا ٥٢ ئەم چوارینەی نوسیوەتەوە بەلاٌم لە نیوە دیڕی سییەمدا ووشەی دیرم نیە وا دیارە لە نوسینی فارسیدا کە چاپ کراوە خراوتە سەری تا زیاتر روخساری چوارینەکە بەلای زمانی فارسیدا بشکیتەوە .پاشان لیکدانەوەی دەکات ودەلێت :-ئەم چوارینەیە باباتاهیر وا دەناسێنی گوایا هونەرمەندانە جیهانی ئافرەت دەرازینیتەوە.

باباتاهیر لیرەدا ئەڤینی مەعشوقەکەی خۆیەتی کە شەیدای بووە لە جیهانی تەسەوفدا بەم شێوەی دەر دەبڕێ، لە سەر زەمانی ململانێی ئاین وئاینداری وسۆفیگەریدا ئەو سەردەمەی خۆی کە گەیشتوەتە لووتکە.

(#)ئەحمەد تاقانە لە لا ٣٢ دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی:-

شەوانم خەو لە خاکی جێی گولاّن بوو
گولّم دەچنین خەوی خۆشم زیان بوو
کە دیتی باخەوان گولّ بۆ تە دۆستم
هەزاران دڕکی بۆ گولّ پاسەوان بوو

(٣٣)

گیّچ و وێچەم کە کافر کیّچ میراد
چنان کێچم کە کافر هەم مەویناد
بەر ئین ئا ئین کەمو ڕا جان و دلّ داد
شەمع وپەروانە ڕا پەرویچ میداد

کێچ ووێچەم= گێژو وێژم. پەرویچ=دەسوورێمەوە

رازی له لا ٢٩ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی :

گێـــژو وێـــژ بـــووم کـــافر بـــه حـــاڵم نـــەبێ
وا گێـــژ بوومـــه کـــافران هەســـت دەکـــەن
بـــەم ئاینـــەی کـــه بـــەمنی داوه دڵ وگیـــان
وەك شـــەمع وپەروانـــه گێـــژم بـــه دەوریـــا

(٣٤)

دڵـــم بـــێ وەصـــڵ تـــه شـــادی مـــه بینـــاد
بـــه غـــەیر ئـــەز موحنـــەت ئـــازادی مـــەبیناد
خـــەراب ئابـــاد دڵ بـــێ مەقـــدەم تـــه
ئیلاهـــــی هـــــەرگز ئابـــــادی مـــــەبیناد

مەبیناد= نابینێ. خەراب= خراب . ئاباد= ئاوەدانی. مەقدەم= بێ دیتەنی وهاتنی نەبوو

به کوردی :-

دڵـــم بـــێ گەیـــشتن بـــه تـــۆ شـــادی نـــابینێ
جیـــا لـــه تـــەم ومـــژ ئـــازادی نـــابینێ
مـــاڵ وێرانـــه دڵ بـــێ دیتـــەنی تـــوو
خودایـــه هـــەرگیز خۆشـــی نـــابینی

(٣٥)

مـــەڕا نـــه ســـەر نەســـامان ئافەریدەنـــد
پەریـــــشانم پەریـــــشان ئافەریدەنـــــد
پەریـــشان خـــاتران ڕەفتەنـــددەر خـــاك
مـــەڕا ئـــەز خـــاك ئیـــشان ئافەریدەنـــد

مەڕا= بۆ من.ڕەفتەند=ڕۆیشتوون. دەر=بۆ .ئەز= لە . ئیشان= ئەوان .
ئافەریدەند= خولقینراوم

(#٩ فەهمی کاکەیی لە گوڤاری ماموستای کورد ژ ١١، ١٢ دا لەلا٩٣ دەڵێت :-بەم شێوەیە باباتاهیر وەکوو مرۆڤێکی خوا ناس، سۆفی و پەریشان دەبێتە مشتێ خاك، تا لەو خاکەی ئەوەوە خەڵکێکی پەریشانی دی بخولقینرین هەر وەکوو ئەم بە خۆی لە بنە ڕەتدا لە خاکی دڵێ پەریشانان خولقینراوە. ئینجا گوریویەتی بۆ سورانی بەم شێوەی خوارەوە:

مــــن بـــــێ ســــــەرو ســـــامان خــــــولقینراوم
پەریــــــشانم پــــــە ریــــــشان خــــــولقینراوم
دڵێ پەریــــــشانان چــــــوونە ژیــــــری خــــــاك
ئــــەمن لــــە خــــاکی ئــــەوان خــــولقینراوم

ئەحمەد تاقانە لە لا٣٣دا کردویە بە سورانی هەر هەمان مانای ئەوانی پیشەوە دەدات وەلە جیاتی خولقینراوم ووشەی ڕۆنراوم ی بە کار هیناوە .

(٣٦)

ئەلالــــــەی کوهــــــساران تــــــەئی یــــــار
بەنەفــــــشەی جوکنــــــارانم تــــــەئی یــــــار
ئەلالــــــەی کوهــــــساران هەفتــــــە بــــــی
ئۆمیــــــد روز گــــــارانم تــــــەئی یــــــار

کوهــساران= کێووشــاخان. بەنەفــشە= بەنەوشــە، ئەرخــەوانی، مــۆر. جۆکنارانم=کناری جۆگا، ڕۆخی ڕوبار .تەئی=تووی
(#)دلزار لە گەنجێنەکیدالەلا٣٢ بەم شێوەیە کردویە بە سۆرانی :

هەڵاڵـــەی کوهـــسارانم ئـــە تـــۆی یـــار
وەنەوشـــەی جویـــە بـــارانم ئـــەتۆی یـــار
هەلالـــــەی کوهـــــساران هەفتەیەکـــــە
ئۆمیـــدی رۆژگـــارانم ئـــە تـــۆی یـــار

(#) وەرگێرانەکەی ئەحمد تاقانە لە ل٣٣٧دا هەر وەك ئەوەی دڵزار وایە

(#)م . فـۆاد حـسین لـە ل١٥٥ ی کتیبەکەیـدا دەڵێـت:-شـاعیر بـەدڵ و بەگیان دولبەرەکەی خۆش دەویٚ، دیارە بەهەمان پێوانە نیشتمانەکەیشی خۆش دەویٚ، بۆیە لە جوانی ئەم نیشتمانەوە کەرەسەی وێنەکیشانی ئەم خۆشەویستی یە بەرزە دەخاتە ڕوو.

خۆشەویستی نیشتمان و یـاری نادیـاری باباتـاهیر لـە بیرو بـاوەری ئاینیـە کەیەوە هەڵقوڵاوە لە ناخی ڕێبازی سوفیگەریدا.

(٣٧)

فەلـــــەك زارو نـــــزارم کـــــەردی ئـــــاخر
جـــــودا ئـــــەز گـــــوڵعزارم کـــــەردی ئـــــاخر
مـــــەیان تەختـــــە نـــــەردم نـــــشاندی
شـــش و پنجـــەمی بـــەکارم کـــەردی ئـــاخر

زارو نـزارم =ئـازارو بێـزار. گـوڵعزار=دڵـدار. تەختـە= گۆچـان. نـەردم= هێزم، توانام. نـشاندی= دات بەزان، کـەم بـووەوە. شش وپـەنج =لەوانەیـە مەبەستی تەمەنی شەست و پینج ساڵی بێت .

واتـــە :-ئـــەی فەلـــەك لـــە ئـــاخر تەمـــەنما ئـــازارو بێـــزار بـــووم ولـــە خۆشەویـستەکەم دوور بومەتـەوە، هێـزم نـەماوە بـە پـشتیوانی گوچـانەوە دەڕۆم، هەر هێشتا لە تەمەنی شەست و پینج ساڵیدام و لە کارت خستم و بێ توانات کردوٚم.

وەبەم شێوەیەی خوارەوە رزای گۆریویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی لە ل ٣٦ دا.

فەلەك گریان و هاوارم هەتاكەی
جیات كردم لە دڵدارم هەتاكەی
هێناتم و تەختی نەردت نیشان دام
شەو پێنج بێ موری زارم هەتاكەی

(٣٨)

مو ئان ڕەندم كە نامم بی قەلەندەر
نە خوان دیرم نە مان دیرم نەلەنگەر
چوو ڕووز ئایە بگەردم گەرد كوێت
چوو شەو ئایە بەخشتان وانەهم سەر

ڕەندو قەلەندەر= پیاوی ڕووت وپەرپووت.چوو ررووز ئایە =كە ڕۆژ داهات.گەرد كوێت= بەدەوری كووچەتا(كۆڵان) وانەهم سەر= سەر دادەنێم(دەنێمەوە) .

(#) فەهمی كاكەیی لە گۆڤاری ماموستای كورد ژ١١، ١٢ دائەم چوارینەیە لێك دەداتەوە و دەڵێت:-بابا تاهیر تەركی دونیا دەكات، بەمەبەستی ئەوەیەتی تاكوو بە خۆشەویستەكەی بگات (كە خوایە)، بۆیەلە رۆژ تا ئیوارەبە كێوەكاندادەگەڕێت تاكو بیدوزێتەوە. واژەی كێو لە ئایینی یارسان پایەو مەقامی بەندەكی دەگریتەوە. واتە بە قۆناغەكانی تەسەوفدا رەت دەبێت كە بە قۆناغی داواكاری دەست پێ دەكات ولە قۆناغی نیستی(فەنا)تەواو دەبێت.

وه چوارینه‌كه‌ی گوریوه بوو سورانی به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه:-

مــن ئــه‌و ره‌نــده‌م كــه نــاوم بــوو قه‌له‌نــده‌ر
نــه خــان دیــرم نــه‌مان دیــرم نــه له‌نگــه‌ر
كـــــه ڕۆژ دادی ده‌گـــــه‌رێم بـــــه‌كێوانتا
كــه شــه‌و دادیێ له‌ســه‌ر خــشتان ده‌نــێم ســه‌ر

(#) دلزار له لا٦١١دا به‌م شێوه‌یه كردویه به سۆرانی:-

مــن ئــه‌و ره‌نــده‌م كــه‌وا ناومــه قه‌له‌نــده‌ر
نــه خــانم هــه‌س نــه مــانم هــه‌س نــه له‌نگــه‌ر
كــه‌ڕۆژ داهــات لــه دونیــادا ئــه‌خۆم خــول
كـه شـه‌و داهـات بـه سـه‌ر خـشتیێ ئه‌كـه‌م سـه‌ر

(#)صدیق بۆره‌كه‌یی له مێژووی وێژه‌ی كوردیدا ب ١ لا٩٠ ده‌قی ئه‌م چوارینه‌یه‌ی به‌م شێوه‌یه نوسیوه‌ته‌وه كه زۆر له لوریكه‌وه نزیكه:-

مــو ئــان پــیروم كــه خانــه نــه‌دوم قه‌له‌نــده‌ر
نــه خــانوم بــی نــه مــانوم بــی نــه له‌نگــه‌ر
ڕۆ هـــــه‌ر ڕۆ مـــــو وه‌ڕا بـــــووم گـــــرد گێتـــــی
ده‌ر ئایــه شــه‌و ئــه‌و ســه‌نگیێ نــه‌هووم ســه‌ر

(#) د. مـارف خه‌زنـه‌دار لـه مێـژووی ئـه‌ده‌بی كوردیـدا ب ١ لا١٩٩٧دا ده‌لێــت:- ئــه‌م دوو به‌یتــه‌ی ده‌سنوســی قۆنیــه(١٤٤٤ز)لــه ده‌سنوســی پـاریس(١٨٤٤ز)یـشدا هه‌یـه، ئه‌گـه‌ر به‌رامبـه‌ری و بـه‌راوردیك لـه نێـوان هه‌ردوو به‌یت دا بكه‌ین بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت تا چ راده‌ییك ده‌سكاری دوو به‌یته‌كانی بابا تاهیر كراوه

(#) شیخ مەحەمەد خاڵ لە لا ١٨٧ دا و ئەحمەد تاقانە لە لا ٣٥ دا گۆڕیویانە بۆ سەر زاری سۆرانی.

(.) بابا تاهیر لەم چوارینەدا شەرحی حاڵی خۆی دەکات وەك دەروێشێکی متەسوف، کە دەستی لە دونیا هەڵگرتوە، وازی لە ئارەزوەکانی دەروون هێناوە بۆ ئەوەی نزیك بێتەوە لە یارە نادیارەکەی کە شەوو ڕۆژ لە سەودای ئەودایە.

(٣٩)

بە دلْ نەقش خەیاڵت دەر شەب تار
خەیالْ خەت وخاڵت دەر شەب تار
موژە کردم بە گەرد دیدە پرْ چین
کە تا وینەم جەماڵت دەر شەب تار

خەیالْ= شێوەت، وێنەت. موژە گردم =برژانگەکانم گرتوە .شەب تار = شەوی تاریك
(#) د. مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا لە لا ٢٠٦دا بەم شێوەی خوارەوەی نوسیوەتەوەو گۆڕیویەتی سەر زاری سۆرانی :

ز دلْ نەقشی جەماڵت دەرنەشی یار
خەیاڵی خەتت وخاڵت دەرنەشی یار
موژە سازوم بە گەردی دیدە پڕچین
کە خوون ڕێژە خەیاڵت دەر نەشی یار

واتاکەی:

نەقشی جوانیت لەدڵم دەر ناچێ ئەی یار
وێنەی خەت وخاڵت لە خەیاڵم دەر ناچێ ئەی یار

بـــــــرژانگم دەکەمـــــــە پـــــــەرژین لــــــە دەوری چـــــــاووم
بۆ ئەوەی وێنەت دەر نەچێ کە فەرمێسکی خوێنین دەڕێژم ئەی یار

هەر وا لە سەری دەدوێ ودەڵێت :لە بەر ئەوەی شاعیرخۆی بێ تواناو گوناهبـار دادەنـێ، لـەوە دەترسـێ لـە پرێکـدا مەعـشووق لـە دڵـی بچێتەدەرەوە یا لە خەیاڵی بسڕیتەوە، بۆیە برژانگی دەکا بە پەرژین بـۆ ئـەوەی وێنـەی مەعـشووق لەگـەڵ فەرمێـسکی خـوێنین کـە ئـەویش لـە ناخی دڵەوە هەڵدەقوڵێ نەچێتە دەرەوە.

خـۆ بـە کـەم زانـین گوناهبـار یەکێکـە لـە سـیفاتی پیـاوانی ڕێبـازی سۆفیگەری، بۆ خـۆ خاوێن کردنـەوە لـە گونـاە ونزیـك بوونـەوە لـە یـەزدان .یان تا گەیشتن بە پلەی یەکبوون .

(٤٠)

موســــڵمانان ســــە دەرد ئـــامو بەیــــەك بــــار
غـــــەریبی و ئەســـــیری وغـــــەمی یــــار
غــــەریبی و ئەســــیری ســــەهل و ئـــا یــــو
غــــەم یــــار موشـــکلەی تـــا چـــوون شـــود کـــار

سە =سێ. ئامو بەیەك بار =زۆر گرانە .سەهل و ئایو =زۆر گرنگ نین، ئاسانن. تا چوون شود کار=تا بلێی گرانە

رازی لە لا ٢٩ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی :

ســــێ دەردی زۆر گــــران لێ بــــوو یــــار
غـــــەریبی و ئەســــیری و خـــــەمی یــــار
غــــەریبی و ئەســــیری زۆر گــــرنگ نــــین
خــــەمی یــــار گرانــــە بــــۆم بکــــەن چــــار

واته :- دەردی دڵی خۆی دەرژێنی وموسلمانان ئاگادار دەکاتەوە کە کەسیێ دەرد سەری لیێ کردوە بەیەکجار وزۆر ستەم وگرانن، یەکەمیان غەریبی ودووری ولاتە، دووەمیان هەژاری وکەم درامەتیە کە ئەسیر و دیلیان کردوە ناتوانێت پەل بهاوێت وسییەمیان غەمی یارە کە هەرچەند هەولێ دەدات وکوشش دەکات نایگاتیێ بۆیە دەلێێ غەریبی وئەسیری ئاسانە پێك دێت بەلاْم دووری مەعشوقەکەی زۆر گرانە کەی بی بیگاتیێ؟

(٤١)

جـــوره بـــازی بـــوودەم رەفتـــەم بەنەخـــچیر
ســـیاه دەســـتیێ زەدە بـــەر بـــالی مـــو تـــیر
بـــۆرە غافـــلێ مەچـــەر دەر چـــەشمە ســـاران
هـــەر ئـــان غافـــلێ چـــەرە غافـــل خـــورە تـــیر

جوره بازی بودەم=جۆرە بازیێ بووم .ڕەفتم= ڕۆیشتم . سیاە دەستیێ =دەست رەشیێ. زەدە = وەشانی، لییێدا
مەچەر= نەڕۆ. چەشمە ساران = ناو شاخان.
دلزار گوریویەتی بە سەر زاری سۆرانی لە لا٨٠ دا بەم شێوەی خوارەوە :-

جـــۆرە بـــازیێ بـــووم چـــووم لـــە بـــۆ نەیـــچیر
دەســـــتێکی رەش دای لـــــە بـــــالم تـــــیر
غافـــلێ تـــۆ مـــەخۆ لـــە چـــەشمە ســـاران
غافـــلێ تـــۆ بخـــۆی، غافـــلێ ئـــەخۆی تـــیر

دەقی ئەم چوارینەیە لە میژووی ئەدەبی کوردی د. مارف خەزنەدار ب١ لا٢١٧ دا بەم جۆرە هاتوە :-

جــۆرە بــازیٚ بــدوم رەفــتم بــە نەخـــچیر
ســیە چـــەشمیٚ بــزەد بــە بــاڵی مـــوو تــیر
بــرەو غافیــل مەچـــەرە دەر کــو هــساروون
هــەر ئــون غافیــل چــەرە غافیـل خــورە تــیر

واتاکەی :-

هەلۆیـــەکی بـــەهێز بـــووم وچـــوومە ڕوشـــکار
چـــاو ڕەشـــێك تیرێکـــــی لـــە بـــاڵم دا
بـــڕۆ ئـــەی گێـــل لـــە نـــاو شـــاخان مەگـــەریٚ
هـەر ئـەو گێلەیـە کـە تـیری غافیـل(بـیٚ نیـشانە) دەخـوا

ئینجا دەڵێت :-دڵداری لە هەموو شتێك وتوانایەك بە هێزترە، هەڵۆ ڕاوکـەری باشـە، بـەلاّم نەیـچیری دوڵبـەرە، خـاوەن تواناکـان هـەمووبیٚ دەسەلاّت دەبن بەرامبەر بە عیشق.

باباتـاهیر دەڵێـت :- هەڵۆیـەك بـووم چـووم بـوو ڕاو، دسـت ڕەشـێك تیریکی لە باڵم دا، وەرە ئەی بیٚ ئاگا بە دوای چاو رەشدا مەگەریٚ، هەر بیٚ ئاگایە دەروا تیر دەخوا.

ئەحمەد تاقانەش لەلا٣٥دا گوریویەتی بۆ سۆرانی.

(٤٢)

دڵ مـــوو بـــیٚ تـــە دایـــم بـــیٚ قـــەرارە
بەچـــــز ئـــــازاد مــــوو کـــــاریٚ نـــــەدارە
دوو دەس بـەر سـەر زەنـە چـوو تفـل بـەد خـوو
زە هیجـــرت ڕوزو شـــەو ئـــاینش مـــەدارە

بەچز=بە هیچ. ئازاد موو =ئازاد ئەبێ .کارێ نەداره = کارت نەبێ .
بەسەر زەنە =دەخاتە سەر سەری ئاینش مەداره =ئاینی مەبە . مەداره=
لای مەبە، هەڵی مەگره

واتە بابا تاهیر لەگەڵ مەعشوقەکەی قسە دەکات ودەڵێت :-هەر چەندە دەکەم ناگەم بە تۆ، بێ تۆش دڵم بێ قەراره، نازانم چۆن رزگار دەبم لەم حاڵەتەی خۆم، لەهیجرەتی تۆ شەوو ڕۆژ وەك منالێ بەد خوو دەستم لە سەر سەرمە و دەناڵێم، ئاینم لەق نەکەی .

(٤٣)

دیـــدەم ئـــا لالـــەی دەر دامـــن خـــار
واتم ئـــا لالیـــا کـــێ چـــینەمت بـــار
بـــە گوفتـــار باغـــەبان مەغـــدوور میـــدار
درەخـــت دوســـتێ دیـــر ئـــاورد بـــار

دەر دامن خار =لە داوێنی دڕکا .چینەمت =چنیویە .بار =بەر، مێوە.دیر = دوور . مەغدوور میدار = مەغدوریەتی هەیە، مەغدووره .

رازی لە لا ٣٦ دا گۆریویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی :

بینـــیم کـــە لالـــە لـــە شـــوێنێ ڕواوه
دڕك لـــــە چــــــوار لا دەروی لێـــــداوه
بڵـــێ باخـــەوان عـــوزری چـــی دێنـــی
نـــەمامت دەرنـــگ بـــەری هێنـــاوه

( ٤٤ )

دەمـــێ بـــۆره بـــوین حـــاڵم تـــە دڵـــدار
تـــەبیبم ئاوریـــد دەر دەم کریـــد چـــار
تـــەبیبم چـــوون بوێنـــە بـــە مـــووی زار
کـــەره دەرمـــوون دەردم ڕا بـــە ناچـــار

کرید = کردی، دەکا. بۆرە = وەرە .ئاورید = هێنات ... بەمووی زار = لە من ئازار. کەرە= بیکە .

واتە دەڵێت :-ئەی دڵدار تۆ وەرە ساتیك حاڵی من ببینە تەبیبی دەردەکەی منی بێکە چارە، ببینە چ ئازاریك لە ناخدایە، چۆن ئازارم دەدات، دە بە ناچاری دەرمانیٚ دەردەکەم بکە.

دڵدارو تەبیبی دەردەکەی بابا تاهیر پەروەردگارە، بەو مناجات و داواکاریە دەیەوی بگاتە دیداری هەق، کە ئەوە هەمو ئاوات و هیوایەکیەتی.

(٤٥)

تـــووئی لێـــو شـــەکەرین ویاســـەمین بـــەر
مـــو ئـــان تـــەن ئـــاذەریـــنم دیـــدەکان تـــەر
ئـــەز ئـــان ترســـەم دەر ئاغوشـــم بیـــائی
کـــز ئـــاذەریـــن ســـیم گـــوذارە زە ئـــاب شـــەکەر

لێو شەکەرین = شەکر لێو . تەن ئاذەرین =گیان ئاگرین . دیدەکان =چاوان. ئاغەشم =هەناسەم. ئاذەرین سیم = شالاْوی ئاگر . کز =کڕ، گڵبە .گژارە =بینی .بەر = ڕوو، دەم وچاو.

واتە :-من ئاگرێك لە هەناومایە و هەمیشە دەگریم و فرمێسك لە چاوان دەرژینم لە بۆ تۆی لێو شەکر وروومەت وەك گوڵی یاسەمین، زۆر بە پەرۆشم بتگەمیٚ، بەلاْم بە پیٚ گەیشتنت لەوە دەترسێم هەناسەیەکی گەرم لە گڕی هەناوی ئاگرینم بێتە دەر، ئەو ڕووە روون ونازدارەی تۆی بەر کەوی وئازاری پیٚ کەویٚ، ئەی خۆشەویستەکەم.

ئەحمەد تاقانە لە ١٣٦٧دا گوریویەتی بۆ سەر سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

ئـــەتۆ ســـینگ یاســـەمین، لێـــو شـــەکرە خـــاوێ
مـــن ئەوتـــەن ئاگرینـــەم چـــاو بـــە ئـــاوێ
لـــەوەی ترســـت هەیـــە بیێتـــە هـــەمێزم
بـــە ئـــاگر زیـــو، بـــەئاو شـــەکرت دەتـــاوێ

رزایش لە لا ٣٩ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی:

(٤٦)

گوڵـــشەن دەر زیـــر ســـونبل ســـایە پـــەروەر
نیهـــال قامـــەتش نـــەخلی ئەســـت نـــەو بـــەر
زە عیـــشق ئـــان گـــوڵ روخـــساری ســـووری
چـــو بولبـــول نالـــەو ئیفغـــان بـــەر ئـــاور

نیهال قامەتش =بەرزی بالأی . نەخلێ =دار خورما . نەو بەر =تازە پێ گەیشتوو .ئان =ئەو .ئیفغان =گریان وشێن .بەر ئاور =دەر دێنی .
دەڵێت :-ئەو گوڵە نازدارەی کە لە سیبەر وسایەی ئەو دارە پەروەردە بوە، دەڵێ دارە خورمای تازە پێ گەیشتوە لە بالأی قامەتی، لە عیشقی ئەو گوڵە ڕوخسار سوورە نالەو گریانمە کەی دەیگەمێ .

(٤٧)

مـــو کـــە دەر بیـــابوونم شـــەوو ڕۆژ
سریـــشك ئـــەز دیـــدە بـــاروونم شـــەوو رۆژ
نەتـــەپ دیـــرم نەجایـــەم میکونـــەددەرد
هـــەمی دوونـــەم کـــە نـــالوونم شـــەوو ڕۆژ

سریشك =فرمێسك .باروونم =دەبارێنم .تەپ =تووبە. جایە =جێگا .میكونەد = دەكات .هەمی دوونەم= هەر ئەزانم .نالْوونم = دەناڵێنم .

دەڵێت :-من كە سەرم هەڵگرتووە لەو بیابانە دەسورێمەوە شەوو ڕۆژ، فەرمێسك لە چاوان دەبارێنم شەوو ڕۆژ نازانم چ دەردێكە تووشم بووە، چ ئاهێكە گیرۆدەی بوومە، نەدێمەوە سەر خۆ وتۆ بە كاربم لەم حاڵەتەو نە ئەو جێگاو بانەش دەردم تیمار دەكات، هەر دەزانم ناڵەو گریانمە سەر گەردانم شەوو ڕۆژ .

ئەحمەد تاقانە لە لا ٣٤٧ دا كردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

منێـــك ســـەر لـــە بیابـــانم شـــەوو ڕۆژ
ئەســـر بارێنـــە چـــاوانم شـــەوو ڕۆژ
نـــە تـــام لیێـــە نـــەدەرویش جـــێم دەهێڵـــیٚ
تـــــەنیٚ د ەزانم بـــــەگریانم شـــــەوو ڕۆژ

(٤٨)

تـــو كـــە زوونـــی بـــەمو چـــارە بیـــاMووز
كـــە ئـــین تـــیر شـــەوان وا كـــە كـــەرەم ڕۆ ز
گـــەهیٚ واژم كـــە كـــەی بـــیٚ ڕۆز وایـــی
گـــەهیٚ واژم كـــە هـــەرگیز وا نـــەبی ڕۆز

تو كە زوونی =تۆ كە دەزانی .بەمو =بەمن.بیاMووز=بكە، پێم دە .واكە=بكەوە، دەر بێنە .كەرەم=لێم دە، بیهاوە. گەهیٚ=دەمێك، جارێك. واژم= دەڵێم، دەبێژم.

بابا دەڵێت :-كە تۆ بە حاڵی من دەزانی ئاورێكم لیٚ بدەوە ئەی یار، ئەو تیرەی هاویشتوتە و لە دڵی داوم، شەوو ڕۆژ پێوە گیرودە بووم، ڕەحمێك بكە شەوان لیی كەوە تەنها بە ڕۆژ بەسە.لە بەر ئێش و ئازاری ئەو

تیرەت هەموو شەو دەڵێم کەی ڕۆژ دەبێتەوە، جاری واش دەڵێم قەت ڕۆژ نەبێتەوە.

(٤٩)

بـــۆرە بولبـــول بنـــاڵیم ئـــەز ســـەر ســـووز
بـــۆرە عیـــشق ســـەحەر ئـــەز بیـــاموز
تـــۆ ئـــەز بەهـــەر گـــوڵ پێـــنج ڕوزە نـــاڵی
مـــو ئـــەز بەهـــەر دلارام شـــەوو ڕۆز

سەر سووز= بە سووز. دلارام =خۆشەویست .بۆرە= وەرە .
رزاریش لە لا ٣٧ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی:.

وەرە بولبـــل دەردی دڵـــت بڵـــێ پـــێم
وەرە ســـــۆزی بـــــەیانت وەرگـــــرە لـــێم
بـــۆ جـــوانی گوڵـــە چـــەند ڕۆژی شـــەناڵی
مـــن بـــۆ جـــوانی دلارام بـــۆ تـــەوە ســـوێم

واتە :-ئەی بولبول ئەی خۆشەویستەکەی من وەرە هەردوك پێکەوە بە سۆز شەو تا سەحەر بنالین، ئەگەر تۆ لە سەر هەر گولێك پێنج ڕۆژ بخوێنی وبناڵی، من بۆ هەر خۆشەویستێك شەوو ڕۆژ دەناڵێم، ئەی هاو دەردەکەم.

(٥٠)

خوداوەنـــــد بــــــە فریـــــاد دڵـــــم رەس
کـــەس بـــێ کـــەس تـــۆئی مومانـــدە بـــێ کـــەس
هەمـــــە گویەنـــــد تـــــاهیر کـــــەس نـــــەدارە
خـــــودا یـــــار منـــــە چ حاجـــــەت کـــــەس

موماندە=من ماوم . ڕەس = بگە . گویەند =دەڵێن . نەدارە =نیەتی.

دڵزار لە لا٨١دا کردویە بە سۆرانی بە شێوەی خوارەوە :-

خوایـــــه بـــــۆ دڵـــــم ببــــه فریـــــاد ڕەس
کەسـی بـێ کـەس تـوی مـن مـاوم بـێ کـەس
هـــەموو هـــەر ئـــەڵێن تـــاهیر بـــێ کەســـە
خـــوا یـــار منـــەو چ پێویـــست بـــە کـــەس

ڕزایش لە لا ١٤ گۆڕیوەیەتی بۆ سەرزاری سۆرانی:.

(٥١)

غـــەم دەرد مـــو ئـــەز عـــەتار میپـــەرس
درازی شــــەو ئـــــەز بێمـــــا میپـــــەرش
خلایـــق جوملـــەکی ئـــەحواڵ پرســـەند
تـــە کـــە جـــان و دڵـــی یـــەکبار میپـــەرس

عەتار =دوکانداری گەڕۆك.بیما = بەئێمە . خەلایق جوملەکی =هەموو کەس.

واتـە :-دەوای دەردی مـن لای عـەتار مەپرسـە دەسـت ناکـەوی، دەرچوونی منیش لە شەوانا لە نەخوش مەپرسە، ئەوی من نەخۆشی نیە؟ هەمو کەس ئەحواڵی من ئەپرسن ودەڵێن تۆکە دڵ وگیانی ولبەری جارێك ئەتپرسی؟؟؟.

(٥٢)

شـــەو تارەســـت و گورگـــان میزەنـــەن مـــێش
دوو زولفونـــت حـــەمایل کـــون بـــۆرە پـــێش
ئـــەز ئـــان گـــەنجی لـــەبت بوســـی بـــە مـــودە
بگـــــو ڕاە خـــــودا دادەم بـــــە دەروێـــــش

میزەنــەن = ئەکــەن . مـێش = کـێش، ئەیکیــشن. حــەمایل =پـەلك. بهوونەوە.... بۆرە پێش= وەرە پێش ..لەبت =لێوت .بوسی =ماچ کەم .بگـو ڕاە خودا =بلێ لە ڕێی خوا .دادەم =داومە .

دلزار لە لا ٥٦دا کردویە بە سۆرانی بە شێوەی خوارەوە :-

شــەوی تاریکــە گورگــان مــەڕ ئەکــەن کــێش
دوو زولفانـــــت حـــــەمایل کـــــەو وەرە پـــێش
لـــە ئـــەم گـــەنجی لـــەبت ماچـــێ بـــەمن دە
بلـــێ گیانـــە لـــە ڕێـــی خـــوا دام بـــە دەروێــش

ئەحمـەد تاقانـە ش کردویـە بـە سـۆرانی لـەلا٣٨دا هـەر وەك ئـەوی دلزارەجگە لەجیاوازی هەندی ووشەوڕستە وەك : مەڕ بوەتە مێ گەل، لە ئەم گەنجی لەبت بوەتە لەسووچی لێوتەوە.

(٥٣)

گـــولێ کـــە خـــودا بـــدادەم پـــێچ و تـــابش
بــــە ئـــــاب دیـــــدەکانم دادەم ئـــــابش
بـــە دەرگـــاە ئیلاهـــی کـــەی ڕەوا بـــوو
گـــولێ ئـــەز مـــو دیگـــەری گـــیرە گـــولابش

تابش= تاوی .ئابش= ئاوی . گیرە گـولابش=گـولاوی بگـرێ .دیگـەر= یەکیکی تر .واتە :-گولێك کە خوا بەمنی داوە، بەخێوو پەروەردەم کـردوە بە فەرمێسکی چاوان ئاوم داوە و پێم گەیاندوە، کـەی لـە لای خـوا ڕەوایـە گولێ گولی من بێت و یەکێکی کە بوونی بکات و گولاوی بگرێ.

دلزار لە لا١٠٠دا کردوویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

گـــولێ خـــۆم بـــدەم کـــە پێـــچو تـــاوی
بـــە ئـــاوی چـــاوی خـــۆم بـــدەم ئـــاوی
لـــە رێگـــەی خـــوا کـــەینێ ڕەوایـــە
یـــەکێکی تـــر بـــی وبگـــرێ گـــولاوی

شیخ مەحەمەد خالێش لە لا٢٤ ی کتیبەکەی کردویە بە سۆرانی وە دەلێت ئەم چوارینەیە لە لایەن مەلا مەحەمەد غەزاییەوە وەریگێراوەتە سەر سۆرانی.هەر وەها ئەحمەد تاقانەش لە لا٣٩ ی کتیبەکەی کردویە بە سۆرانی .

هەروەها رازیش لە لا ٢٢ دا گۆریویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی.

(٥٤)

دلاٚ دەنگـــــم دلاٚ دەنگـــــم دلاٚ دەنـــــگ
زە دەســـتم شیـــشە نـــاموس بـــەر ســـەنگ
هەمـــە واژن بـــەمو بـــێ نـــام و نـــەنگی
کەســـێ عاشـــقە چـــش نـــام چـــش نـــەنگ

هەمە واژن = هەموو دەلێن. چش= ووشەیەکە بە مانای پێویست نیە .پڕ سەنگ =قورس، گران. نەنگ=عەیب وعار.

ئەحمەد تاقانە لە لا٤٠دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

دلـــۆ دەنگـــم، دلـــۆ دەنگـــم، دلـــۆ دەنـــگ
کـــە شووشـــەی ئـــابڕووم کێـــشایە ســـەر ســـەنگ
هـــەموو ئێـــژن بـــە مـــن بـــێ نـــاوو نـــەنگی
کەســـی ڤینـــدار دەبـــێ چـــش نـــاوو چـــش نـــەنگ

(٥٥)

دڵــــیٚ دیـــرم دڵـــەن دێوانـــە دەنـــگ
نەزوونــەم مـــو کـــە دیـــرم نـــام یـــا نـــەنگ
ئــــەز ئـــین دیوانـــەگی روزی بـــەر ئـــایم
کـــە دەر دامـــان دولبـــەر بـــەر زەنم جـــەنگ

بـەر ئـایم=بێمـە دەرەوە.بـەر زەنم=بکـەم، بنێمـەوە . ئـەز ئـین دێوانەکی=لەم دێوانەییە.

ئەحمەد تاقانە کردویە بە سۆرانی لە لا٤٠دا بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵـــێکم هـــەس دڵـــیٚ دێوانـــەوو دەنـــگ
نـــزانم مـــن کـــە نـــاوم چـــاکە یـــا نـــەنگ
لـــە ئـــــەم دێوانەییمـــــە ڕۆژیٚ دەردێـــــم
بـــەداوێنی ســـپیی دولبـــەر دەدەم چـــەنگ

رازیش لە لا ٣٧ دا گۆریوەیەتی بۆ سەرزاری سۆرانی.

(٥٦)

خۆشـە ئانـان ڕووزی کـە قـەبرم مـیگیرە تـەنگ
بـــە بـــالێن ســـەرم خـــشت و گـــلٚ و ســـەنگ
دوو پـــا دەر قیبلـــــە وجـــــان دەر بیابـــــان
تـــەنم بـــا مـــار و مـــۆران میکـــرە جـــەنگ

ئـان رووزی= ئـەو ڕۆژەی .بـەبالێن= سـەر تـا پـا. دوو پـا دەر قیبلـە= مەبەست لە رووح بەرەو قیبلە.جان دەر بیابان= لاشـەش لە ناو قەبرا لە بیبانو چولێدا.

رازی له لا ٧١ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی بەم شێوەیە:.

ئـای بـۆ ئـەو کاتـەی ئەچـمە گـۆڕی تـەنگ
دەم لـە خـاك چـەقیو بـۆ کۆڵـەوە سـەنگ
روم لـــە قیبلـــە یـــە گیـــان لـــە بیابـــان
لاشـــەم مـــار و مـــور لێـــی ئەکـــەن چـــنگ

واته:–خۆشه ئەو ڕۆژەی کە دەمریت و لە قەبری تەنگدا بە دریژی باڵاو سەرمدا خشت وگڵ وبەرد هەیە، رووح بە هەردوو پیّ ڕیّ دەگریّ بەرەو قیبلە و گیانیش لەو گۆڕە وچوڵەیە وگیان لەگەڵ مارو مۆریدا لە ناو قەبر لە ژیرْ خاکدا دەجەنگیّ و دەبێتە خۆراکیان.

(٥٧)

وای ئـــان ڕووزی کـــە گـــۆڕم کـــەرن تـــەنگ
وەریـــژن بـــەر ســـەرم خـــاك و خـــس و ســـەنگ
نـــە پـــای ئـــان ئـــەز مـــاران گـــە ریـــزم
نەدەســـت ئـــان کـــە بـــا مـــوران کونـــەم جـــەنگ

وای ئان ڕۆزی =وای بۆ ئەو ڕۆژەی. دەر گۆڕم کەرن تەنگ= بمکەنە گۆڕی تەنگەوە.وەریژن=برژێننە.مارانگریزم=مارو مۆری دەیکەنە خۆراك..

واته:– بابا مردن وقەبر بەبیر دینیتەوە، کە مرۆڤ لەم دونیایەدا هەرچی دەکات، دونیایەکی پر خۆشیو سەیران، بەلاّم دەبیت ئەو ڕۆژەت لە بیر نەچێت کە دونیا بە جیّ دەهیلّی ودەچیتە ئەو قەبرە تەنگە وخاك وخۆڵ بەسەرتا دەکەن و دەتشارنەوە، ئەو لاشەیەت مارو مۆری سەری تیّ دەکەن و دەرزێتەوە.

ئەحمەد تاقانە لە لا١٤١دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

وەی لــەو ڕۆژەی لــە گــۆڕێکم دەنــێن تــەنگ
دەڕێژنــە ســەر ســەرم خــاك وگــڵ وســەنگ
نــە پــێم ئەویانــە، پێــی هــەڵبێم لــە مــاران
نەدەســن ئەویانــە وەل مــوور پێــی بکــەم جــەنگ

ڕزایش لە لا ٧١ دا گۆڕیویەتی بۆ سەرزاری سۆرانی.

(٥٨)

دلاّ پووشـــــم زە دەســـــتت جـــام نیــــل
نــەهم داغ غــەمت چــوون لالــە بــەر دیــل
دەم ئــەز مــوهرت زەنم هەمــە چــوون دەم ســوبح
ئــــەز ئـــین دەم تـــا دەم صــــوور ئەســــرافیل

جامــە=کــراس .نیــل=بــە ئــاوات گەیــشتن، مــۆر. نــەهم= دەنــێم .داغ=داخ..بەردیل=لەدیلی.موهر=ناونیشان. دەم=پەنجە، کلك. زەن= لێدان، کوتان.

ئــەم چــوارینەیە لــە میــژووی ئــەدەبی کــورد(د. مــارف خەزنــەدار ب١ لا٢١٨دا بەم شێوەیە هاتوە :-

دلاّپۆشـــــم ز هیجـــــرت جــــامیی نیــــل
کــە شــم بــاری غــەمت چــوون جامــە بــەر زیــل
دەم ئەز میهرت زەنەم هەم چــوون دەمــی سوبح
ئــەزیــن دەم تــا دەمــێ ســووری ســرافیل

واتەکەی :

ئەی دلْ لە دووریت بەرگی نیلی دەپۆشـــــم
بـاری غـەمت وەکـو دامـەنی کراسـم بـە دوواما دەکێشم
هەناسـە بـە دلْداری تـۆوە دەکێشم وەکـو چـۆن بـەیان هەناسـە دەکێشی
لــە ئیــستاوە تــا ســەردەمی ســووری ئیــسرافیل

(+) کراسـی نیلـی یـان شـین، پێشان ئـەوەی کەسێکی خۆشەویـستی بمردایە ئەو جۆرە کراسەی دەپۆشی، نیشاتەی غەم باری بوو.

(٥٩)

خوداوەنـــد مـــو بێـــزارم ئـــەز ئـــین دلْ
شـــەووڕۆزان دەر ئـــازارم ئـــەز ئـــین دلْ
ز بـــەس نالیـــدم ئـــەز نالێـــدەنم تـــەتگ
ز مـــو بـــستان کـــە بێـــزارم ئـــەز ئـــین دلْ

مـو=مـن. ئـەز ئین دلْ =لـە دەست ئـەم دلْە.ز بـەس نالیـدم= هـەر بـەس دەنالێینم. ز مو بستان= لێمی وەرگرە.

واتە: باباتاهیر ڕوو دەکاتە پەروەردگارو دەلێت :- زۆر بێزارە لـە دەست ئەو دلْەی، شەوو ڕۆژ لە ئازاردایە، هـەر دەنـالێی و دونیـای لیْ تـەتگ بـووەو دەپاڕێتەوە لە خودا ئەو دلْەی لیْ وەرگرێت،

ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنیْ کـە هیـواو ئاواتـەکانی دلْ نەگەیـشتوونەتە ئـەنجام بۆیـە وا شـەوو ڕۆژ دەنـالێنی وبێـزار بـووە. هیـواو ئـاواتی سـۆفیان وڕێبـازی سـۆفیگەری نزیـك بونـەوە لـە پـەروەردگار بـە مـەحرووم کردنـی دەروون وخاوێن کردنەوەی وژدان لە ناخی زکرو عبادەتدا.

ئەحمەد تاقانە لەلا٣٨دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

خوداوەنـــــد، کــــە بێـــزارم لـــــە دەس دڵ
شـــــەوو ڕۆژان لــــە ئـــازارم لــــە دەس دڵ
ئەوەنـــد گریـــام لــە نالــەم تەنگــە دڵ، تــەنگ
بـــسێنەی لـــێم کـــە بێـــزارم لـــەدەس دڵ

(٦٠)

مەگـــەر شـــێرو پلنگـــی ئـــەی دڵ ئـــەی دڵ
بـــەمو دایـــم بەجـــەنگی ئـــەی دڵ ئـــەی دڵ
ئەگـــەر دەســـتم ڕەســـد خوونـــت بڕێـــزەم
بوێنـــەم تـــا چ ڕەنگـــی ئـــەوی دڵ ئـــەی دڵ

بەمو دایم بە جەنگی= لەگەڵ مندا دایم دەجەنگی. خوونت بڕێزەم =خێونت بڕێژم. ڕەسد= بگات .

دڵزار لە لا٢٧دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

مەگـــەر شـــێرو پلنگـــی ئـــەی دڵ ئـــەی دڵ
لەگـەڵ منـدا لـە جـەنگی ئـەی دڵ ئـەی دڵ
ئەگـــەر دەســـتم بگـــا خوێنـــت ئەڕێـــژم
ببیـــنم تـــا چ ڕەنگـــی ئـــەی دڵ ئـــەی دڵ

هەر وا د. مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ب١ لا٢١٥دا دوو نیوە دێڕی دوایی بەم شێوەیە هاتوە:-

ئەگـــەر دســـتن فـــەتی خوونـــت وەریـــژم
وەوینـــەم تـــا چ ڕەنگـــی ئـــەی دڵ ئـــەی دڵ

هەر وا ئەحمەد تاقانە لەلا ١٤١دا بە هەمان شێوە کردویە بە سۆرانی .

(+) ئەمەش جارێکی دی دادو بێدادی بابا تاهیرە لە دەست ئەو دڵەی کە شەیدای ئەو ڕێبازەیە هەمو دەم لەگەڵ دەروون و مێشکیدا وەك شێرو پڵنگ لە جەنگدایەزۆر ئازار لە دەستی دەچەشێت، نازانێ کەی دەگات بە ئاوات؟ بۆیە دەڵێت ئەگەر دەستم بگاتێ خوێنی بڕێژم تا بزانم چ ڕەنگە و بۆ وام لێ دەکات.؟

ئینجا د. مارف دەڵێت :-کە دڵ وەکو شێرو پڵنگ وا بێ دیارە ڕەق ووشك وبێ بەزەيي دەبێ، لە بەر ئەوە هیواو ئامانجی شاعیر لەوەدایە کە لێ ی دوور بکەویتەوە، زۆر دوور بکەویتەوە بگاتە کاکیشانی فەلەك.

(٦١)

لالــــە چــــین کـــە بوتـــان لالـــە چـــین دڵ
هـــەر چەشـــان واتـــە بـــەس لالـــە چـــین دڵ
کـــەڕو کـــۆرم هەمـــە بـــێ دانـــشم مـــو
تـــە کـــە زەنـــو بیـــا ولالـــە چـــین دڵ

هەر چەشان واتە=هەر چیان وتووە. بێ دانش= بەو کەسە دەوترێت کە بیر ناکاتەوە.زەنوبیا =پێ دەچێت مەبەستی زەنوبیای مەلیکی تەدمور بێت.لالە چین= گوڵاڵە سوورە چین= چین چین، لووچ. بۆتان= بوەتە.

(٦٢)

بـــشم واشـــم کـــە تـــا یـــاری کـــەرە دڵ
بـــە بـــەختم گریـــەو زاری کـــەرە دڵ
بگـــەردی ونـــەجوئی یـــاری چـــوون مـــن
کـــە ئـــەز جـــان دڵـــت یـــاری کـــەرە دڵ

بشم واشم=دانیشین و بلێین. نەجووئی= نەکەی وێنەی من.کەرە=بکە .گریە= گریان.بگەردی=سەیران بکە.

(٦٣)

دلاْ غافـــلْ زە ســــوبحانی چـــە حاســـلْ
موتیـــع نــــەفس شـــەیتانی چـــە حاســـلْ
بـــوود قـــەدر تـــوو ئـــەفزوون ئـــەز مـــەلایك
تـــوو قـــەدر خـــود نمیـــدانی چـــە حاسـلْ

ئەفزوون= ئاست، نرخ. نمیدانی= نازانی متیع= مل کەچ.

واتە:-باباتاهیر گفتو گۆ لەگەل دڵی خۆی دەکات و دەلێت:-ئەی دلْ گەر تۆ غافلْ بیت لە تاعەتی خودا و پەروردگار چی حاسلْ دەکەی، تۆ ئەگەر قەدری خۆت بزانی لە ئاستی مەلائیکەتی وغەیرە ئەوە هیچت دەست ناکەوی و ئاواتەکانت نایەتە دی.

(٦٤)

زە بـــۆی زولْـــف تـــوو مـــەفتونم ئـــەی دلْ
زە ڕەنـــگ ورووی تـــوو دلْ خـــوونم ئـــەی دلْ
مــــن عاشـــق زە عـــــشقت بـــیْ قـــــەرارم
تـــو چـــوون لـــەیلی ومـــن مـــەجنونم ئـــەی دلْ

زە=لە. چوون= وەك، لە شێوەی. دڵزار لە ١٩٧٧ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

لـــە بـــۆی زولْفـــی تـــۆ مـــەفتوونم ئـــەی گـــولْ
لـــە ڕەنگـــی رووی تـــۆ دلْخـــوونم ئـــەی گـــولْ
مـــن عـــا شـــق لـــە عیـــشقت بـــی قـــەرارم
ئـــەتۆ وەك لـــەیل ومـــن مـــەجنونم ئـــەی گـــول

ئەحمەد تاقانە لە لا٤٣دا کردویە بە سۆرانی بە هەمان شێوە بەڵام لە جیاتی مەفتوونم، دڵچوونم، وەلەجیاتی عیشق دڵدارو ئەڤین، وەلەجیاتی بێ قەرار بێ سروەت ی بەکار هێناوە.

م. فوئاد حسین لە لا٤٥ دا دەڵێت :-(حەز کردن لە ئافرەت و ئەڤینداری و تەسەوف لە لای باباتاهیروەك شا عریکی کورد وەها بە یەکدا چوونە توێژەر ناتوانێت سنووری جیاکەرەوەیان دەست نیشان بکات.

هەر چەندە لە ڕوخساردا شیعرەکانی بابا بۆنی دڵداری لێی دێت بە لاَم لە ناخدا دڵداریەکی سۆفەیگەرانەیە بۆ مەعشووقەکەی دەدوێت کە پیروانی ڕێبازەکەیەتی وە بەو شێوەیە دەری دەبرێت.

(٦٥)

منم ئان ئاجەرین مورغی کەفی الحاڵ
بسووچەم عالەمێ گەر بەرزەنم باڵ
مصوور گەر گشید نەقشم بەر دیوار
بسوچەم عالەم ئەز تاءسیر تمسال

ئاجەرین=ئاگرین. مورغ = باڵدار، مەل .بسووچەم = بسووزێم .بەر زەنەم =پێکدادەم .کشید = بکێشی . نەقشم =وێنەم .تمسال = پەیکەر .

دلّزار لە لا٢٦ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

منم ئەو ئاگرین تەیرەی کە دەر حاڵ
ئەسووتێنم زەمین لێك بدەم پەڕو باڵ
مصوور گەر بکا نەقشم لە دیوار
ئەسووتێ خەڵك لە بەر تاسیر تمسال

لە مێژووی ئەدەبی کوردی د. مارف خەزنەدارلە لا٢٠٥ دادەقی لوڕی چوارینەکە بەم شێوەی خوارەوە هاتوە :-

مووەم ئان ئازەرین مورغی کە دەر حال
بسووجم عالەم ئەز بەرهەم زەنەم بال
موسەووبر گەر کەشە نەقشم بە دیوار
بسووجم خوونە ئەز تە ئسیری تیمسال

واتە بە کوردی :

منم ئەو باڵندە ئاگرینەی کە دەست بە جێ
هەموو عالەم دەسووتێنم ئەگەر باڵم بشەکێنمەوە
وێنەگر ئەگەر وێنەم بکێشی لە سەر دیوار
خانوو دەسووتێ لە تا ئسیری وێنەکە

ئینجا دەڵێت :- ( شاعیر زۆر راستە لە بیرو باوەڕی، عاشقیکە گەیشتۆتە پلەی سووتان، واتە تووانەوەو لە ناوچوون لەناو مەعشووقدا، لە ئەوەیە ئاگری ئەوەندە بە تینە هەموو گێتی دەسووتێنێ، نەك تەنیا وەکو لەش بەڵکو ئەگەر وێنەشی لەسەر دیوار بکیشرێ وێنە دەبێ بە ئاگر و گڵپە و خانەکە دەسووتێ. )

علاء الدین سجادی لە دەقەکانی ئەدەبی کوردیدالە لا٥٠دا دەڵێت :- (لیرەدا بە ئاشکرا ئە بینین کە باباتایەر چووەتە کۆڕی فەلسەفەچیاتیەوە"تسووف"ەوە وەلەناوئەو کۆڕەداخۆی ون کردووە، لەوێشەوە سەرکەوتووەو چووەتە ئەو عالەمەوە کە عالەمی تسوفی بە "وحدەتی وجود" ناو ئەبا .)

شیخ مەحەمەد خاڵ لەلا١٨ دا دەڵیت:- (باباهێندەی جار مەستی بادەی خوایی ولە دەریای گەورەیی ئەودا نوقوم بوە و ئاگای لە خۆی

نــەماوە ولــە وكاتانــەدا قــسەی زلی بزركانــدوە وەك "هــەللاج"و "سەهرەوەردی"و ابن العربی".)

ئەحمە د تاقانە لە لا٤٢ دا گوریویەتی سەر زاری سۆرانی .

(٦٦)

خودایــا داد ئــەز ئــین دڵ داد ئــەز ئــین دڵ
کــە یــەك دەم مــو نەگەشــتم شــاد ئــەز ئــین دڵ
چــــو فــەردا داد خواهـــون داد خـــوا هەنــد
بگۆیــــەم صــــەد هـــەزاران داد ئــــەز ئــین دڵ

ئین = ئەم . نەگەشتم = گەشتم نەکردوە . فەردا = سبەی . خواهـون =داواکاران .داد خواهوند = دادیان دەوێ . بگوویەم = بلێم .
دلزار لە لا ٢٨دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-
خودایــــە داد لــە دەس دڵ، داد لـــە دەس دڵ
کــەوا یــەك دەم نــەبووم مــن شــاد لــە دەس دڵ
بـــــەیانی داد خـــــــوازان داد ئــــــەخوازن
دەبێـــژم ســــەد هـــەزاران داد لـــە دەس دڵ

ئەحمـەد تاقانـەش لـە لا٤٢ دا کردویـە بـە سـۆرانی وەلـە نیـوە دێـری سێیەمدا لە جیاتی داد خوازان داد بپرسن ی داناوە .

(٦٧)

ئیلاهـــــــــــی وا کیاشـــــــــم وا کیاشـــــــم
مـــو کـــە بـــێ دەســـت و پـــایم وا کیاشـــم
هەمـــە ئـــەز دەر بڕوونەنـــدو ئـــەتو ئایـــەم
تـــوو گـــەر ئـــەز دەر بڕوونـــی واکیاشـــم

واكياشم =لەگەل چ کەسانێك بچم .بڕوونەند = بڕۆن، دەرم کەن . ئەتۆ ئایەم = بۆ لای تۆ دیم. ئەز دەر = لە دەرگا . بێ دەست و پایم = بێ دەست و پێم، بێ دەسەلأتم.

صدیق بۆرەکەی لە کتێبی مێژووی وێژەی کوردیدا بەم شێوەی نوسیویەتی ولێکی داوەتەوە:-

خودایــا وا کیــان شــوم وا کیــان شــوم
مــو کــە بــێ دەســت و پــا بــوم وا کیــان شــوم
هەمــە ئــەز دەر برانــون وەر تــو ئــایوم
تــو گــەر ئــەز دەر برونــی وا کیــان شــوم

واتە :-خوایە لەگەل چ کەسانێکا بچم، من کە بەم نەتوانیە و بێ دەسەلأتیە لەگەل چ کەسانێکا بچم، ئەگەر هەموو لە دەر گا دەرم کەن دێمە لای تۆ ئەگەر تۆ لە دەرگا کەت دەرم کەی و نا ئومێدم بکەی لەگەل چ کەسانێکا بچم ؟.

لە مێژووی ئەدەبی کوردیدای د. مارف خەزنەدار ب١ ل٢٠٧ دا بەم شێوەی خوارەوە هاتووە :-

خەداوەنــد کــە بووشــم باکــە بووشــم
مــوژە بــەر ئەشــکی خــوونین تاکــە بووشــم
هەمــە کــەز دەر برانــوون ســووتە ئــا یــۆم
تــو کــە ئــەز دەر بــەرانی واکــە بووشــم

واتاکەی :-

ئــەی خــودا مــن کــێم ؟ لەگــەل کــێم ؟
تاکــەی مــوژەم پــڕ ئەشــکی خــوێنین بــێ
کــە مــن دەردەکــەن، ڕوو لــە تــۆ دەکــەم

ئەگـەر تـۆ دەرم بكـەی ڕوو لـە كـێ دەكـەم ؟

(٦٨)

بـە ئـین بـێ ئاشـنائی بـەر كیاشم
بـە ئـین بـێ خانمـائی بـەر كیاشم
هەمـە گـەر مـو بڕونـەن واتـە ئایـەم
ئەگـەر ئـەز دەر بڕونـی واكیاشم

بەر كیاشم = لەگەڵ تووم .بروونەن =دەرم بكەن . واتە ئایەم = بۆ لای تۆ دێم

رازی لە لا ٤١ دا بەم شێوەیە گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی بەم شێوەیەی خوارەوە:.

ئەگـەر بڵـێم ئەگـەر نـەلێم خوایـە
خـۆت ئـەزانی كـە پێویـستم وایـە
گـەر بەنوێـژە بـۆ چـی بەشـم بـڕاوە
گـەر بـێ بەشـم رویكـەم بۆچـی لایـە

واتە :- من كە كەسم نیە تەنها تۆ نەبێ و لە گەل تۆم، ئەگەر هەموو دەرم بكەن دێم بۆ لای تۆ، ئەگەر تۆش دەرم بكەی لە گەل كێ بم، ڕوو لە كێ بكەم ؟.

(٦٩)

ئیلاهـی گـەر بواچـەم وەر نەواچـەم
تـە دونـی حاجـەتم ڕا مـە چەواچـەم
ئەگـەر بنـوازیم حاجـەت رەوا كـون
ئەگـەر مـەحرووم سـا زی موچەواچـم

بواچەم، نەواچەم =بلێم، نەلێم .بنوازیم =ناز بگرم، داوا کاریم هەبێ .
مو چە ساچەم = من چێ بکەم .
واتە :-خودایە گەر من هەرچی بلێم و نە لێم، تۆ خۆت ئاگاداری لە داوای دڵ چی دەوێ وئاواتی چییە، ئەگەر هات ونیازێکم هەبوویان داواکاریەکم داواکرد بێ بەشم نەکەی وجاری بکە، وەئەگەر مەحرومیشم کەی دەسەڵاتم نیە

(٧٠)

ئەگــــەر ئــــائی بـــە جانــــت را نـــوازم
وەگــــەر نــــائی زە هیجرانــــت گـــودازم
یــــا دەردی کــــە داری بــــەر دڵــــم نــــە
بمــــیرم یــــا بــــسوزەم یــــا بــــسازەم

ئەگەر ئائی =ئەگەر دێی .نوازم = ناڵە، نالێن .گودازم =بێ قەرارم.داری = هەتە .بمیرم = بمرم، مردن .بسوزەم =بسوتێم . بسازم = بسازێنم، دروست بکەم .
لە مێژووی ئەدەبی کوردی د.مارف خەزنەدار ل٢٢٩دا بەم شێوەی خوارەوە هاتوە :-

ئەگــــەر ئــــائی بــــە جانــــت وا نــــواژوم
وەگــــەر نــــایی زە هیجرانــــت گــــوداژوم
هــــەر ئــــون دەردی کــــەداری بــــەر دڵــــم نــــە
بمــــیرم یــــا بــــسووجم یــــا بــــساژوم

واتەکەی:

ئەگەر بێیە لام بەگیان دڵ پێشوازیت دەکەم
ئەگەر نەیێیە لام لە دووریت دەتویمەوە
هەمو دەرد و ئازاری کە هەتە بخەرە ناو دڵم
بمرم بسووتێم بەرگەی دەگرم

باباتاهیر ئامادەیە لە پیناو ئەو عیشقە ئاینیەی دڵی لیّ سەندوە، هەمو ئیّش و ئازاریّ بچیّژیّ، تا بگاتە دیداری مەعشووقەکەی ویەکبون و توانەوە لەناو یەکتردا بگاتە ئەنجام . بۆیە دەڵیّت وەرە ئەی یار (کە پیروانی ریگای ڕیبازەکەیتی) هەر دەردیّك لە دڵتایە بیّخەرە ناو دڵی من(مەبەستی سۆزو وعیشقی بیرو باوەری ڕیبازەکەیە)، بمرین لە پیّنا ویدا یان گروهیّکی یارسانی بسازنین .

(٧١)

دوو زولفونـــــت بـــــود تـــــار رەبـــــابم
چ میخـــواهی ئـــەز ئـــین حـــالْ خـــەرابم
تـــــە کـــــە مـــــو ســـــرِ یـــــاری نـــــەداری
چـــرا هـــەر نیّمـــە شـــەو ئـــائی بـــە خـــوابم

تار =نەی .رەباب = ئامیّری موسیقایە .چ میخوای =چیت دەویّ .با مو سرِ یاری نەداری = کە لە گەل من ئەسرارو نهینیت نیە . چرا =بۆ . ئائی بە خوابم = دیّیتە خاوم .

واتە :- پەیوەندی نیّوان یارەکەی و ئامیّرە موسیقا ئاینیەکەی دەر دەبریّت کە لە بیرو باوەری یارساندا تەریبن، وەرە ئەی یار ئەم حا لْ وپەشیّویەی من بەس نیّیە، کە تۆ هیچ نهیّنیەکت لەگەلْ مندا نییّە لە یاریدا، ئەی بۆ چی هەموو شەویّ دیّیتە خاوم ؟ .

(٧٢)

بـــە ڕووی دولبـــەر گـــەر مـــا یلـــستم
مـــەکون مـــەنعم گرفتـــار دلەســـتم
خـــودا ڕا ســـار بـــان ئاهیـــستە مـــیران
کـــە مـــو ڕا مانـــدە ئـــین قافلەســـتم

مایلستم = مەیلم هەیە .مەکون مەنعم = لۆمەم مەکەن .ئاهیستە میران =لە سەر خۆ دەروون .سار بان =ووشتران .ماندە = ماوەتەوە.قافلەستم =لەگەل کاروانم .

واتە :-باباتاهیر باس لە گرفتاری خۆی دەکات لە ئەویندارییدا و دەڵێت لۆمەم مەکەن، ئەمن زۆر بە ئارامم لە شێوەی ووشتر لە بیاباندا چۆن لە سەر خۆ دەروات، من هاوڕێی ئەو جۆرە کاروانانەم، هەر دەبێ بگەم بە یار مادام دڵم هەر دەم مەیلی ئەوی هەیە .

(٧٣)

موو ئەز قالو بەلا تەشویش دیرم
گنە ئەز بەرف و باران بیش دیرم
ئەگەر( لاتقتنو) دەسم نەگیرە
موو ئەز (یاوەیلەنا) ئەندیش دیرم

قالو بەلا = لە دێر زەمانەوە .بەرف = بەفر. لاتەقتنو = ووشەیەکی عارەبیە مەبەستی پەروەردگارە .... یاوەیلەنا =ووشەیەکی عارەبیە واتە ئەی هاوار .ئەندێش =تاوان . تەشویش = ترس .

واتە:- من لەدێر زەمانەوە بیروباوەڕم کەوتوتە ناو ئەم گێژاوەی ئایندارییەوە(کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناخی ئاینەکەی). کە ئەو بوەتە پیشەی و ڕاهاتووە لەبارینی بەفر و باران بەسەریا (مەبەستی غەم و هەژارییە وە دەربەدەرییە). وە دەڵێت:-" ئەگەر پەروەردگار یارمەتی دەرم نەبێت من چیم پێ دەکرێت و غەرقی گوناه دەبم و تاوان سەرتاپام دەگرێتەوە لەم ڕێگایەدا.

لەمێژووی ئەدەبی کوردی د.مارف خەزنەدار لەلا٢٠٥ب١ بەم شێوەیەهاتووە:-

مــــوو ئـــەز قـــالوو بـــەلا تەشـــويش دێـــروم
گونـــاه ئـــەز بـــەرگی داروون بـــیش دێـــروم
چـــوو فـــەردا نوومـــە خوونـــون نوومـــە خـــوونن
مـــوو دەرکـــەف نوومـــە ســـەردە پـــیش دێـــروم

واتاکەی:-

مـــن لـــەقالوو بـــەلاوە ترســـم هەیـــە
لەگـــەڵای دار و درەخـــت زیـــاتر گونـــاهم هەیـــە
لەو ڕۆژەی کە هەر کەس کتێبی خۆی دەخوێنێتەوە
کتێبـــی دەســـتم شـــان و پـــێلم دەچـــەمێنیتەوە

رزایش لە لا ٤٢ دا گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی.

(٧٤)

زەردەســـــت چـــــەرخ واروون داد دیـــــرم
هـــــەزاران ناڵـــــە و فریـــــاد دیـــــرم
نشـــــسته دڵـــــستانم باخـــــەس و خـــــار
چـــکونه خـــاطـــــر خـــود شـــاد دیـــرم

چەرخ واروون=جەوری زەمانە. نشستە دڵستانم=دونیای دڵم کەتوەتە. خار=دڕك. خەس وخار=خەرمانی دڕك، پاشماوە. جکونە=لەکوێ، چی دەکا.

رزای لە لا ٤٢ دا گۆڕیویەتی بۆسەر زاری سۆرانی بەم شێوەیە:.

لـــە جـــەوری زەمـــان مـــن دادم هەیـــە
هـــــەزاران ناڵـــــە و فریـــــادم هەیـــــە
دڵ کەوتۆتـــــە ســـــەر خـــــەرمانی دڕك
لـــە کـــۆی هەناســـەی ئـــازادم هەیـــە

باباتاهیر لیرەدا هاوارو دادی دڵی خۆی دەر دەبڕێ لە دەست زەمانە ناڵەو گریان و فریاد دەکات، کە چۆن دەورانی فەلەك گۆڕاوە و ئەو عیشقی دڵی و ئارەزوەکانی وای لێ کردوون کە بکەوێتە ناو دڕك ودالاٌ و ئازار بچەشێ لەم دونیایەدا ئیتر چوون ئەو خۆشی وئارامی دەبێت .

(٧٥)

مـــو ئـــان ئـــازەردە بـــێ خانمـــانم
مـــو ئـــان موحنـــەت نەسـیب سـەخت جـــانم
مـــو ئـــان سـەر کـــشته خـــارم دەر بیـــابوون
کـــە هـــەر بـــادی وەزەد چیـــشش دوانم

ئازەردە = دەربەدەری .بێ خانمانم = بێ خێزانم، بێ جێگاو بانم .سەر کشته خارم = تۆپەڵە دڕکێ. بادی وەزەد = بایی هەڵکات . پیشش دوانم = پێشی دەکەوم .

ئەحمەد تاقانە لە لا٤٤دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

مـــن ئـــەو ئـــێش دیتـــووەم، بـــێ خانومـــانم
مـــن ئـــەو بـــەش دەردەمـــە، وا ســـەختە گیـــانم
منـــــی بـــــا بردەڵـــــە دڕکـــــی بیابـــــان
کـــە بایـــەك دێ، لـــە پێـــشیا مـــن دەوانم

رزایش لە لا ٤٢ کردویە بە سۆانی.

(٧٦)

بـــۆرە ســـووتە دلاْن تـــا مـــا بنـــاڵێم
زە دەســـت یـــار بـــێ پـــەروا بنـــاڵێم
بـــشیم بـــا بـــولبلی شـــەیدا بـــە گوڵـــشەن
ئەگـــەر بـــەلبل نـــە ناڵـــە مـــا بنـــاڵێم

بۆره = وەره .سووتە دلآن = دڵ سوتاوان . تا ما = با ئێمە .بشیم =دانیشین، وەك .

دڵزار لە گەنجێنەکەیدا لە لا ۲۹ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

وەرن ئەی دڵ سوتاوان تا بناڵێن
لە دەس یاری بە بێ پەروا بناڵێن

لە بۆ لای بولبلی شەیدا لە گەڵشەن
بچین بولبل نە ناڵێ تا بناڵێن

لە مێژووی ئەدەبی کوردی د. مارف خەزنەدار لە لا۲۱۲دا دەقی ئەم چوارینەی بەم شێوەی خوارەوە نووسیوە :-

بووره سووتە دلوون هوون تا بنالیم
ز هیجری ئان گولی رەعنا بنالیم
بشیم با بلبلی شەیدا بەگولشەن
ئەگەر بلبل نەناڵە ما بنالیم

واتاکەی :

وەرن ئەی دڵ سووتاوان هەمومان بناڵێن
لە دووری ئەو گوڵی رەعنایە بناڵین
لەگەل بلبلی شەیدا دابنیشین لە گوڵشەندا
ئەگەر بلبل نەناڵێ با ئێمە بناڵێن

هەروا دەڵێت :-"باباتاهیر خۆی و عاشقانی تر لە ئادەمیزاد لە عەشقیاندا بە گەرمتر دەزانێ لە عەشقی بلبل بەرامبەر بە گوڵ ".

م . فـوّاد حـسين لـه لا٥٣دا دەڵێـت :-" دەربرینـی سـوتە دلآن لـەم چوارینەدا درکە یە بۆ واتای دڵدارانی ستەم لێکراوان ."
شێخ مەحەمەد خالْ لەلا١٦ دا دەڵێت :-"هەر دەمێ بابا لۆرەیەك بکات بە چوارینەیەك خیرا تاری خۆیان دەکەوێتە پەل پەل وباڵە تەپێ، یا خۆ هەر کاتێك بابا ناڵەیەك بکات وچوارینەیەکی خۆی بخوێنیتەوە، ئەوانیش لە خۆشیانادەست دەکەن بە ناڵە ناڵ. "
بابا لیرەدا بانگی دەروێشانی عاشق وشەیدای وەك خۆی دەکات کە بێن کۆ ببنەوە و جەم بن تا زکرو مناجاتی خۆیان بکەن بۆ ئەوەی ئەو یا رەیان بەڵکو خۆی پیشان بدات پێیان وشادی باڵ بە سەریانا بگرێت، کە ئەوان ئەوەندە بە پەرووشن چوون بلبل شەیدای گوڵە ئەوان زیاتر شەیدای یارەکەیانن.

ئەحمەد تاقانەش لەلا٤٤دا کردویە بە سۆرانی .

(٧٧)

بە سەحرا بنگرم سەحرا تە وێنەم
بە دەریا بنگرم دەریا تە وێنەم
بەهەر جا بنگرم کوە ودەر و دەشت
نیشان ئەز قامەت ورەعنا تە وێنەم

بنگرم =بن بکەم واتە بگەرێم سەرا سەر .تە وێنەم = تۆ دەبینم . م . فوّاد حسین لە لا٤٠ دا دەڵێت :-" باباتاهیر ڕوو دەکاتە ئەو مەیدانە کە نووری خوای تێدا بلاٌو بۆەتەوە لەو دەشتەدا بە سۆزی عەشقی یەزدان ئەسرێتەوە لە هەموو سوچێکی ئەم ئەرزو ئاسمانەدا بێجگە لەو کەسێکی تر نابینێ وەکوخۆی دەڵێت :-

بـــه دەریـــا بنگـــرەم دەریـــا تـــه وینـــەم
بـــه ســـەحرا بنگـــرەم ســـەحرا تـــه وینـــەم
بـــه هـــەر جـــا بنگـــرەم کـــوه ودەرودەشـــت
نیـــشان ئـــەز رووی زیبـــای تـــۆ وینـــەم

له مێژووی ئەدەبی کوردی د. مارف خەزنەدار له لا ٢١٠ دا ووشەی (وینەم) به ووشەی (وینوم) هاتووه، هەر وا نیوه دێڕی کوتایی بەم شێوەیەیه :"مەگەر ئان که زیبایی تو وینوم " ئینجا واتەکەی به کوردی دەڵێت :

کـه ڕوو لـه زەریـا دەکـەم، لـه زەریـا تـۆ دەبیـنم
کـه ڕوو لـو سـارا دەکـەم، لـه سـارا تـۆ دەبیـنم
ڕوو لـو هـەر جـێـیـی بکـەم، کێـوو دەرو دەشـت
تـــــەنیا جـــــووانی تـــــۆ دەبیـــــنم

پاشان دەڵێت :" دەڵبەر هەموو شتێکه و له هەموو جێ یێکه ."

(٧٨)

نمیدانـــــەم کـــــه رازم وا کـــــه واژم
غـــەم ســـۆز و گـــودازم وا کـــه واژم
چ واژم هـــەر کـــه دونـــه بنگـــره فـــاش
دیگـــــەر راز و نیـــــازم وا کـــــه واژم

واژم =بڵێم . گودازم = زوخاوی، توانەوەم. که دونه = که دەزانێ.

صدیق بۆرەکەی بەم شێوەی نوسیوەتەوەو لێکی داوەتەوە :-

نەزونــــــەم مـــــو کــــــە رازوم واکـــــە واژوم
غــــــەم ســــــووز و گـــــودازم واکـــــە واژوم
چ واژوم ؟ هەرکـــە زوونـــو مـــی کـــەرو فـــاش
دیگــــــــــەر رازو نیـــــــازوم واکـــــــە واژوم

واتاکـەی :"نـازانم رازی دڵـی خـۆم بـەکێ بڵـێم ؟وپـەژارەی سـۆزو تواندنەوەی دڵ لە بەر تین وگەرمای ئەوین بەکی بڵێم؟ هەر کەسێ پێی بزانێ ئاشکرای ئەکا . کە واتە ئیتر رازو نیازم بە کێ بڵێم ؟ ."

فـەهمی کاکـەیی لـە لا٨٨دا دەڵێـت :-" کـە سـۆ فـی گەیـشتە قۆنـاغی نیستی وبوونی ئەم ئاوێتەی بوونی خودا بوو وخوایش نهێنیە، بۆیـە ئـەمیش دەبێتـە بەشـێك لـەو نهێنیـە کـە نـابێ بـدرکێنرێت.وەئـەم نهێنیـە بـەلای سۆفیەکەوە رازی دڵە کە جگە لە خاوەن دڵان کەسی تر پـی نازانێـت یـان بۆ کەسێکی تر باس ناکرێت.رازی دڵـی یـاران سـووتان وتوانەوەیـە لـەناو خۆشەویستیدا". چوارینەکەشی بەم شێوەیە کردوە بە سۆرانی :-

نـــــازانم کـــــە مـــــن رازم بـــــە کـــــێ بێـــــژم
خـــــەمی ســــووتان و توانـــــەوەم بـــــەکێ بیـــــژم
چ بێژم هـەرکێ زانـی فاشـی دەکـا (ئاشـکرای دەکـا)
ئـــــیتر رازو نیـــــــازم بـــــــەکێ بێـــــــژم.

هەروەها رازیش لە لا ٤٣ دا گۆڕیویەتی بۆ سۆرانی.

(٧٩)

مــــو کـــــز ســــوتە دلأنم چـــــوون نـــــەناڵم
مــــو کــــز بـــــێ حاصــــلأنم چـــــوون نـــــەناڵم
نشــــــتە بـــــــولبلان بـــــــەگوڵ بناڵـــــــە ن
مــــو کـــە دوور ئـــەز گـــولأنم چـــوون نـــەناڵم

مو كز = لەگەڵ، نزیك، لەتەك.

دڵزار لە گەنجێنەکەیدا کردوویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

لەگـــەڵ ســـــووتە دڵا ن چـــۆن نـــــەناڵم
لـــە تـــەك بـــێ حاصـــڵانم چـــۆن نـــەناڵم
ئـــەناڵن بـــولبلانی نـــاو چـــڵ و گـــوڵ
کـــە مـــن دووری گـــوڵانم چـــۆن نـــەناڵم

م. فۆاد حسین لە لا ٥٠ دا دەڵێت :-باباتاهیر لێك چواندنی هەست پێکراو ساز دەکات کە لە بەلاغەی عەرەبیدا پێی دەوترێت (التشبیه الضمنی). بۆیە باباتاهیر لەم چوارینەیەدا لە ناڵێندا خۆی بە بولبل دەزانی و خۆشەویستەکەی لە جوانی دا بەگوڵ.

رزای لە لا ٤٣ دا گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆانی بەم شێوەیە:.

دڵ ســـوتاوان وەرن نەخـــشێ بکێـــشین
قـــسەی نـــاوێ هـــەموو بـــەداخ و ئیـــشن
تـــەرازوم هێنـــاوە بـــۆ گێـــشی خـــەمان
خـــەمی ســـوك و گـــرا یـــەك یـــەك ئەکێـــشین

شێخ مەحەمەد خا ڵ لە لا ١٧ دا دەڵێت دەربارەی ئەم چوارینەیە : هەر کاتێك بابا ناڵەیەك بکاتو چوارینەیەك بخوێنیتەوە ئەوان کەیف و خۆش دەبن چو نکە هاو دەمێك بوو خۆیان دەدوزنەوە .

(٨٠)

بـــۆرە ســـووتە دڵـــون گـــرد هـــەم ئـــاییم
ســـوخەن واهـــەم کـــەریم غـــەم وا ئانمـــائیم
تـــــەرازو ئـــــاوریم غـــــەمها بــــسونجیم
هـــەر ئـــان غـــەمگین تـــەریم وەزنـــین تـــر ئـــاییم

گرد هەم ئاییم= نەشیٚ بکێشین.سوخەن وا هەم کەریم =قسەیە بکەین هەموو. غەم ئانمائیم =پڕ داغ وئێش.ئاوەریم= بێنین.غەمها بسەنجیم=غەممان بکێشین.غەمگین تەریم =غەمبار ترین. وەزنین تر = قورستر. دلۆن=دلاٚن

(٨١)

سەر کۆی تو تا چەند ئایم وشەم
ز وەصلٚت بیٚ نەوا چەند ئایم وشەم
سەر کویت بە رای دیدەنی تۆ
نەترسی ئەز خودا چەند ئاین وشەم

کویت=بیابانی بیٚ ئاو .وشەم= ئووشم، ئەلێم .بەرای دیدەنی تۆ = بۆ دیتنی تۆ . ئایم =دێم.

(٨٢)

داد ئەز ئین دلٚ کە هەر کز نی بە کامم
داد ئەز ئین دلٚ کە ئازار دەمدامم
داد ئەز ئین دلٚ کە چوون مورغان وەحشی
دانە ناچیدە هەر رووزە بە دامم

نی بەکامم=ناگاتە ئامانج. دەمدام =دەمدەم. مورغ=باڵدار دانە چیدە =نارویٚنی واتە ڕووی ناکات. بەدامم =لە پێشم، بە داوێنم

(٨٣)

بۆرە کز دیدە جە یحوونیٚ بسازم
بۆرە لەیلیٚ ومەجنوونیٚ بسازم
فرەیدوون عەزیز ئەز دەست مو ڕەفت
بۆرە ئەز نوو فرەیدونی بسازم

کـز دیـده =چـاوانی کـز .بـۆره= وەره .بـسازم= سـاز بکـەین .ڕەفـت= ڕۆیشت .ئەز نوو= لە نۆیووه، سەر لە نۆی

فەهمی کاکەی لە ٧٨٦٧دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەیە :-

وەره لــه چــاوان جــەیحونیٚ ســاز کــەین
وەره بــا لــەیلاو مــەجنونیٚ ســاز کــەین
فەرەیــدوونی ئــازیز لــە دەســتمان چــوو
وەره ســەر لــە نــویٚ فەرەیــدوونیٚ ســازکەین

هەر وەها دەڵێت:-. باباتاهیر کورێکی هەبووه بەناوی فەرەیدوون کاتیٚ کە دەمرێت لاواندنەوەی ئەوا روو دەکاتە فاتمە لەره وئەو چوارینەیە دەڵێت .

باباتـاهیر وا پـیٚ دەچـێت مەبەسـتی ئـاین و ڕێبـازی زەردەشـتە، کـە زەردەشت لە خێڵی فره یدوون بووه. کە لێرەدا بە پیروانـی دەڵێت، ئەو زەمان و چەرخەی زەردەشت لە دەستمان چوو (واتە واتە زەمانی ئێمـە نەبوو). وەره ڕێبازێکی نویٚ پەرەپیٚ بدین من و تۆ وەك عەشقی لەیلاو مەجنون.

هەر وەها ئەحمەد تاقانەش لەلا١٥د کردویە بە سۆرانی.

(٨٤)

مــو کــە دوور ئــەز تــوم زەنــار بەنــدم
یــەهود وپــوت پەرســتم گــەر بخەنــدەم
پــەي ئــەز عەهــدو وەفاییــت ئــەی دلارام
چــکر عەهــدو وەفــا بــا کــەس نەبەنــدەم

زەنـار بەنـدەم =جەسـتەم لـە جێگـای سـەختە، لـە ئـاگری گیـانم . گـەر بخەندەم = گەر پیٚ بکەنم. نەبەندەم= بەند نیم، پەیمانم بە کەس نەداوە.

واته :- باباتاهیر لەگەل مەعشووقەکەی قسە دەکات و دەلێت کە من دوورم وناگەم بە توو حالم پەریشانە، ئاگر لە جەستەم بەر بووە، خۆشی بە دلما نایەت، ئەگەر لە دووری تۆیا من خۆشی بکەم وەك جولەکەو پوت پەرست بم وە گەر وەعدو پەیمانم لەگەل تۆ بەستوە، هەر سەر گەرمیم و بە کەسی دیکە نایدەم .

هەر وەها ئەحمەد تاقانە لە لا٥٢ دا بەم شێوەیە کردویە بە سۆرانی :-

کــــە مــــن دوورم لــــە تــــۆ زوننــــار دەبەســــتم
ئەگــــەر مــــن پێکــــەنم جــــووم، بتپەرســــتم
لــــە پــــاش گوفــــت و بــــە لێنــــت ئــــەی دلارام
بــــەلێن و گــــوفتی دی نــــابێ مەبەســــتم

(٨٥)

بــــۆرە ڕۆژی کــــە دیــــدار تــــە وینــــم
گــــولێ وســــونبل بــــە دیــــدار تــــە چــــینم
بــــۆرە بنــــشین بــــەرم ســــا لأن وماهــــان
کــــە تــــا ســــیرت بوینــــەم نــــازەنینم

بەرم =لە پێشم، لە لام .سیرت= تێرت

دلزار کردوویە بە سۆرانی لە لا٤٣دا بەم شێوەی خوارەوە :-

وەرە ڕۆژی کــــە دیــــدارت ببیــــنم
بــــە دیــــدارت خــــەریکی گــــولێ چــــنینم
لــــە لام بــــێ دا بنیــــشە مــــانگ وســــالأن
هــــەتا تێــــرت ببیــــنم نــــازەنینم

(٨٦)

بەعــــــشقت ئــــــەی دلارا نەگروســــــتم
نەویـــــد وەصـــــل تـــــۆ تـــــا نـــــشنوستم
بـــــەدڵ تـــــەخم وەفایـــــت کێـــــشتم ئـــــاخر
پـــــەجز ئەنـــــدوە خـــــواریٚ نەدروســـــتم

نەگروستم =نیگەرانم .تا نشنوستم = تارمایی ژیانم .ئەندوەخواریٚ =ناتەواوی. تەخم= ناوەرۆك. کێشتم=بەسەرئەبەم. دروست = باش، ڕێك.

رازی لە لا ٤٤ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەیە:.

لـــــە خۆشەویســـــتـــــت دڵ نیگـــــەرانم
مـــــن بـــــە تۆناگـــــەم تامـــــابیٚ ژیـــــانم
داخ زاڵـــــە لەســـــەر وەفـــــا لـــــە نـــــاو دڵ
لـــــە نـــــا تـــــەواوی و جـــــەوری زەمـــــانم

(٨٧)

نەزونـــــەم مـــــو کـــــە ســـــەر گـــــەردان چـــــرایەم
گـــــەهی گریـــــان گـــــەهی نـــــالان چـــــرایەم
هەمـــــە دەرمانـــــشان بـــــی دەردەداران
نەزونـــــەم مـــــو کـــــە بـــــیٚ دەرمـــــان چـــــرایەم

چرایەم= بۆچی وام .گەهیٚ= تاویٚ .هەمە =هەموو.دەرمانشان بی =دەرمانیان هەبوو.

دڵزار لە لا٧٤ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

ئـــــەمن نـــــازانم بـــــۆ چـــــی ســـــەرگەردانم
گـــــەهی لـــــە گریـــــان گـــــەهی لـــــە نـــــالانم
هـــــەموو نەخوشـــــێك دەرمـــــانی هەیـــــە
نـــــازانم کـــــەمن بـــــۆچ بـــــیٚ دەرمـــــانم

(٨٨)

دڵـــــم زارو حەزینـــــە چـــــوون نـــــەناڵم
وجـــــوودم ئاتەشـــــینە چـــــوون نـــــەناڵم
بـــەمو واچـــن کـــە چـــوون و چـــەند نـــاڵی
چـــو مـــەرگم دەر کەمینـــە چـــوون نـــەناڵم

وجوودم =بوونم، ژیانم. ئاتەشینە = ئاگرینە.بەمو واچن = بەمن دەڵێن.
دڵزار بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سۆرانی :-

دڵـــــم زارو حەزینـــــە چـــــۆن نـــــەناڵم
وجـــــوودم ئاگرینـــــە چـــــۆن نـــــەناڵم
دەبێـــژن پـــێم کـــە چـــۆن وچـــەند ئـــەناڵی
کـــە مـــەرگم لـــە کەمینـــە چـــۆن نـــەناڵم

(٨٩)

غـــەمم غـــەم بـــی وغـــەمخواری دڵـــم غـــەم
غـــەمم هـــەم مـــۆنس وهـــەم یـــارو هەمـــدەم
غـــــەمم نەهلـــــە کـــــەمو تـــــەنها نـــشینەم
مـــــەریزا بـــــارك اللـــــە مەرحـــــەبا غـــــەم

مـــۆنس= دڵـــسۆز، هـــاوڕێ.نەهلـــە = نـــاهێڵی.مـــەریزا= دەمـــرەژێ، دەستخۆش.

دڵزار لە لا٣١دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

غـــەمم غـــەم بێـــت وغـــەمخواری دڵـــم غـــەم
غـــــەمم هـــــاومۆنس وهـــــاو یـــــارو هـــــاودەم
غـــــەمم مەشـــــروبە تـــــەنیا دابنیـــــشم
دەمـــــرەژێ بـــــارك اللـــــە مەرحـــــەبا غـــــەم

فەهمی کاکەی لە لا۹۱دا دەڵێت :-"بە رەت بوونی ڕۆژگار، باباتاهیر لە ناو خەمدا قاڵ دەبێتەوە ئیدی وا هەست دەکات کە بەبێ خەم هەڵناکات."وەك لەم چوارینەیەیدا :-

خەمم خەم بوو خەمخۆری دڵیشم خەم
خەمم هەم هۆگروهەم یارو هاودەم
خەمم نەیهێشت کە من تەنیا دانیشم
دەستخۆش و بارەکەڵلاّ ئافەرین خەم

هەر وا دەڵێت خەمی بابا خەمێکە ئاسایی نەبوە، هی ئەنجامی نائۆمێدیەکەی بووە، وای لێ بکات کە بیر لە بوونی مرۆڤ بکاتەوە .بۆچی دیتە ئەم دونیایەو تووشی ناهەمواری وخەم دەبێت وکۆچ دەکات ؟ .
م. فۆاد حسین دەڵێت:-"لەم چوارینەدا ئەندیشەی شاعیروەها بەباڵی ئێش وئازار دەفرێ غەمی دڵی بە مۆنسوبە یار وبە هاودەم دەشوبهێنێ.
.ئەم غەمەی بابا لە ئەنجامی نەگەیشتنیەیی بە مەعشووقەکەی کە لە پێناویدا ڕەنج دەدات لە دونیای سۆفیکەریدا.

(۹۰)

بێ تە گوڵشەن چو زیندانە بە چەشمم
گوڵستان ئازەرستانە بە چەشمم
بێ تە ئارام وعومر و زیندەگانی
هەمە خواب پەریشانە بە چەشمم

بە چەشمم=لە پێش چاوانم .ئازەرستان= ئاگرستان، جێی ئاگر پەرستان. زیندەگانی= ژیان. خواب= خەو.
دڵزار لەلا۷۰دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

گوڵــــشەن بـــەبێ تـــۆ وەك زیندانــــە لام
گوڵـــــــستان وەكـــــو ئاگرســـــــتانە لام
بـــــێ تـــۆ ئـــارام وعـــــومرو ژیـــانم
هــــــەموو وەك خـــــەوی پەریـــــشانە لام

ئەحمەد تاقانەش لە لا٤٦دا كردویە بە سۆرانی.

(٩١)

خۆشــە ئــان ســەعات كــە دیــدار تــۆ وێنــەم
كەمەنـــدی عەنبـــەرین تـــاری تـــۆ وێنـــەم
نەوێنـــە خــــوررەمی هــــەرگیز دڵ مـــوو
مەگـــەر ئانـــدەم ڕوخـــسار تـــۆ وینـــەم

كەمەند عەنبەرین=كەمەنی عەنبەرین. تاری تۆ= شەوەزەنگی تـۆ، یـان قەدوبالای تۆ.خوررەمی=گوشادی، خۆشی.ئاندەم=ئەوساتە، ئەودەمە.

دلزار لە لا٤٥دا كردویە بە سۆرانی بەم شێوەیە:-

خۆشــــە ئــــەو ســـاتەی دیـــدارت ببیـــنم
كەمەنــــدی عەنبــــەرین تـــارت ببیــــنم
گوشـــادی نـــابینێ هـــەرگیز دڵـــی مـــن
مەگـــەر ئـــەو ســـاتە ڕوخـــسارت ببیـــنم

م. فۆاد حسین لەلا٥٢دا دەربارەی ئەم چوارینەیە دەڵـیت :-باباتـاهیر لـە كـۆڕی روون بێژیـدا گـشت جۆرەكـانی خـوازی بـەرەللا واتـە(المجـاز المرسل)لە جیهانی ئافرەتدابە كار ئەهێنی.

ئەگـەر تەماشـای دیوەكـەی تـری ئـەم چـوارینەیە بكـەین لـە ناخـدا فەلسەفەی سۆفیگەری خۆی دەنوێنی ورواندنێكی قـوولی تـەم ومژاویـە لـە جیهانی سوفیگەریدا،

(٩٢)

دڵ مورەســــت و ئـــە حــــواڵش نەزوونـــــەم
کەســـێ خواهـــد کـــە پیخـــامش ڕەســـوونەم
خوداوەنـــــدا زە مــــــەرگم موهلــــــەتێ دە
کـــە دیـــــداریێ بـــــە دیــــدارش ڕەســـوونەم

خواهد=دەیەوێ.پیخامش=سەلاوی.ڕەسوونەم=دەگەیەنم.دوورست=دوورە.

باباتاهیر لە یارە دوڵبەرەکەی دوورە وئەحواڵی نازانێ، کەسێك هەیە بیەوێ سەلاوێکی باباى پێ بگەیەنێ؟ ئینجا لەخوادەپاڕێتەوە کە مۆڵەتی بدات بەر لە مردن چاوی بە ڕوخساری بکەوێ و دڵی داکەوێ بگاتە شادی هەمێشەیی.

(٩٣)

بــــێ تـــە بـــاڵین ســـیاه مـــارە بـــە چـــەشمم
بـــــێ تـــە روزان شـــەو تـــارە بـــە چـــەشمم
بـــــێ تـــە هەرکـــە شـــووم ســـوی گوڵـــستان
گوڵـــستان ســـەر بـــە ســـەر خـــارە بەچـــەشمم

باڵین=سەرین. سیاه مارە=ماری ڕەشە. بەچەشمم=بەچاوم. شووم ســـوی=چوومەتەماشـــای. سەربەســـەر=سەرانـــسەر. خـــارە=دڕکـــە. ڕۆزان=ڕۆژان.

باباتاهیر دەڵێت:-"بەبێ تۆ ئەی یار سەردەنێمە سەر سەرین بەشەوان وەدەمەوێت خەوم لێ بکەوێت، ئەو سەرینە وەك ماری ڕەشەو خەوم لێ ناکەوێت بەبێ تۆ، ڕۆژانیشم وەك شەوی تاریکە، ئەگەر بێ تۆ برۆمە ناو گوڵ و گوڵزاریش وادەزانم ئەو گوڵانە لەپێش چاوم درکن".

ئەحمەد تاقانە لەلا٤٦٧دا کروویەتی بەسۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:

سەرینم بێ تۆ رەشمارە لەچاووم
بێ تۆ رۆژان شەوی تارە لەچاوم
بێ تۆ کەی بچمە سەیرانی گولستان
گولستان سەربەسەر خارە لەچاوم

(٩٤)

سەری کۆهی بڵند چەندان نشینم
کەلالە سەردەرئارە موو بچینم
چولالە بێ وەفا بوو بێ وەفا بوو
بەکار بێ وەفا مووچوون گزینم

سەری کۆه =سەرچیا. چەندان=چەندێ. دەرئارە=دەردێنێ. مووبچینم=من دەیکەمەوە. لالە=گوڵی هەڵالە. کزینم=دڵتەنگم، کزم.

دڵزار کردوویەتی بەسۆرانی بەم شێوەی خوارەوە لەلا٩٦دا:-

چەن دانیشتووم لەسەر کێوی بەرز
کەلالەم بچینم سەر دەرکا لەئەرز
وەك لالە وایە بەبێ وەفایە
چۆن بمەوێ یارێ بەبێ وەفا تەرز

دێری کۆتای چوارینەکە لەگەنجینەکەی دڵزاردا بەم شێوەیە:

نیگاری بێ وەفا موو چون گوزینم

ئەگەر سەرنجی نیوە دێری کۆتای بدەین ووشەی بەکار لەکتێبەکەی فؤاد حسين هاتووە بەووشەی نیگار، وە ووشەی گزینم بۆتە گوزینم.

هەروا رازایش لە لا ٢١ دا گۆریویەتی بۆ سەر زواری سۆرانی.

(٩٥)

ئەگــــەر چـــەشمم بـــدۆزی دۆتـــە خــــواهم
وه گــــەر جــــسمم بـــسوچیٚ ســـوته خـــواهم
ئەگــــەر بـــاغم بـــڕی بەرچـــی دەن گـــولٚ
گـــولٚ هـــەم رەنـــگ هـــەم بـــۆی تـــەخواهم

بـدۆزی=دەرییٚنـی. بسوچی=بسوتیٚ. باغم بـڕی=بڕۆمـە نـاو باغـان. بەرچی دەن گولٚ= تەماشای گولان دەکەم.

لیٚرەدا باباتـاهیر ئاخـافتن لەگـەلٚ مەعـشوقەکەی دەکـات کـە هەمیـشە لـەیادی ناکـات وە دەلیٚـت :-" هەرچـەندە لەجـەورو جـەفاو تەنگانـەدام ئەگەر چاوانیشم دەرییٚنیت یان ئاگرم تیٚ بەردەی و بسوتیٚم هـەر ئاواتمە بگەم بەلای تۆ شاد ببمەوە، وەگەر لەم دونیایەدا بم خەیتە ناو نـازو نعمـەت و گولٚو گـولزارەوە هـەمو خۆشـی و کامەرانیـەکم پـیٚ ببەخـشیت مـن هـەر ئاواتە خوازم لەتۆ نزیك ببمەوەو دونیام لەبەر چاو نایەت".

بە مانای دەست هەلگرتن لە خۆشی ژیان مەحروم کردنـی ئاواتـەکانی دەروون وە بەرگري کردن لە ئازارو ئەشکەنجەی ژیان بۆ پاك کردنـەوەی روح، وە گەیـشتن بـەیار و یـەك بـوون وە شـادبوونەوەی هتاهتایـە، ئەمـەش ناخی فەلسەفەی ریٚبازەکەیەتی.

رازی لە لا ٤٦ دا بەم شیٚویە کردویە بە سۆرانی:.

هـــەردوو چـــاوم دەریٚـــنن تـــۆم ئـــەویٚ تـــۆ
بـــە ئـــاگر بم ســـوتیٚنن تـــۆم ئـــەویٚ تـــۆ
بـــچمە نـــا بـــاخ تەماشـــای گـــولان کـــەم
گـــولٚ هـــەزار بنـــویٚنن تـــۆم ئـــەویٚ تـــۆ

(٩٦)

مــوو کــه ئەفــسوردە حــاڵم چــوون نــەناڵم
شکــــستە پــــەرو بــــاڵم چــــوون نــــەناڵم
هەمــــە گویــــەن فــــولانی نالەکــــەم کــــون
تــــە ئــــائی دەر خــــەیاڵم چــــوون نــــەناڵم

ئەفسوردە=پەژموورده، تەنیا(پەریشان کار، ئەحمەدتاقانە). تەئائی=تۆ دێیت.

دڵزار لەلا٣٣دا کردوویەتی بەسۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:

کــــەمن پــــەژموورده حــــاڵم چــــۆن نــــەناڵم
شکــــستە پــــەڕو بــــاڵم چــــۆن نــــەناڵم
هــــەمووییــــژن فلانــــی کــــەم بناڵــــە
کــــو تــــۆ دێتــــە خــــەیاڵم چــــۆن نــــەناڵم

ئەحمەد تاقانەش لەلا٤٧دا کردوویەتی بەسۆرانی هەروەها رازیش لە لا ٤٦ دا گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی.

مەبەستی باباتاهیر لێرەدا ناڵین و گریانی بۆ پەرێشانی حاڵی خۆیەتی کەتەنیایە لەم دونیایادا، کۆششو هەوڵدانی لەئاین و ئاین زانیدا بۆ ئەوەی نزیك بێتەوە لە مەعشوقەکەی کە پەروەردگارە بەڵام چی بکات پەڕو باڵی شکاوە نایگاتیێ ئیتر چۆن نەناڵێت هەرچەندە دەوروبەری بەحاڵی دەزانن و پێی دەڵێن کەم بناڵە، بەڵام ئەمو هەرجارێك خەیاڵێکی ئەو مەعشوقەدەکات کە هیواو ئاواتییەتی بیگاتیێ گریەو ناڵە دایدەگرێت.

(٩٧)

مــوو ئــەز جــەور بوتــان دەلێ رێــش دیــرم
زەلالــــە داغ پــــر دلێ پــــێش دیــــرم
چــو فــەردە نامــە خوانــان نامــە خواننــد
موئــەز خــەجڵت ســەرێ دەر پــێش دیــرم

بوتان=پوت(صنم). خەجەل=پەشیمانی، شەرمەزاری. دڵ ڕێش= دڵبرین.چوفەردە=چۆن سبەینی نامەخواهان=نامەخوێندنەوە، خوێنەری نامە. مو ئەز=من لە.

رازی لە لا ٤٦ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەیە:.

مـن لـە جـەوری یـەکێ دڵ پـڕ ئێـشم
وەکـو لا لـە دڵ داخـێ ئەنۆشـم
سـبەی ڕۆژ نامـە خـوێن نامـە ئـەبینن
ئـەکردارم شـەرمەزاری ئەکێـشم

(٩٨)

بـەئاهی گونبـەد خـەزرا ڕا بـسووچەم
فەلـەك ڕا جوملـە سـەر تاپـا بـسووچەم
بـسووچەم ئەزنـە کـارت ڕا بـساجی
چـەفەرمائی بـساجی یـا بـسووچەم!

کونبەد خەخرا=گۆمەتی ئیمامی خدرە. ئەرنەکارت ڕابساجی=یاخود کاری تۆ بسازنم. چەفەرمائی=چێیە فەرمانی تۆ. جوملە= بەگشتی.

ئەحمەد تاقانە لەلا٣٤دا کردوویەتی بە سۆرانی بەم شێوەیەی خوارەوە:

بـە ئاخێـك گومـەزی واڵـە بـسووژم
هـەموو گـەردوون سـەرتاپا بـسوژم
دەسـوتێم گـەر تـۆ کـاری مـن نەسـازی
دەفـەرمووی چـی؟ دەسـازی یـا بـسوژم

هەروەها رازیش لە لا ٤٦ دا گۆڕیویەتی بۆ سۆرانی.

شێخ مەحەمەدی خاڵ لە لا١٧ دا راڤەی ئەم چوارینەیەی کردووە وەدەڵێت:–" بە ئاهێك ئاسمان و زەوی ئەسوتێنم، ئەی کەریمی کار ساز

ئەگەر كارم نەسازێنیت هەموو جیهان دەسوتێنم، كارم دەسازێنیت؟ یامن ئاگر لەجیهان بەر بدەم". ئینجا دەڵێت ئاگرێك كە لەدڵی بابادا هەڵگیرساوەو زوبانەی كێشاوە ئاگرێكی هەتا هەتاییە، تاجیهان بێت ئەو ئاگرە دەبریسكێتەوەو ئاگری تر بەردەداتەوە.

(٩٩)

بـــۆرە یـــەك دەم بنـــاڵین و بـــسوچیم
ئـەز ئـان ڕوئـی كـە هـەردوو تـیرە ڕوجـیم
نــــەبولبل حاشـــا الله مثـــل مـــوئی
نــەبود چــز دەرد غــەم یــەك عــومر ڕۆجـیم

ڕۆجیم=لێم دەدا. مثل موئی=وەك من. بۆرە=وەرە.

ئەحمەد تاقانە لەلا٤٨دا بەم شێوەی خوارەوە كروویەتی بە سۆرانی:-

وەرە تـــاوێ بنـــاڵین وبـــسوژین
لەبـــەر وەی هـــەر تكانمـــان ڕشـــە رۆژیـــن
تـــۆ بولبـــول(حاشـــاللا) گـــەر لـــەمن چـــی
لـــەدەردو غـــەم پـــتر نـــەمبوو تەمـــەن، ژیـــن

رازیش لە لا ٤٧ دا كۆریویەتی بۆ سۆرانی.

(١٠٠)

هەمـــە عالـــەم پـــڕ ئـــەز گـــەردە چـــە واچـــم
چـــوومو دڵهـــا پـــڕ ئـــەز دەردە چەواچـــەم
ســـونبولی گەشـــتە بـــەداماں ئەڵوەنـــد
ئونـــەم ئـــەز طـــالعـــم زەردە چەواچـــەم

گـەرد=سـەیران. (تـەم وگـەرد=رازی). سـونبولی گەشتە=سـونبول روا، گەش بووەوە. داماں=دامێن. ئونەم=ئەوەم. طالعم=بەختم. چەواچم=چی بلێم.

ئەحمەد تاقانە لە لا ٤٩دا بەم شێوەی خوارەوە کردوویەتی بە سۆرانی:-

هــــەموو دونیـــا تـــۆژی گـــەردە چ بێـــژم
چـــو مـــن دڵیـــان تـــۆژی دەردە ژ بێـــژم
گـــوڵێکم چـــاند لـــە داوێنێکـــی ئەڵوەنـــد
لـــە بـــەختی مـــن ئـــەویش زەردە چ بێـــژم

رازیش لە لا ٤٧ دا گریویەتی بۆ سۆرانی.

(١٠١)

بـــادە بـــەر گـــیرم وســـەیر گـــوڵان شـــەم
کنـــــار ســـــەبزە وئـــــاب ڕەوان شـــــەم
دوو ســـە جـــامیٚ خـــوڕەم بـــا شـــادو کـــامی
وایـــەم مەســـت وبـــە ســـەیر لالیـــان شـــەم

بادە بەر گیرم = بادەی مەی لە پێش دا دەنیم. سەیر گوڵان شەم =سەیری گوڵان دەکەم.کنار سەبزەو ئاب =لە کنار (رۆخی) ڕوبارو سەوزایی. بە شادو کامی=بەدڵ خۆشی. وایەم مەست=مەست دەبین.رەوان شەم =بە ڕێ دەکەوێ، ئاب رەوان = ئاوی رۆشیتوو.

رازی لە لا ٤٧ دا گۆریویەتی بۆ سۆرانی بەم شێوەیە:.

دەس بـــە بـــادە بەچـــاو ســـەیری گـــوڵان کـــەم
تەماشـــــای ســـــەوزە و ئـــــاوی رەوان کـــــەم
دوســـــێ جـــــامێ بنۆشـــــم شـــــادبم تـــــاوێ
بەســـەر خۆشـــی ســـەیری لا لـــە جـــوان کـــەم

واتە :-باباتاهیر دەچێتە دونیای خەیاڵاویەوە، بادەی مەی بە دەستەوە (بادەی شەیدا بوون ومەستی ریگاە هەق و خواناسی) لە روژێکی بەهاردا لە کەنار رووبارە ئاوێك، چەند پێکێك بە دڵ شادی دەخواتەوە و مەست دەبی، دوور لە ناڵەو غەم تەماشای گوڵو گوڵزار و گوڵاڵە سوورەی ئەو بەهارە دەکات .

(١٠٢)

دڵــــم دەردیـــــن و نــــاڵێن چــــە واچــــم
رەخــــم گـــەردین و خـــاکین چــــە واچــــم
بگەردیــــــدم بـــــە هـــــەفتادوو دوو مللـــــەت
بەصــــەد مەزهــــەب مونـــادین چـــە واچـــم

دەردین=دەردەدار.ناڵێن= بەناڵەیە.چە واچم= چی بلێم.رەخم=دەم و چاو.گـەردین=بـە گـەردە مونـادین=هـاوار کـەر .خـاکین=خـۆڵێن .مەزهەب=ڕێباز.

ئەحمەد تاقانە کردویەبە سۆرانی لە ٤٨٧دا بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵـــــم پـــــڕ دەرد و ناڵێنــــــە چ بێــــژم؟
دەمـــو چـــاو گـــەرد وخۆڵینــــە چ بێــــژم
بـــەناو حـــەفتاودوو میللەتـــدا گـــەڕاوم
بەســــەد ڕێبازگـــــە گاڵێنـــــە چ بێــــژم

(١٠٣)

ئـــەز ئـــان ئەنگوشـــت نـــەمای ڕوزگـــارم
کـــە دوور ئـــەفتادە ئـــەز یـــار و دیـــارم
نەزوونـــەم قەصـــد جـــان کـــەردن بـــە ناحـــەق
بـــەجز بـــەر ســـەر زەدەن چـــارو نـــەدارم

ئەنگوشت نەمای =مووری پەنجە. ئەفتادە=کەوتووم.بەجز=بە نووکی ڕم. دیار= وڵات قەصد جان کەردن=قەستی کوشتنمی کردوە.

بابا دەڵێت : ئەو چارە نووسەیڕۆژگاری منە، کە دوور کەوتووم لە دۆست و یارو وڵات غەریب و بێ کەس، نەمزانی ئەم چارە نووسە بە ناهەق لە مەرگم دەگەرێ و چزاوە بە سەرو مێشکما ((واتە سەودای عیشقی

یار له سەری داوم )گیرودەی بووم و هیچ چارەیەکم نیە. کەسیش دەوای دەردەکەی ناکات ئەو یارو یاریە نەبێت.

(١٠٤)

ئـــەز ئـــان دلْ خەســـته و ســـینه فکـــارم
کـــه گریـــان دەر تـــه ســـنگ مـــەزارم
بواچـــەندم کـــه تـــه شـــوورەی نـــەداری
ســـەرا پـــا شـــوور دارم شـــەر نـــەدارم

دلْ خەسته=دلْ نـەخۆش.. سینه فکـارم= سینه بـیْ قـەرارم.سـەنگ مەزارم=کێلەی کلْکووم.بواچەندم=دەلێم.نەداری، نەدارم=نیته، نیمه.

(١٠٥)

بـــشو مـــەحو ڕەخ مـــه پـــاره هەســـتم
بـــەڕوز ئـــەز دەرد وغـــەم بێـــچاره هەســـتم
تـــۆ داری دەر مـــەکان خـــود قـــەراری
مویـــەم کـــه دەر جیهـــان ئـــاواره هەســـتم

بـــشو=بـــڕۆ.مـــەحو=لاچـــو، دوور کـــەوه. ڕەخ=کـــەنار، پـــاین. هەستم=هەمه.مەکان خـود=جێگـای خـۆت.مویـەم=منم پـاره=بـیْ کـەس وبیْ دەر.

باباتاهیربـــه دلْ شـــکاوی و توورەییەوەقـــسه دەکـــات بـــۆ پیروانـــی ڕێبازەکەی(یارو مەعشووقەکەی)کە بۆ خۆی ئارام و بەر قەرارە لـه جێگـای خویدا، خـۆی پیـشان بـه بابا نـادات.کەچـی بابای بـی کـەس و بیْ چاره لەشـەیدای ئـەو دا لـەم دەربەدەریـەدا کەوتوەتـه ژێـر بـاری دەردو غەمـەوه هـەر چـەند دەکـات نایگـاتیْ و نـابینیْ بۆیـه دەلێـت بـڕۆ وازم لیْ بێنەبـه

دەوری مندا مەیە.ئەوەش خۆی لە خۆیدا سکالاو داواکاریە بۆ ئەوی رزگاری بکات لەم حاڵەتەی تێدایەتی.

(١٠٦)

بــــە دڵ دەردو غــــەمت بــــاقی هــــەنووزەم
کەســــێ واقــــف نــــەبوود ئــــەز دەرد ســــووزەم
نــــەبوود یــــەك بولبــــل ســــووتە بــــە گوڵــــشەن
بــــە ســــۆز مــــو نــــەبوود کــــافر بــــە روزەم

باقی هەنووزەم=هەناوم ماوە.واقف=وەستاو.کەسێ واقف نەبوود=مەبەستی کەسێك ڕاست نەبێ. ئەز دەرد سووزەم= بە دەم دەردەوە دەسوتێم.

بابا دڵ و هەناوی پڕ غەم و دەردە بە دەم ئازارەوە دەتلێتەوە کەسێك ئاورێکی لێ ناداتەوە، ناگاتە یار، بووە بولبل لە ناو گوڵ وگوڵزاردا بسوتێت، لە شێوەی سوتانی من، ئەی کافر ڕۆژی بە ڕۆژی من نەگات .

(١٠٧)

فەلــــەك کــــەی بــــشنەود ئــــاهو فیخــــانم
بەهــــەر گــــەردش زەنــــەد ئاتــــەش بــــە جــــانم
یــــەك عــــومرێ بگــــوزارم بــــا غــــەم و دەرد
بــــەکام دڵ نــــە گــــوردەد ئاسمــــانم

کەی بشنەود= کەی ئەبیستێ.گەردش=سەیران.زەنەد=دەکاتەوە، بەردەبێت. بگوزارم =بەرینە سەر، تەواو کەین.نەگوردەد=نەسووراوە، نەگۆراوە.ئاسمانم=مەبەستی ڕەحمی پەروەردگارە.

دلزار لە لا ٦٠ دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

فەلـــەك کـــەی ئەشـــنەوی ئـــاهو فیخـــانم
بـــە هـــەر ســـوڕێ ئـــەدا ئـــاگر لـــە گیـــانم
بـــە مەینـــەت کێـــشی عـــومرێکم بـــە ســـەر بـــرد
بـــــە کـــــامی دڵ نەســــــووڕا ئاسمـــــــانم

(١٠٨)

نـــەزوونی ئـــەی فەلـــەك کـــە مەســـت مەنـــدم
وا مـــــو پـــــڕ بەدمەکـــــە مـــــە دەرد مەنـــــدم
بەیـــــەك گـــــەردش کـــــە میکـــــەردی ببینـــــی
چـــــو ڕشـــــتە مـــــو بـــــە ســـــامانت ببەنـــــدم

نـــەزوونی=نـــازانی، بـــێ خەبـــەری، مەســـت مەنـــدم=مەســـتێکی تەواوم.میکەردی=دەتکرد.چو ڕشتە=چون بەش، چون تەل.ببەندم=بەند دەبم، دەبەسترێمەوە.وا مـو پڕ بـەد مەکـە=وا مـن پڕ خرابـە مەکـە. دەرد مەندم=مەستم لە ژێر باری دەردا.

(١٠٩)

کـــــە نـــــون داری نـــــەزارە گـــــوو واکیـــــانم
زە جـــــــەورت دەر گـــــــوزارە ئـــــــستخوانم
بکـــــە ئەندیـــــشە ئـــــەی بـــــێ داد پیـــــشە
کـــــە ئـــــاهم تـــــیر بـــــو ناڵـــــە کـــــەمانم

کنون، کەنون=ناونیشان.ئیستخوانم=ئێسقانم. نەزارە=چاوەڕێ کردن. ئەندیشە=فکر، هـەزەر.کـە ئـاهم تـیر بـۆ= کـە ئـاهم وەك تـیر بێـت.ناڵـە کەمانم=ناڵەم وەك دەنگی کەمانە کاتێك کە تیر دەهاوێژرێ

(١١٠)

زه حـــالْ خویـــشتن مــــو بـــیْ خه‌بـــه‌ر بــیم
نه‌زوونـــه‌م ده‌ر ســـه‌فه‌ر یـــاده‌ر حـــه‌زه‌ر بــیم
فیخـــانم ئـــه‌ز ده‌ســـت تـــوو ئـــه‌ی بـــیْ مـــرووه‌ت
هـــه‌مین زوونـــه‌م کـــه عـــومریْ ده‌ر بـــه‌ده‌ر بــیم

خویـشتن=قه‌وموئـه‌قربا، خزمـان.حـه‌زه‌ر=ئاگـاداری.بـیْ مـرووه‌ت=بـیْ ویژدان.هه‌مین=هه‌میشه.

(١١١)

عـــــه‌زیزان مــــا گرفتـــــار دوو ده‌ردیــــــم
یـــه‌کیْ بـــه‌د نه‌قـــشی ودیگـــه‌ر کـــه فـــه‌ردیم
نه‌صـــیب مـــا نـــه‌بوود کـــه مـــا تـــه وینـــه‌م
جـــه‌مالْت یـــه‌ك نـــه‌زه‌ر نادیـــده مـــردیم

به‌د نه‌قشی=ناشرینی یـان حـالْ په‌ریـشان. نـه‌بوود=نـه‌بو. ته‌وینـه‌م= تـۆ ببینم. نه‌زه‌ر =ته‌ماشا، چاو پیْ که‌وتن.نادیده=بیْ دیتن.مردیم=مردین.

واتـه:-خۆشه‌ویـستان مـن بـه ئـازاری دوو ده‌ردده‌وه گرفتـار بوومـه‌و ده‌تلیْمـه‌وه، یـه‌کیْکیان ناشـرینی و په‌ریـشانی حـالْ ئـه‌وی تـر تـه‌نیای لـه‌م دونیایه‌دا، وا دیاره قسمه‌تی ئیْمه نه‌بووه شاد بین به دیتنی جه‌مالْی تـۆ، به بیْ دیتـه‌نی جـه‌مالْت ئه‌گـه‌ر بـوو یـه‌کجاریش بیْـت وا ده‌مرین.هـه‌ر چـه‌ند گۆششی زوورم کردوه له‌م دونیایه‌دا و ئه‌وینی توو بووم.

باباتاهیرلـــه‌م چـــوارینه‌یه‌دا نائومیـــدی پیـــشان ده‌دات لـــه جۆشـــی ئه‌وینداریداکـه گرفتـاری بـووه وه‌ك خـۆی ده‌لیْـت وه‌لـه ڕاده‌ی خـاوین کردنـه‌وه‌ی رووح دایـه بـه ئـازاردانی جه‌سـته ودامرکانـدنی ده‌روون بـۆ

گەیشتن بە پلەی کەمال وشادومانی هەمیشەیی هەر چەندە تەمەن وا لە کۆتایدایە و لە دونیایەکی غەم وماتەمیدا دەژێت .
ئەحمەد تاقانەش لە لا٤٩٧دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوزە:-

ئـــەزیزان ئێمـــە گـــیرۆدەی دوو دەردیـــن
یـــەکیٚ بـــەد شـێوەیی ویـــەك تاکـــە مـــەردین
بەشـــــی ئێمـــــە نـــــەبوو داتـــــۆ ببیـــــنین
جوانیتمـــــان نـــــەدی جارێـــــك و مـــــردین

(١١٢)

گولـــــستان جـــــای تـــــۆ ئـــــەی نـــــازەنینم
مـــو دەر گولْخـــەن بـــە خاکـــستەر نـــشینم
چـە دەر گولْـشەن چـە دەر گولْخـەن چـە صـەحرا
چـــو دیـــدە وا کـــەم جـــز تـــۆ نـــەوینم

خاکستەر=خۆڵەمێش.واکەم= هەڵبێنم.صەحرا= بیابان.چو دیدە وا کەم =چۆن چاو هەڵبێنم. جز تە =غەیرە تۆ.
دڵزار لەلا٧٣دا کردوویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

گولْـــشەن جێـــی تۆیـــە ئـــەی نـــازەنینم
منـــیش لـــە گولْخـــەن مـــشکی نـــشینم
چ لـــە گولْـــشەن وگولْخـــەن وصـــەحرا
کـــە چـــاو هـــەلێنم هـــەر تـــۆ ئـــەبینم

ئەحمەد تاقانەش لەلا٥٠دا کردویە بە سۆرانی.

(١١٣)

شــــەوان ئەســــتارەکان یــــەك یــــەك شمــــارم
بــــوە نیمــــە شــــەوان گــــۆش واتــــە دارم
پــــەس ئــــەز نیمــــە شــــەوان کــــە تــــە نیــــائی
بــــوران ئەشــــك ئــــەز دیــــدە ببــــارم

ئەستارەکان= ئەستیرەکان.شمارم=دەژمێرم.گۆش=گوێ.گۆش وا تە دارم=گـوێ ڕاگـرم بووتـو .پـەس=بـەلاَم.کـە تـە نیـائی= کـە تـوو نەهاتی.بوران=باران .ئەشك=فەرمێسك.

ئەحمەد تاقانە لەلا٥٠دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

شــــەوان یــــەك یــــەك مــــن ئــــەژمێری ســــتێرم
دەبێتــــە نیــــوە شــــەو گوێــــت لێ دەدێــــرم
لــــە دوای نیــــوە شــــەواندا بەتــــەنێ بم
بــــە چــــاودا تــــۆفی ئەســــریناو دەنێــــرم

(١١٤)

زە عــــشقت ئاتەشــــێ دەر بۆنــــە دیــــرم
دەر ئــــان ئاتــــەش دڵ وجــــان ســــووتە دیــــرم
سەگت گەر پا نەهد بەر چەشمم ئەی دووست
بــــە موژگــــان خــــاك راهــــش ڕووتــــە دیــــرم

دیرم=هەمە.سووتە=سوتاو.پا نەهد= پێ بنێتە.خاك ڕاهش=خاکی ڕیگای.دەر بووتە=لە ناو سنگمدا.سەگت=سەگی تۆ.

واته لەعیشقی تۆدا ئاگرێك بۆتەوە لە سنگدا ئەی یار، لە ناو ئەو ئاگرەدا گیان ودڵم دەسووتێت، ئەگەر سەگی تۆش پێ بنیت بە سەر چاواندا ئەی دووست لە بەر خاتری تۆ چاوان دەكەم بە خاكی ڕێی.

(١١٥)

هـــەزاران غـــەم بـــە دڵ ئەندۆتـــە دیـــرم
بـــە ســـینە ئاتەشـــێ ئەفرۆتـــە دیـــرم
بەیـــەك ئـــاهێ ســـەحەرگاه ئـــەز دڵ تـــەنگ
هـــەزاران مـــودەعی را ســـووتە دیـــرم

ئەندووتـــە=غـــەم(غـــەمی تـــۆ).ئەفرۆتـــە=رونـــاكی (رونـــاكی تۆ).مودەعی=داواكار.

(١١٦)

كـــافرم گـــەر منـــی ئالالـــە كـــارم
كـــافرم گـــەر منـــی ئـــابش بـــدارم
كـــافرم گـــەر منـــی نـــامش بـــرە نـــام
دوو ســـــەد داغ دڵ ئـــــەز ئالالـــــە دارم

ئالالـە كـارم=ئـەو گوڵـە بـچێنم.ئـابش بـدارم=ئـاوی بـدەم.نـامش بـرە نام=ناوی بێنم.

باباتاهیر توورە بوە لە گوڵاڵە سوورەكەی كـە ئەوینداریتی چـونكە هـەر بە دوایدا دەگەرێ و نایبینێتەوە یان ئەو خۆی پیشانی نـادات بۆیـە داخ لـە دڵە، وەك دەڵێت جارێكی دی گوێی نادەمێ.

(١١٧)

غــــەم عالــــەم هەمــــە كــــەردی بــــەبارم
مەگــــەر مــــو لــــوك مەســــت ســــەر قــــەتارم
مــــەهارم كــــەردی ودادی بــــە ناكــــەس
زەدی تــــۆ هــــەر زەمــــان بــــاریٚ بــــەبارم

لوك = رنگ سوور، سەنگەسەری. قەتار=كاروان.مەهان=دتوەستا، محكوم بەستن، هەوسار.

ئەحمەد تاقانە لەلا١٥١دا كردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

خەمی گیٚتیت هەموو كردووتە بارم

مەگــــەر مــــن (لــــوك) ی مەســــتی ســــەرقەتارم
منــــت هەوســــار كــــرو دا دەســــتی ناكــــەس
هــــەموو دەم بــــار دەكــــەی بــــاریٚ لــــە بــــارم

وە لە نیوە دێری كۆتایدا لە كتێبەكەی وەحید دەستكردی وەریگرتووە لەجیاتی (زەردی تۆ) (فزودی) نوسیوە.

(١١٨)

دلارا بــــــیٚ تــــــۆ زارو نــــــا تــــــوانم
جگــــەر پــــڕ خــــارو پــــڕ خــــەس دیــــدەكانم
هــــەمان دوســــتان كــــە واتــــە بــــو بگــــەردەن
كــــەنونش چــــون مەگــــەس بــــەر ســــەر زەنــــانم

پڕخار=پڕ درك.پڕ خەس= پڕ كەستەك(كلۆی بەرد). نونش=ناوو نیشان.زەنانم=دامناوە.مەگەس=سەرین.

رازی لە لا ٤٩ گۆریویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی بەم شێوەیە:.

خۆشەویـــستم بـــێ تـــۆ زر و حـــەزینم
جگـــەر ســـەد پـــارە دیـــدە گـــرینم
ئـەو دەســتەی لەسـەر گـەردنی تـۆ بـوون
خـــستومە ژێـــر ســـەر وێنـــەی ســـەرینم

واتە : ئەی دولبەرەکەی من دونیام بێ تۆ زاریە جگەر پڕ بووە لە دڕك وکەستەك مەگەر تۆ هەر یارەکەی جاران نیت؟واتە وەرە پێکەوە سەیرانێك بکەین، کە من یادگاریەگانی تۆم هەمیشە وەك سەرین لە بن سەرم داناوە، بۆ ساتێکیش بێت خۆتم پێ پیشان بدە تا دڵم داکەوێ.

(١١٩)

هـــەزاران موڵـــك دونیـــا گـــەر بـــدارم
هـــەزاران موڵـــك عـــەقبی گـــەر بـــدارم
بـــورە تـــە دولبـــەرم تاکـــەی ئـــایم وشـــەم
کـــە بـــێ ڕووی تـــۆ ئـــان را گـــەرد بـــدارم

عەقبی=دوا رۆژ.ئایم=بێم. شەم=مۆم. بۆرە=وەرە.

واتـە : هـەزاران مـوڵکی دونیـام هـەبێت ئیستا ئەگـەر دوا رۆژ، ناگاتـە دیدارێکی تۆ، وەرە ئەی دولبەرم تاکەی من هەر بێم و وەك مۆم بتوێمەوە، ئەگەر ئەو ڕێگایەی گرتومەتە بەر بە بێ تۆخاکم بە سەر.

(١٢٠)

جگـــەر پـــڕ دەرد تاکـــەی ئـــایم و شـــەم
زە وەصـــڵت فـــەرد تاکـــەی ئـــایم وشـــەم
چـــرا گـــوئی کـــە دەر کـــوێم نـــەیائی
مـــو تاکـــەی بـــا ڕەخ زەرد ئـــایم وشـــەم؟

فەرد=تاك، تەنها. کوێم=گەرەك، کوڵان. رەخ زەرد= ڕەنگ زەرد

(۱۲۱)

بووره یەك شەو منەوەر كون و ثاقم
مو ئەهل دەر میحنەت و دەرد و فیراقم
بە تاق جفت ئەبرۆی تە سوكەند
كە مو جفت غەمم تا ئەز تۆ تاقم

وثاقم=ژیانی دیلی و یەخسیری.منەوەر كون= ڕووناكی بكەوە .موئەهەل دەر= مۆڵەت بدە .جفت=جووت.میحنەت=سەر لێ شێواوی.فیراقم=جودایی.سوكەند=سویند .بە تاق=بە تاكە تاقم=یەكبوون.

(۱۲۲)

مو ئان بەحرەم كە دەر ظرف ئامیدەستم
چو نوقتە بەر سەر حەرف ئامیدەستم
بە هەر ئەلفی ئەلف قەدی بەر ئایە
ئەلف قەدم كە دەر ئەلف ئامیدەستم

ئەحمەد تاقانە لە لا٤٥دا كردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

من ئەو بەحرەم لە جاما هاتمە گۆڕێ
وەكوو نوقتە لە پیتا هاتمە گۆڕێ
بەهەر ئەلفێ ئەلف قەددی پەیایە
ئەلف قەددم لە ئەلفا هاتمە گۆڕێ

(*) زۆر لێكدانەوە هەیە دەربارەی ئەم چوارینەیە، وەك لێكدانەوەكانی (میرزا مەهدی خانی كەوكەب لە گۆڤاری مجمع اسیای بنگالە ژ٢ ساڵی١٩٠٢ ی.ز.، وەمجمع الفصحاء ی ماموستا علاء الدین سجادی، د. مارف خەزنەدارلە مێژووی ئەدەبی كوردیدا، فەهمی كاكەیی لە گۆڤاری

م. کورد ژ۱۱و۱۲دا).وه هەر یەکەیان بۆ چوونێکی هەیە، وەك لە مێژووی ژیانی باباتاهیردا باسمان کردوه، بەلاّم بەڕای من بۆ چوونەکانی فەهمی کاکەیی لە ناخی بیرو باوەری سۆفیگەری باباتاهیرەوە نزیکە.

باباتاهیر خۆی بە دەریا دەشوبهێنی، کە دەریا زۆر نهێنی تیایە، جامە مەبەستی دۆنای دوونە، کە ئەو وەك پێویستێکی ئەو کاتە لەو دۆنەیەدا پەیدا بووە، چۆن خالْ پێویستەبۆسەر پیت، وە بە پێی بڕوای ئەو هەر هەزار سالْ جارێك یەکێکی ئاوا پەیدا دەبێت وەك پێویست.وەدەلێت من یەکێکم لەوانە کە لەم هەزارەیەدا پەیدا بووم .(بابا فریشتەی چوارەمی بابا خۆشینە کە نۆی کەرەوەی بیرو باوەری یارسان بووە لە سەدەی چوارەمی کۆچی وکۆتایی سەدەی پێنجەم).

(۱۲۳)

مو کە چوون ئوشترم قانع بە خارم
خوراکم خارو خەرواری بە بارم
ئەز ئین خورج قەلیل وبار سەنگین
هەنوز ئەز ڕوی مالك شەرمەسارم

ئوشتر=ووشتر.خار=دڕك.خورج=هەکبە، جوالْ.قەلیل=کەم.سەنگین= قورس. هەنووز=هەمیشە. شەرمەسارم=سەرمەزارم. مالك = مەبەستی پەروەردگارە.

دلزار لە لا٥٣دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

کە من وەك حوشترم قانع بە خارم
خوراکم دڕك و خەرواریکە بارم
لە بەر ئەم خورجە سووکە وبارە قورسە
لە رووی خاوەن هەموو دەم شەرمەسارم

شیخ مەحەمەد خاڵە لا ٢٠ دا دەڵێت : شیعری دووەم لەم چوارینەیەدا بە هەڵە تەرجەمە کراوە، چونکە کە خەرج سووك وبار قورس، ئیتر جێی شەرمەزاری نامێنێ، شەرمەزاری کاتێك دەبێ کە خەرج زۆر وبار سووك بێ، کە واتە شیعری دووەم لە جیاتی وتەی لەبەر دەبێ لەگەڵ بێ بەم ڕنگە:

لەگەڵ ئەم خەرجە سووکە وبارە قورسە
لە رووی خاوەن، هەموو دەم شەرمەزارم

(*) باباتاهیر خۆی دیتە بەر چاو کە ئەرکێکی زۆر قورسی لە سەر شاندایەبۆ ئەنجام دانی، وە خۆی بە کەم تەرخەم دەزانێ بەرامبەر پیروانی ڕێبازەکەی، هەر چەندە زۆر بە سەبرو ئارامە و نەدارایە، بۆیە دەڵێت وەك ووشتری بیابان قانعم بە درِك گەر خاوەن (مەبەستی پەروەردگارە) رازی بێت لێم، ئەو ئەرکەی سەر شانی بە قەوارە بچووك دیارە بەڵام لە ناوەرۆکەوە زۆر سەنگینە.

وە لە ڕێبازی سۆفیگەریدا تاکە کەسی سۆفی بە ساکاری دەژیت و دەست لە خۆشی ژیان هەڵدەگرێت بەڵام مەرجەکانی (عەهدوپەیمانە) بۆ گەیشتن بە ئامانج زۆر قورسە.

(١٢٤)

بشم واشم زەئین عالەم بەدەرشم
بشم ئەز چین وماچین دوورتر شم
بەر دڵدار پەیخامێ فەرستم
کە کردوری خۆشە من دوورتر شم

بشم=دانیشم.واشم=سالم بم. بەدەر شم=بچمە دەرەوە. دوورترشم=دوورتربمەوە. پیخامێ=سەلاوێ. فەرستم=بگات.

د.مارف خەزنەدار لە لا ٢١٩دا بەم شێوەی خوارەوەی نوسیوەتەوەلە مێژووی ئەدەبی کوردیدا:-

بـــشوم واشـــوم ئـــەزین عالـــەم بەدەرشـــوم
بـــشوم ئـــەز چـــین وماچـــین دیرتـــر شـــوم
بـــشوم ئـــەز حاجیـــا حـــەج بپرســـوم
کـــە ئـــین دیـــری بـــە ســـە یـــا دیرتـــر شـــوم

واتەکەی:

هـەوڵ دەدەم کـە لـەم گێتـی یـە بـچمە دەرەوە
لـــە چـــین وماچـــینیش دوورتـــر بـــڕۆم
لـە ڕێـیْ سـەفەردا لـە حـاجی یـان دەپرسـم
ئەمەنـــدە دووری بەســـە یـــا دوورتـــر بـــڕۆم

هەر وا دەڵێت:بابا تاهیر دەیەوێت لەم گێتی یەدا بە بێ قیامەت بچیتە دەرەوە، دوور بڕوا زۆر دوور.

رازیش لە لا ٤٧ دا گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی.

(١٢٥)

تـــو خـــود گرفتـــی مـــو مـــەللاح مـــانم
بـــە ئـــاب دیـــدەکان کەشـــتی بـــرانم
هـــەمی ترســـەم کـــە کەشـــتی غـــەرق وا بـــوو
دەر ئـــین دەریـــای بـــێ پایـــان بمـــانم

مەللاح مانم=کەشتی وانم. پایان=کوتاه.بمانم=بمێنم

بابا لێرەدا پرسیارو سەر سورمان ئاراستەی مەعشووقەکەی دەکات کە ئەو دەستوری داوەتێ رابەرایەتی ڕێبازە پیرۆزەکەی بکات وەك چاوانی

خۆی پاریزگاری بکات به مەرجێك ئەو پشتیوانی بێت، بۆیە دەترسێ ئەو کەشتیەی کەشتیوانی دەکات غەرق بێت به تەنها یی لە بیابانی بێ پایان بمینیتەوە.

(١٢٦)

بـــووره ســــووته دلان تــــا مــــا بنــــالێم
بیـــا پەروانــــه بــــه مــــا تــــا بنــــالێم
زه عــــەقلێ ئــــان گــــولێ رەعنــــا بنــــالێم
زه دەســــت یــــار بــــێ پــــەروا بنــــالێم

سووته دلان= دلسوتاوان. تا ما =با ئێمه.بەما=بۆلای ئێمه.

واته:-

وەرن ئــەی دلێ ســەتاوان بــا پێکــەوه بنــالێن
وەرن ئــــەی پــــەپولان بــــا پێکــــەوه بنــــالین
لــه بــەر بــیرو هۆشــی ئــەو گــولێ رەعنایــه بنــالین
لــــه دەســــت یــــاری بــــێ پــــەروا بــــا بنــــالێن

(١٢٧)

مــو ئــان مەســتەم کــه پــا ئــەز ســەر نەزوونــەم
ســــەرو پــــائی بــــەجز دولبــــەر نەزوونــــەم
دلارامــــــێ کــــــز و گــــــیرد دلێ ئــــــارام
بــــه غــــەیره ئــــەز ســــاقی کــــەوشــــەر نەزوونــــەم

کز=داماو.بە جز=بەقەواره.گیرەد=دەگرێ نەزوونەم=نازانم

واته:-(من ئەو مەستەم لە رێی عەشقی ئەو خودایه کە سەرا نسەری نازو نیعمەتی دونیا بەهیچ نازانم، تەنها سەر مەستی ئەوپارەم، ئەو دولبەرەم، ئەو دلارامەی دڵی من بە داماوی وکزی هێورو ئارام دەکاتەوه من غەیره

ئەو کەسی تر ناناسم ئاوی کوسەر بداتە دەرخواردم، هەر بە خۆی ساقی کەوسەرە.)

(١٢٨)

شـــویٚ نـــاڵم شـــەویٚ شـــەوگیر نـــاڵم
زە دەســـت یـــار بـــیٚ تـــەدبیر نـــاڵم
گـــەهی هەمـــچوون پلٚـــنگ تـــیر خـــوردە
گـــەهی چـــوون شـــیٚر دەر زنجـــیر نـــاڵم

گـەهی =جـاریٚ. هەمـچوون=بەشیٚوەی.تـیر خـوردە=تـیر لیٚ دراو.شـەو گیر=شەوارە بوو.

واتـە:-(شـەویٚك گریـان و ناڵـەم دیٚـت شـەویکی تـر شـەوارەم کردبـیٚ دەنـاڵم، هـەموی لـە دەست یارو مەعـشوقە بیٚ تەدبیرەکـەی خۆمـە، ئـەو بـارەی مـن جاریٚکیـان وەك پلٚنگیٚکـی برینـدار بـە تـیر دەگـریٚم دەنـاڵیٚم، جاریٚکیان وەك شیٚریٚکی بەند کراو بە زنجیر هاوار دەکەم ودەناڵیٚنم.)

ئەحمەد تاقانە لە لا٣٦دا بەم شیٚوەی خوارەوە کردویە بە سۆرانی:-

ئـــەناڵم شـــەو، شـــەوگیر ئـــەناڵم
لـــە دەســـتی یـــاری بـــیٚ تـــەگبیر ئـــەناڵم
گـــەهیٚ هـــەر وەك پلٚنگـــی تـــیر خـــواردوو
گـــەهیٚ وەك شـــیٚری نـــاو زنجـــیر ئـــەناڵم

(١٢٩)

فەلـــەك پـــڕ هـــەم زەدی ئـــاخر ئەساســـم
زەدی پـــڕ خـــومرەی نیلـــی لیباســـم
ئەگـــەر داری بـــەرات ئـــەز قەســـد جـــانم
بکـــون ئـــاخر ئـــەز ئـــین دونیـــا ئەساســـم

خومرەی نیلی=ڕەنگی نیلی، پێشان بە مادەی چوێت جل و بەرگیان شین دەکرد، بە تایبەت لە باری غەمباریدا.

فەهمی کاکەیی بەم شێوەیە وەری گێراوەتە سەر سۆرانی:-

فەلـــــەك تێکـــــت دا بنـــــچینە و بناغـــــەم
کێـــشات لـــە خـــومی کـــەوە جـــل و بـــەرگم
ئەگـــەر دەتـــەوێت قەســـدی گیـــانم بکـــەیت
دە هەڵکەنـــــە لـــــەم دونیایـــــە بناغـــــەم

هەروا دەڵێت :-بابا مەبەستی ئەوەیە کە دەڵێت خودایە مەمخولقێنە یان کە دەمخولقێنی بوچ هیندە نەگبەتی وئاوارەییم بە سەردا دەبارێنی وسەرئەنجام لە خەفەتدا دەمکوژیت .

ئەم نارەزاییە باری یاخیبوونی بابا پیشان دەدات، یاخیبوونیش بە گوناه لە قەلەم دەدات، ریشەی ئەم یاخیبوونەش دەگەڕێتەوە بۆ حەواو ئادەم کە ئەوانیش بێ قسەی خوایان کرد و لە بەهەشت دەرکران.

(١٣٠)

مـــو کـــە مەســـت ئـــەز مـــەی ئـــەنگور باشـــم
چـــــرا ئـــــەز نـــــازەنینم دوور باشـــــم
مـــو کـــە ئـــەز ئاتەشـــت گـــەرمی نەوێنـــەم
چـــرا ئـــەز دوود میحنـــەت کـــوور باشـــم

مـــەی ئـــەنگور=شـــەرابی تـــرێ، ئاتـــەش= ئـــاگر، دوود= دوکـــەڵ، کوور=کوێری، باشم=ببم

رازی لە لا ٧٥ دا گۆریویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی بەم شێوەیە:.

منــی بــێ مــەی و بــێ بــادە مەســتم
لــە دولبــەر جــورم بــێ هــۆش و هەســتم
لـــە نـــاو ئـــاگر هەســـت ناکـــەم گـــەرمێ
بـــەلاّم تێنـــی عیـــشقە نـــاو دڵـــی گەســـام

واتە :-باباتاهیر وەسفی باری خۆی دەکات کە بە شەرابی ترێ مەست دەبێ.بۆ دەبێ لە یار بەدوور بێت؟ئەگەر لە ئاگری یار گەرمی کاری تێ نەکات، ئەی بوو لە دووکەڵی میحنەت کوور ببێ؟

ئەمەش خۆی لە خۆیدا فەلسەفەیە، دەگەڕێتەوە بوو چیرۆکی سەیدەی شیانی ناو یارسان.

(١٣١)

ئیلاهـــــی دوشمنـــــت را خەســـــتە وینـــــەم
بەســـینەش خەنجـــەرێ تـــا دەســـتە وینـــەم
ســـــەر شـــــەو ئایـــــەم ئـــــەحواڵش بپرســـــەم
ســـــەحەر ئایـــــەم مـــــەزارش بەســـــتە وینـــــەم

خەسـتە=نـەخۆش. وینـەم= دەبینـم .سـەر شـەو =سـەر لـە ئێـوارە.
مەزارش=گۆڕی. بەستەدا خراو.تا دەستە =تا دەسکەکەی.

رازی لە لا ٢٤ دا گۆیویەتی بۆ زاری سۆرانی بەم شێوەیە:.

دوژمنـــی گیانـــت واپەرێـــشنا بـــێ
جـــەگی ئەنجـــەنی دەمـــی دەبـــان بـــێ
ســـەر لـــە ئێـــوارە هـــەواڵ پرســـی بـــێ
بایـــانی لاشـــەی لـــە گۆرســـتان بـــێ

بابا دەڵێت :-خودایە ئەوانەی لە ڕێی ڕاست لایان داوە دوژمنی توون، بە نەخۆشیان دەبینم. خەنجەرێکی ژەهراوی چەقیوەتە سنگیانا تا بن دەسکەکەی، ناخیان ڕەشە.سەر لە ئێواران کە دەمەوی ئەحواڵیان بپرسم کەچی لە سەحەردا دەبینم گۆڕەکانیان داخراوە . واتە ئوانە بە زیندووی مردوون لە ژیانداولە قیامەتدا ڕوو ڕشن.

(١٣٢)

ئەگەر مەستان مەستیم ئەز تە ئیمان
ئەگەر بێ پاوو دەستیم ئەز تە ئیمان
ئەگەر هەندو ئەگەر کەبر ئەر موسڵمان
بەهەر میللەت کە هەستیم ئەز تە موسڵمان

ئەز تە ئیمان= بە تۆ ئیمانمان هەیە.هەند=هندووس( د.مارف خەزنەدار بە زەردەشتی لە قەڵەم داوە).کەبر =گاور.هەستیم=ببین

لە مێژووی ئەدەبی کوردی د.مارف خەزنەدار لەلا٢١١دا بەم شێوەیە هاتوە:-

ئەگەر مەستانی مەستیم ئەز تە ئەیمون
ئەگەر بێ پاو دەستیم ئەز تە ئەیمون
ئەگەر گەوریم و تەرسا و موسوڵموون
بەهەر میللەت کە هەستیم ئەز تە ئەیمون

بە سۆرانی:

ئەگەر مەستی مەستانیش بین لە تۆ ئیمان داوا دەکەین
ئەگەر بێ پێ و دەستیش بین لە توچ ئیمان داوا دەکەین
ئەگەر زەردەشتی ودیان و موسوڵمانیش بین
لە سەر هەر مەزهەبێك بین لە تۆ ئیمان داوا دەکەین

لیرەدا باباتاهیر دڵسووزی خۆی بۆ خۆشەویستی خودا پیشان دەدات، کە لە هەر بارێك و لە سەر هەر ئاینیك بێت هەرلە ئەو ئیمان داوا دەکات.

(١٣٣)

دلاٚ چـــــوونی دلاٚ چـــــوونی دلاٚ چـــــوون
هەمــە خــوونی هەمــە خــوون هەمــە خــوون
زە بـــــەهر لـــــەیلیٚ ســـــەمین عـــــوزاری
چــو مــەجنونی چــو مــەجنون چــو مــەجنون

دلاٚ=ئەی دلٚ. زە بەهر= لە عیشق.سیمین=زیوین. عوزار= هۆ، وەسیلە.
ئەحمەد تاقانە لە لا۳۷ دا کردوویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:

دڵــو چــوونی، دڵــۆ چــوونی، دڵــۆ چــوون
هـەموو خـوونی، هـەموو خـوونی، هـەموو خـوون
لـــە بـــەر لەیلایـــەکی ســـەر گوڵمـــە زیـــوین
وەکـــوو مـــەجنوونی وەك مـــەجنوونی، مـــەجنوون

هەروەها رازیش لە لا ۷٥ دا گۆریوەیەتی بۆ سۆرانی.

(١٣٤)

خوشـــا ئانـــان نـــە ســـەر دارن نـــە ســـامان
نـــشینەن هـــەر دوو پـــا پێـــچین بـــە دامـــان
شـــەوو رۆژان ســـەبوری پـــێش گیرەنـــد
بـــــەیاد رووی دڵـــــداران مـــــەدامان

پا پێچین بە دامان= چوار مشقی دادەنیشن،
واتە=خوشە ژیانی ئەوانەی نە ماڵیان هەیە نە سامان، هیچ غەمیان نیە، بۆ خۆیان چوار مشقی ودەستە زرانی دانیشتوون، بە دلٚ سەبووریەوە یادی ڕۆژی دڵداری خۆیان دەکەن

(١٣٥)

بەعالـــەم کـــەس مـــەبادا چـــوون مـــن ئـــائین
مـــە ئـــا یـــین کـــەس مـــە بـــر دەر دیـــن وئـــایین
هـــــەر ئانکـــــە حـــــالْ مـــــوش بـــــاوەر نمیبـــــوو
مـــو ئـــایین بـــیْ مـــو ئـــایین بـــیْ مـــو ئـــایین

مـەبادا=نـەوەکو.ئـائین=شـك ودوودڵـی. مـەبر=بـیْ تـاوان. مـوش= مشك.ئایین=ڕێباز .

(١٣٦)

بـــوره ئـــەی دلْ، بـــوره یـــاری پەشـــیمان
مەکـــە کـــاریْ گـــز ئـــان کـــەردی پەشـــیمان
بـــــەدوو روزی بـــــەناکامی دەر ئـــــاریم
باشـــە روزی کـــەگولْ چـــینم بـــە دامـــان

بوره=وەره.گز ئان=ڕادەی ئەو.دەر ئاریم=دەر دەچین، بەجیْ دەهیلین.

(٠) واتە:-

وەره ئـــــەی دلْ وەره یـــــاری پەشـــــیمان
کـــاریْ وامەکـــە وەك ئـــەوەی بـــوی، پەشـــیمان
بـــەدوو ڕۆژ لـــە ناکـــاودا ســـەر دەنێنـــەوە
باشـــە ڕۆژ گـــولْ بـــچێنین بـــە دامـــێن

ڕازیش لە لا ٧٥ دا گۆڕیویەتی بۆ سەر زاری سۆرانی.

(١٣٧)

دلْـــم ئـــەز دەســـت تـــە نـــالاْن نـــالاْن
ئـــان دەرون دلْـــم خـــون گـــشتە پـــالاْن
هـــەزاران قـــەول بـــا مـــن پیـــشە کـــەردی
هەمـــــە قـــــەولان تـــــە بـــــالان بـــــالان

پالاْن=جۆشان.بالان=درۆن(مەهاباد لا٩٠ ).

واتە:-

دڵــم لــە دەســتی تــوو دەنــاڵێی ودەنــاڵێی
ئــەو دەرونــەی دڵمــی لــە خوینــدا جوشــان
هــــەزاران قــــەولت بــــۆمن کــــردە پیــــشە
هــــەمو ئــــەو وەعدانــــەی تــــۆ درۆن درۆن

(١٣٨)

بــــێ تــــوو تەلواســــە دیــــرم بــــووره بــــوێن
زەهــــر دەر کاســــە دیــــرم بــــووره بــــوێن
مــیم خــون، گریــە ســاقی، ناڵــە مــوترب
مەصــائب ئــین ســە دیــرم بــووره بــوێن

تەلوا=موسیبەت.میم خون=جۆشی خوێن.سە= سێ
واتە:-

بــــێ تــــوو گــــرفتم هەیــــە وەرە بــــبین
ژار لــــــە کاســــــەمدایە وەرە بــــــبین
خــوێن جــولان، گریــانی ســاقی، ناڵــەی مــوترب
ئــەم ســێ موســیبەتە م هەیــە وەرە بــبین

(١٣٩)

بیــا جــان دڵ پــڕ دەرد مــن بــین
سرشــك ســورخ ڕەنــگ زەرد مــن بــین
غــــەم مــــەهجوری ودەرد ســــەبووری
بیــا بــەر جــان غــەم پــەروەردە مــن بــین
سرشك=فەرمێك.سورخ=سوور.من بین=من بووە.

واتە:-

وەرە گیانــــە وەرە لام، دڵـــم پـــڕ دەرد بــــووە
فەرمێسکی خـوێنین، لەگـەڵ ڕەنگـی زەردی مـن بـووە
لــــە غـــــەمی هیجـــــران، دەردی ســـــەبووریم
وەرە گیـانم ببینــەس، پــەروەردەی غــەم بــووە

(١٤٠)

ئەگـــەر دەســـتم رەســـد بـــە چـــەرخ گـــەردوون
ئـەز ئـوو پرسـەم ئـین چونەسـت وئـان چـوون
یـــەکی را دادەئـــی ســـەد کونـــە نیعمـــەت
یـــەکی را قـــورس جـــوو ئـــالوودە دەر خـــوون

رەسـد=دەگاتـە.دادەئـی=داوتـە.سـەد کونـە=سـەد جـۆر.یـەکی را=بەیەکی. قورس=نان. ئالوودە دەر خوون=خەڵتان خوێن.

دلزار لە لا٣١دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

ئەگـــەر دەســـتم بگاتـــە چـــەرخی گـــەردوون
ئەپرســـم لێـــی کـــەوا ئـــەم چـــۆنە و ئـــەو چـــۆن
یـــەکیٚ پێـــت داوە ســـەد جـــۆر نـــازو نیعمـــەت
بـــە یـــەکێکیش نـــانی جـــۆی ئامیتـــەی خـــوون

فەهمی کاکەی لەلا٩١دا دەڵێت :- باباتاهیر ئەو نانەی پەیدا کردوە خوێنی بۆی ڕشتوە، خۆی ماندوو کردوە....ئەمەش بەڵگەیە کە بێدادی ونارەوایی ئەو سەردەمەی بابا تێدا ژیاوە.

بۆ زیاتر روون بوونەوە بروانە لا ١١ لەم کتیبەدا.

(١٤١)

تــە ســرور زان مــو ســەودای تــەوەرزان
گریبــان بلــەرزان واتــە لــەرزان
کفــەن دەر گــەردەنم ســەحرای مەحــشەر
هــەر ئــان وینــان ئــەحواڵ تــە پرســان

تە سرور زان= چونیەتی زانینی خۆشی، ورزان=لە سەودای تۆ رزیوم.وینان=دەبینن.پرسان=دەپرسنگریبان=گیرفان، یەخە.
لەرز=لەرزین.

واتە:- ئەو خەڵکە هیچ لە خەرواریاندا نیە، تەنها گەنج و سەفای دونیا نەبێت، کاتێك من دەبینن لە چ سەودایەکم بۆگەیشتن و بێنینی تۆ ئەوجا تۆیان بە بیر دێتەوە .

(١٤٢)

گــوڵی کەشــتم پــەی ئەڵوەنــد دامــان
ئــاوش ئــەز دیــدە دادم ســوبح وشــامان
وەقتــێ ئــان بــی کــە بــۆیــش وامــو ئــایی
بــەرە بــادش بــەرە ســامان بــە ســامان

گوڵی کەشتم=گوڵێکم چاند.سوبح و شامان= بەیانیان وئیواران.بویش وامو ئایی=بۆی هات بە لاما.بەرە بادش=با بردی، واتە لە دەستم چوو.

واتــە: لــە دامێنــی ئەڵوەنــدا خەرقــەی ســوفیگەری پووشــی، عیــشق و سەودایی خودایی لە مێشکی دا، لە زکر و مناجات و خوا ناسیدا گەیشتە پایەیەکی بەرز، بەڵام هیشتا نەگەیشتوە بە یار، بۆیە دەڵیت بەرە بادش بەرە سامان بە سامان.

(١٤٣)

زه یـــاد خـــود بیـــا پـــەروا کـــەریمان
ئـــەز وەکـــو ئیلتجـــا واکـــە پـــەریمان
کییـــە ئـــین تـــاب دارە تـــا مـــودارم
نـــەدارە تـــاب ئـــین ســـام نـــەریمان

ئیلتجا=پەنا بردن تاب=یاری.پەڕێمان=بۆمان. تا مودارم=تامنیش هەمبێ.واکە=بیکەرەوە.سام= کاریگەر.

(١٤٤)

بـــورە مننـــەت بـــەریم مـــا ئـــەز کـــەریمان
بگـــشیم دەســـت ئـــەز خـــوان لـــەئیمان
کـــەریمان دەســـت دەر خـــوان کـــەریمی
کـــە بـــەر خـــوانش نـــەزەر دارنـــد کـــەریمان

بورە=وەرە.کەریم=بەخشندە.نەزەر=چاو. لەئیمان=دڵ پیس.

سۆفیەکی عاشقی ڕێگای خوایی منەتی نیە بەم دونیایە، خۆشیو کەیف و سەفای بە لا خستوە، مننەت ناباتە بەر کینە لە دڵان، تەنها خـوای گەورەو بەخشندە نەبێت و مننەت باریەتی.

(١٤٥)

زه دەســـت مـــو کـــشیدی بـــاز دامـــان
زه کـــردارت نـــەبی یـــەك پەشـــیمان
روم ئـــاخر بـــە دامـــانی زەنم دەســـت
کـــە تـــا ئـــەز وی رەســـد کـــارم بـــە ســـامان

ئەحمەد تاقانە لەلا٥٢دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

لــــە دەســـتم دیـــس کـــە کێـــشاوتە تـــۆداوان
لــــە کــــردارت نــــەبی یــــەك جـــۆ پەشـــیمان
دەچـــم ئیـــدی بـــۆ داوێنیـــك دەبـــەم دەســـت
لــــەوی تــــاکو بگـــا کـــارم بـــــە ســـامان

(١٤٦)

دڵـــــم تـــــەنگ نـــــەدانم ســـــەبر کـــــەردەن
زەدڵ تـــــەنگی بـــــوم رازی بــــــە مــــــردن
زە شـــــــەرم رووی تـــــــەم ودەر حجـــــــابم
نـــــەدانم عـــــەرز حـــــاڵم واتـــــە کـــــەردەن

دلزار لە لا٨٩دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵ تـــــەنگم نێمـــــە هـــــیچ ئـــــۆقرە گـــــرتن
لـــــە بـــــەر دڵ تـــــەنگی رازیـــــم بـــــە مـــــردن
لـــــە شـــــەرمی رووی تـــــۆ، لەژێرپـــــەردەدام
نـــــازانم عـــــەرزی حـــــاڵ بـــــەیان کـــــردن

(١٤٧)

ئانکـــــە بـــــێ خـــــان وبـــــێ مانـــــە مـــــنم مـــــن
ئانکـــــە بـــــەر گـــــشتە ســـــامانە مـــــنم مـــــن
ئانکـــــە شـــــامان بانـــــدوە میکـــــرە رووز
ئانکـــــە رووزش چـــــو شـــــامان مـــــنم مـــــن

بەر گشتە سامان= بێ سامان، سامانی وون بوو. باندە میگرە=ئەمان گرێنی. شامان =ئێواران. ئانکە=ئەوەی. ڕوزش چو شامان= ڕۆژیشی وەك شەوانە.

(١٤٨)

پەشـــــيمانم، پەشـــــيمانم، پەشـــــيمان
كـــــاروانی بوێنـــــەم تـــــا پەشـــــيمان
مـــو ئـــان ئەســـپيدە بـــازم ســـينە ســـوهان
چـــراگاە مـــو بـــی ســـەر بەســـتەكوهان

ئەســـپيدە=ســـپيدەی بەيانـــە. ســـوهان= پـــاكی وموحەبـــەت.
چراگاە=چرادان، ئاگر ورۆشنايی.

ئەحمد تاقانە لەلا٥٣دا كردويە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

پەشـــــيمانم، پەشـــــيمانم، پەشـــــيمان
پـــە ياكـــەم كـــاروانیۛ بـــۆ وەچـــوونمان
لـــەبۆكـــەس مـــانی نـــابیۛ ئـــەم جيهانـــە
لـــە هيـــچە كۆڵـــە بـــاری بـــارە لێمـــان

هـــەروا لـــە دوو نيـــوە دێـــری دوايـــدا ئەحمـــەد تاقانـــە بـــەم شـــێوەی نوسيوەتەوە:

كـــەهن دونيـــا بـــەهيچ كـــەس مەمانـــدە
بەهـــــەر زە گولـــــە بـــــاریۛ ميكيـــــشيمان

(١٤٩)

برەنـــدم هەمـــچو يوســـف گـــەر بـــە زنـــدان
وەيانـــاڵم زەخـــم چـــوون مەســـت مەنـــدان
ئەگـــەر ســـەد باغـــەبان خەصـــمی نمايـــد
مـــەدام ئـــايم بـــە گـــەڵزار تـــو خەنـــدان

بره‌نـــدم=بمخه‌نـــه.هه‌مـــچو=به‌شـــێوه‌ى.زه‌خـــم= بـــرین.
خه‌صم=دوژمن.نماید=بنوێنى.

ئه‌حمه‌د تاقانه له‌لا٥٣دا كردویه به سۆرانى به‌م شێوه‌ى خواره‌وه:-

وه‌كـــو یوســـف ئه‌گـــه‌ر بمنێنـــه زینـــدان
بنـــالێم لـــه غـــه‌م وه‌ك ده‌رد مه‌نـــدان
ئه‌گـــه‌ر ســـه‌د باخـــه‌وان لـێم بـن بـه دوژمـن
هه‌میـــشه دێمـــه گـــوڵزارى توخه‌نـــدان

(١٥٠)

نـــه‌واى نالـــه غـــه‌م ئه‌ندوتـــه دونـــو
عیـــار قلـــب خـــالص بـــىَ تـــۆ دونـــو
بـــۆره ســـوته دلآن واهـــه‌م بنـــالێم
كـــه قـــه‌در ســـوته دڵ دڵـــسوته دونـــو

له مێژووى ئه‌ده‌بى كوردي د. مارف خه‌زنه‌دار له لا٢١٣دا به‌م شێوه‌ى خواره‌وه هاتوه:-

نـــه‌واى نالـــه غـــه‌م ئه‌ندوتـــه زونـــوو
عـــه‌یار زه‌ررى خـــالص پۆتـــه‌زونوو
بـــۆره ســـوته دڵـــوون هـــه‌م بنـــالێم
كـــه حـــاڵى ســـوته دڵ دڵـــسوته زونـــوو

واتاكه‌ى=

ئـــاوازى نالـــه غـــه‌مخۆر ده‌یزانـــىَ
عـــه‌یارى زێـــڕى خـــالیس بۆتـــه ده‌یزانـــى
وه‌رن ئـــه‌ى دڵـــسووتاوان بـــا پێكـــه‌وه بنـــالێن
دڵـــسووتاو حـــاڵى دڵـــسووتاو ده‌زانـــىَ

ئینجا دەڵێت:-"بابا خۆی لە دڵداران جیا ناکاتەوە، هەمو کۆمەڵێك ئامانج ورەوشتی خۆی هەیە، تاکەکانی ئەو کۆمەڵەهەست بو ئازاری یەکتری دەکەن، چونکە بۆ یەك ئامانج هەوڵ دەدەن.

(١٥١)

دڵــــێ دارم کـــــە بـــــە هبـــــودش نمیبـــــو
نەســـــیحەت میکـــــەرم ســـــوودش نمیبـــــو
بـــــەیادش میـــــدەهم نـــــەش میبـــــەرد یـــــاد
دەر ئاتـــــــەش مینـــــــەهم دودش نمیبـــــــو

بەهبود= خۆشی، باشی.میدەهم= ئەیدەم.مینەهم= ئەینێم.نەش میبەرد= نا یبرد.دووود = دوکەڵ.

د.مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردی لە لا٢١٦دا ئەم چوارینەیەی نوسیوەتەوەلەگەل بەراورد کردنی لەگەل ئەوەی سەرەوە ئەم جیاوازیە هەبوو:- دارم=دیروم، میکەرم=میکەروم، دەر ئاتەش=بە ئاتەش. ئینجا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵـــێکم هەیـــە قـــەت حـــاڵی چـــاك نـــابێ
ئامۆژگـــاری دەکـــەم بـــەلاّم ســـوودی نییـــە
دەیدەمـــــە بـــــەر بـــــا بـــــەلاّم بـــــا نایبـــــا
دەیهاومە ناو ئاگر بەلاّم دووکەڵی نییە، ناسوتێ

هەر وا دەڵێت:- باباتاهیر سەر سام ماوە لە دەست ئەم دڵە یێ ناگا، نازانێ چییە. هیشتا هەر لە رێگایەو نەگەیشتوەتە(راستی)دڵەکە، ژیانی نەمریش بەلای ئەوەوە ئەوەیە کە تێیێ نەگاوهەر خەریك بێ بۆ ئەوەی تێی بگا، بەلاّم هیشتا تێشی نەگەیشتوە.

*= تێ نەگەیشتنی بابا تاهیر لە دڵی ئەوەیە کە شەیدای رێبازیکەوبە پەرووشی پێ گەیشتنی یارە غەیری ئەوە هیچی بەیاد نایەت بۆیە کە

دەیهاوێتە ناو ئاگر دووکەڵی نییە، ئامۆژگاری دەکات سوودی نییە، ئینجا دادیەتی لە دەستی چوون گیرودەی ئەو داوە بووەو رزگاری نابێت؟.ئەمەش یەکێکە لە سیفاتی تاکە کەسی رێبازی سۆفیگەری کە ئاوات وخواستی دڵ بەلاوە دەنێت لە پێناو نزیك بوونەوە و پێ گەیشتن بە پلەکانی کەمال.

(١٥٢)

نەسیمی کز بن ئان کاکل ئایو
مەرا خوشتر زە بۆی سونبل ئایو
چو شەو گیرم خەیاڵت را دەر ئاغوش
سەحەر ئەز بەستەرم بۆی گوڵ ئایو

دلزار لە لا ٩١دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-
نەسێمی کەوا لە بن کاکۆڵ دێ
لەلای من خوشترە لە بۆی سومبل دێ
بە شەو خەیاڵت بگرم لە باوش
لە سەر سەرینما سەحەر بۆی گوڵ دێ

کاکۆڵ= قژ، پۆپ، ئەگریجە. ئاغوش= باوش.خەیاڵت= تارماییت . بەستەرم=نوینم، نەسیم=شنە با.

د. مارف خەزنەدار لەلا٢٠٩دا دەڵێت:-"بیر کردنەوە لە مەعشووق زیکری شەوورۆژیشاعیر، بووە بە هۆی هەوێنی خەیاڵبازی و داهێنانێکی وێنەی جوانی کە هەرگیز پێش ئەو نەوتراوە.خۆشەویست دوورو نزیکیشە، ئەگەر چی ویساڵبەوێنە ماددییە بەلام لە راستیدا خەیاڵیە، شانوی ویساڵ لەسەر بارەگای خەیاڵی گیانە ."

مەعشووق=پیروانی رێبازە

(١٥٣)

سـەری دارم کـە سـامانش نمیبـو
غـەمی دارم کـە پایـانش نمیبـو
ئەگـەر بـاوەر نـەداری سـوی مـن ئـای
بـوین دەردێ کـە دەرمـانش نمیبـو

سوی من= لای من. نمیبو =نایبێ. نیەتی. سو= سبەی.
دلزار لە لا٧٥دا کردویە بە سۆرانی بەم شیوەی خوارەوە:-
سـەرێکم هەیـە سـامانی نیـە
غـەمێکم هەیـە پایـانی نیـە
گـەر بـروا ناکـەی وەرە ببینـە
ئـەو دەردەی کـەوا دەرمـانی نیـە
دوو نیوە دێری یەکەم لەلاپەڕەی ٢١٦دا بەم شێوەیە هاتووە
دلـێ دارم کـە بـەهبودش نمیبـو
نـسیحەت میکـەرەم سـودش نمیبـو

(١٥٤)

دلـێ دارم دەمـێ خـوررەم نمیبـو
غـەمی دیـرم کـە هـەرکز کـەم نمیبـو
خـەتێ دیـرم مـو ئـەز خوبـان عالـەم
کـە یـار بـێ وەفـا هەمـدەم نمیبـو

خـوررەم=خۆشـی، کامـەرانی.دارم، دیـرم=هەمـە.خـوب= بـاش.
چاك.خەت=ڕیگای دریژ، دێر.

واته:

دڵــێکم هەیــە دەمێــك کامــەران نابێــت
غــەمێکم هەیــە کەهــەرگیز کــەم ناکــات
ڕێگایــەکم لەبەردایــە لــە هــەمو جیهــان باشــتر
یــاری بــێ وەفــاش نابێتــە هــاودەمی مــن

مەبەستی بابا لە ریگا ڕێبازەکەیەتی، یاریش پیروانیەتی.

(١٥٥)

غــەم عیــشق تــە کــەی دەر ســەر ئــایو
همــائیٰ کــە بەهــەر بــووم و بــەر ئــایو
زە عیــشقت ســەر فــرازان کــام یــا بەنــد
کــە خــۆر ئــەوەڵ بــە کۆهــسارون بــەر ئــایو

بــووم وبــەر = بــەرو بــووم.همــائی=تــەیری هومــا، باڵنــدەی بەخت.کۆهسارون=کۆساران، چیانشین.بەر ئایو =دەردێت.

واتە=غەمی عیشقی توو ی بێ هاوتاکەی لە سەری هەر یەکێك دابێت، تووش وەك تەیری (هوما) لە هەر بەرو بومیکدا بنیشیتەوە، لە عیشقی تـودا سەر فرازان لە کام و خۆشەویستی خودادا پا بەند دەبن، وەك ڕۆژ کەیەکەم جار هەڵدێت بەر چیا و چیانشینەکان دەکەوێت.ئەمەش وەسفی پیروانـی ڕێبازەکەیەتی ئەوەندە خۆشەویستە لە دڵـی موریدانـە کـە هـەر دەرکـەوێت هەموو سەر گەرمی خۆشەویستی خودا دەبن بە زکرو مناجات و عبادەت.

(١٥٦)

بــــه وه اللـــــه كــــه جانــــانم تــــوئى تــــوو
بــــه ســــولْتان عــــەرەب جانــــانم تــــوئى تــــوو
نميدونــــەم كــــه چــــوونم يــــا كــــه چــــەندم
هەميدونــــەم كــــه دەرمــــانم تــــوئى تــــوو

سولتان عەرەب=مەبەستى پێخەمبەرە(د.خ).چونم يا چەندم=چۆنم يان چەندم(بە قەوارەو كێش). هەميدوونەم=هەر دەزانم.
واتە=باباتاهير روو لە پيرەكەى دەكات و سويندى بۆ دەخوات كە رووح و گيا نى ئەوە، وە بە پێخەمبەرى عەرەب سويند دەخوات كە نازانىٚ چوون وچەندئەوى خۆش دەوێت (واتە: خۆشەويستيەكەى بىٚ سنوورە)، هەر دەزانىٚ دەرمانى ئەو ئەوينەى هاتنى يارە(پيرەكەيەتى).

(١٥٧)

بــــەهارم بــــى خــــەزان ئــــەى گولْبــــەن مــــوو
چــــه غــــەم كەنــــده بــــەب وبــــيخ وبــــن مــــوو
بــــرەس ئــــەى ســــووته دلْ يەكــــدەم بــــدەر دەم
تــــەئى ئــــەمرووز دلْ تــــازه كــــون مــــوو

خەزان=گەلاٚ ريزان.كەندە=دەرى هيناوە.بەب و بێخ وبن=ڕەگ وريشەو ڕچەڵەك.يەكدەم بدەر دەم=جارێك دەرفەتێك بدە.
واتە=باباتاهير لەگەلْ پيرى ڕێبازەكەى دەدوێت و دەڵێت :"تەمەن بەرەو پيرى دەروات و كۆتاى عومرێتى، غەم دەست لەبەرۆكى ناكاتەوە، ڕەگ وڕيشەو ڕچەڵەكى دەر هێناوە

(غەمی پیێ نەگەیشتنی بە یار)، بۆیە داوا دەکات و دەپارێتەوەلە یارو هانای بۆدەبات تا بگاتە فریای وبۆ ساتێکیش بێت غەمی لیێ بروێتەوە وشاد بێت بە دیتنی و عومری لە نویێ دەس پیێ کاتەوە .

(١٥٨)

نیـــا موتلّـــەق نـــەکارم ئـــین دلێ مـــوو<br>
بـــەجز خونابـــەی نـــە حاصـــل مـــوو<br>
دارە دەر مەوســـم گـــولێ جـــۆش ســـەودا<br>
چ پـــەروائی کـــرە ئینجـــا دلێ مـــوو

موتلّـەق=بـەرەهای کتـو پـڕ، بەیـەکجاری. بـەجز خونـا=بـە غـەیری خوێن.کرە =دەکات.نە کارم =لە کارم، لە چالاکیم.پەروا=ترس.نیا=نیە، نەبوو.حاصلێ= دەسکەوت.

(١٥٩)

شـــەویێ نـــەبود کـــە دلێ پـــڕ غـــەم نمیبـــوو<br>
زانکـــە دولبـــەر دەمـــیێ هەمـــدەم نمیبـــوو<br>
هـــەزاران رەحمـــەت حـــەق بـــاد بـــەر غـــەم<br>
زەمـــانیێ ئـــەز دلێ مـــو کـــەم نمیبـــوو

زانکە= کە دەزانیێ. رەحمەت حەق باد=رەحمەتی خوای لیێ بیێ. بەر =لە. واتە =شەوێك نەبوو کە دڵی من بیێ غەم بێت، چونکە دەزانـیێ ئەو یـارەی مـن نابێتـە هـاودەمی مـن(نایەتـە فریـام وچـاوم پێـی کـەوێت).بۆیـە هەزار رەحمەت لـە غـەم دەکات چـونکە هـەر ئەو هاودەمێتی و لێـی کـەم نابێتەوە. بابا نەگەیشتوە بە یار چاوەڕوانە، لە ناخی ئەو ئەوینەدا غەم بوەتـە پیشەی و شەوان بە غەمەوە سەر دەنێتەوە.

(١٦٠)

وای ئــەز ڕۆژی کــە قــازیم خــودا بــوو
ســەر پــل ســیراتم ماجــەرا بــوو
بــە نوبــەت بگوزەرنــد پــیرو جوانــان
وای ئـەز ئانـدەم کـە نوبـەت زانـی مـا بـوو

قازی=داد پەروەر.سەر پل سیرات= پردی سیرات.بگوزەرند=تێ پەرن. ئاندەم=ئەو دەمە، ئەو ساتە.

(*) لێرەدا باباتاهیر ئاگاداری موریدانی ریبازەکەی دەکاتەوە کە ئاگایان لە کارو کردەوەیان بێت لەم دونیایەداو خوای گەورە لە بیر نەکەن، بانا ڕۆژ ڕوو بە ڕووبونەوەی دادوەری دەبنەوەو تاقیکردنەوەی پردی سیرات لە ڕێیانە، بە پێی ئەو تاقیکردنەوەو کرداریان سزاو پا داشتی خۆیان وەر دەگرن.

(١٦١)

بــۆرە بــۆرە کــە جانــانم تــووئی تــوو
بــۆرە بــۆرە کــە ســولْتانم تــووئی تــوو
تـە خـود دونـی کـە غـەیرە ئـەز تـوو نەدونـەم
بــۆرە بــۆرە کــە ئیمــانم تــووئی تــوو

لە نوسینەوەی د.مارف خەزنەدار لە لا٢٠٧دا تووئی بوەتە تووێ وە ئیمانم بوەتە ئیمونم، هەر وا بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سۆرانی:-

وەرە وەرەو جــانی جــانم هــەر تــۆی
وەرەوەرە ســولتانی مــن تــەنیا هــەر تــۆی
تـۆ خـۆت دەزانـی کەلـە تـو زیـاتر کـەس ناناسـم
وەرە وەرە بــیرو بــاوەڕم هــەر تــۆی

وەبەم شێوەیەش لێکی دەداتەوە:- لیرەدا کە دوو شت (من وتۆ) بەرامبەر بەیەکترە دادەنێ. مەبەستی ئەوەیە کە هەردوکیان بکا بە یەك یاخود هەردوکیان هەر یەکێکن. من بەلایەوەناتەواویە ئەوەی تەواوی دەکات (تۆ)یە.ئەم تۆیە خۆی یەکێکە و تەواوە.بێ منیش هەر تەواوە لە بەر ئەوە (من) کەبە(تۆ) دەبێ بە تەواو .

(*)د. مارف بە پێی ڕێبازەکەی باباتاهیر لێکی داوەتەوە (فریشتەو زاتی خودایی) کە یەکتر تەواو دەکەن، هەر چەندە فریشتەش نەبێت زاتی خودا هەرتەواوە .

دلزاریش لە لا٥٨دا کردویە بە سۆرانی.

(١٦٢)

تـــۆ شـــەو تـــارت بوینــــەم تـــار تـــارو
گرفتـــە زولمـــەتش هـــەر بـــورج و بـــارو
خودایـــا ڕۆشـــنایی بـــەر دلـــم دە
کـــە تـــا وینـــەم جـــەمال هەشـــت و چـــارو

تار تارو =زور تاریك.بار =جارێك.جەمال=ڕوخسار.هەشت وچوارو=بە ژمارە هەشتو چوار دەکاتە دوانگزدە، بۆیەهەندێك بە دوانگزدە ئیمام لە قەلەمی دەدەن. بەلام لە راستیدا مەبەستی حەوت فریشتەو زاتی خودایەکە دەکاتە هەشت لەگەل چوار مەلەك.ئەگەر بابا بگاتە پلەی کەمال چاوی پەردەی لە سەر لا دەچێت و هەموو شتێك دەبینێت وئاگاداری هەموو شت دەبێت.

(١٦٣)

دڵــــم زه دەردی تـــــە دایــــم هەمینـــــە
ببــــاڵین خـــــشتم و بەســــــتەر زەمینـــــە
هـــەمین جـــورمم کـــە مـــو تـــە دۆســـت دیـــرم
نـــە هەرکـــەس دۆســـت دیـــره حـــاڵش ئینـــە

هەمینه=هەر ئەوەیه. باڵین=سەرین. بەستەر=راخەر، جێگا. هەمین=هەموو، گشت. جورمم=خەتام، گوناهم. دیره=هەیەتی. ئینه=ئەمەیه.

د. مارف خەزنەدار دەڵێت:-"عاشقان بەلای باباتاهیرەوە دوو جۆرن، عاشقی موتلەق وعاشقی زەمینی، رێگەی گەیشتن بە عاشقی موتلەقی ڕاست چەتوونه، ئەوەی تر ئاسانه، چەتونەکەیان عاشقی وا هەیەبریویەتی، هی واش هەیه نەیبریوه(هه وەکو باباتاهیر)بۆیه دەڵێ:-

دڵــــم لـــــە دەردی تـــــۆ دایـــــم غەمگینـــــە
خـــــــشت ســــــــەرینمە وزەوی نوینمـــــــە
گونـــــاهم ئەوەیــــە چـــونکە دۆســـــتم هەیـــە
بـەلام هـەموو کەسێکی دوستی هەیـەحاڵی وانیـە

هەر وا ئەحمەد تاقانەش لەلا٥٤دا کردویه بە سۆرانی.

(١٦٤)

چـــو مـــویـــەك ســـوتە دڵ پەروانـــەی نـــە
بەعالـــەم هەمـــچو مـــو دیوانـــەی نـــە
هەمـــە مـــاروون ومـــورن لانـــە دیـــرن
مـــــن دیوانـــــە را ویرانــــــەی نـــــە

چـــو مـــو=وەك مـــن، بەشـــێوەی مـــن.مـــارون ومـــورن =مـــارو مورێ.دیرن=هەیانە.ویرانە=لانە.نە=نیە.

شیخ مەحمەد خاڵ لەلا١٨دا دەڵێت:-"واتە لە جیهاندا پەروانەیەك نیە وەك من دڵ سوتاو، لە عالەما دێوانەیەك وەك من نیە، هەمو مارو مۆرێك هێلانەیان هەیە تیا بحەسێنەوە منی دێوانە نەبی کە هێچ وێرانەیەك شك نابەم. لە ڕاستیدا بابا گلەیی لە پیروانی ڕێبازەکەی دەکات، کە ئەو شێت و شەیدای ئەو پیرو ڕێبازەیە، کە چی هێچ شك نابات لەم دونیایەدا، تەنانەت جێی حەوانەوەشی نیە..

(١٦٥)

هـــەزارەت دڵ بـــە غـــارەت برتـــە وێـــشە
هـــەزارانت جگـــەر خـــوون گرتـــە وێـــشە
هـــەزاران داغ ویـــش ئـــەز ویـــشم ئەشمـــەر
هـــەنی نەشمـــەر تـــە ئـــەز ئەشمـــەر تـــە ویـــشە

د. مارف خەزنەدار لە لا٢٢٣دا بەم شێوەی خوارەوە گوریویەتی بۆسورانی:-

هـــەزار دڵـــت بـــە غـــارەت بـــردووە
هـــەزاران جگـــەرت پـــڕ خـــوێن کـــردووە
هـــــەزاران بـــــرینم ژمـــــاردووە
ئـــەوەی نـــە ژمـــاردراوە لەمـــە زۆر زیـــاترە

باباتاهیر مەبەستی ئەوەیە کە بلێت تەنها من نیم کەوتومەتە داوی ئەوینی تۆوەئەی یار، هەزارانی وەکی منت لە خشتە بردوە و تووشی داوی تۆبوون، هەزارانیش جگەر خوێناوی بوون کە لە ژماردن نایەت، هەموو هەر چاوەڕوانین بۆ دیتنی لوتف وجەماڵی توو، تۆش زۆر بێ باکی.

(١٦٦)

دڵـــم ئـــەز عیـــشق خوبـــان گـــیج و وێجـــە
مـــژە بـــەر هـــەم زەنـــەم خونابـــە رێجـــە
دڵ عاشـــق مـــسال چـــوب تـــەر بـــی
ســـوی ســـرڕ چـــە ســـرڕی خونـــاوە ڕیجـــە

خوبان=چاکان. گیج ووێجە=گێژو وێژە.مژە=برژانگ.بریجە=بریژە.
مسال=وەك.چوب=دار.سووی=لەلای.سرڕ=نهێنی.(دلزار کردویە بەئاگر)

د.صدیق بورەکەیی لەلا٩٥دا بەم شێوەی نوسیوەتەوە:-
دڵـــێ دیـــروم ژ عـــشقت گـــێج و ویجـــە
مـــوژە بەرهـــەم زەنـــوم خوونابـــە رێجـــە
دڵ عاشـــق بـــسانیی چـــوب تـــەریی
ســـەری سوچـــە ســـەرێ خونابـــە رێجـــە

واتاکەی=دڵێکم هەیە کە لە ئەوینت گێژو وێژە، برژانگ بەیەکابنێم خوێناو ئەریژێ، دڵی ئەویندار وەکوو تولی تەڕ وایە، سەرێکی ئەسووتێ وسەرێکی خوێناوهەڵئەریژێ.

د.مارف خەزنەدار لەلا٢٢١دا ب١ دەڵێت:-باباتاهیر عەشق دڵی گێژکردوە، ئەگەر برژانگەکانی وێك بنێ یتەوە فرمێسك وەك سولاوکە (مەرزم) دێتە خوارێ، ....هەر وا لە چوارینەکەدا (بسان چوب تەر) بوەتە(بسانی چووبی تەر بێ) وە (سوچە) بوەتە (سووژە).وا پێ دەچێ سرر بە هەڵە یان بەدەسکاری نوسراوە.

شیخ مەحەمەد خاڵ لەلا١٧دا دەڵێت:-"ئەوان وەك شتێکی نایابی ون بوی خۆیان بدۆزنەوە، یان وەك ماندی بێ نەوایەکە گەنجێك بدۆزیتەوە

یا تینویەك كە سەرچاوەی ئاویكی ساردی سازگاری روناك ببیننەوە، لە خۆشیا گەشكە دەیا نگری.

هەروا دڵزاریش لە گەنجێنەكەیدا كردویە بە سۆرانی.

(*)بابا تاهیر ئەوەندە خولیای عەشقی پیروانی رێبازەكەیەتی، دڵی گیژو وێژە چونكە لیان دوورە و نایانگاتیٚ، بۆیە لە ناخەوە و لە سۆزی گریاندا فەرمێسكی خوێناوی وەك سولاوكە دێتە خواری، وخۆی وەك دارێكی تەری ئاگر تیٚ بەر بوو دێتە پێش چاو.

(١٦٧)

مسلسل كیسوان پر تاب مەكرە
خومارین نەركسان پر خواب مەكرە
هەمی خواهی كە مهر ئەز مو بەری
برینە رۆژگار ئاشتاب مەكرە

مسلسل=زنجیرە، ریز. كیسوان=ئەبرۆ.پر تاب=پر تیشك، پێچ خواردو.ئاشتاب=پەلە، خیرایی.نەركسان=نەرگز چاو.برینە رۆژگار=رۆژگار دەبرێتەوە. خواب =خەو. مەكر =ناز.مهر=روو، چارە.

(*)جگە لە ئافرەت پیاو مەقولاٚنی ناو كۆمەڵگا ودێوەخان پێشان باو بوو پرچ و پەلكیان هەبوو سەریان نەدەتراشی، چاوانیان بەكل دەرەژی، جا ئەم چوارینەی بوو ئافرەت وتووە یان بوو پیروانی كە لەو جۆرە بوون.؟؟

(١٦٨)

چە دیرە ئینكە دارش ئازەرینە
چە دەشنە ئینكە خونخوارش زەمینە
مەگەر بوو وەبر مسكین دلاٚنە
مەگەر سەحرای عیشق نازەنینە

چە دیرە=چی هەیە.ئینكە=ئەوەی. دارش=هەیەتی، پێیەتی

ئازەرینە=ئاگرینە.چە دەشنە=چی هەیە، (دەشنە=جۆرە خەنجەریکە، فەرهەنگی لەك و لور)خونخوار=خوێن خراب(ماڵ خراب)

(١٦٩)

مـــو را ئـــەی دولبـــەر مـــو بـــا تـــە کـــارە
وەگـــــەر نـــــە دەر جیهـــان بـــسیار یــــارە
کوجــا پــەروای چـــوون مــو ســووتە دیــرم
چـــو مـــو بلبــل بـــە گـــوڵزارت هـــەزارە

مـــو را =بـــۆ مـــن .نـــەکارە=بـــە کـــارە.کوجـــا=لـــە کوێ.پەروای=پەروەردەبووی. بسیار= زۆر.چو من=وەك من.

(١٧٠)

بـــێ تـــە یەکـــدەم دڵـــم خـــوورڕەم نەموونـــە
وەگـــــەر رووی تـــــە وینـــــەم غـــــەم نەموونـــە
ئەگـەر دەردی دڵـم قـسمەت نەمایەنـد(نەموویـەن)
دڵ بـــــێ دەرد دەر عالـــــەم نەموونـــــە

نەموونە=نامێنی.نەمایەند=ئاشکرا کردن.دەر خستن.

د.مـارف خەزنـەدار لـەلا٢٢٠دا بـەم شـێوەی خـوارەوە کردویـە بـە سۆرانی:-

بـــەبێ تـــۆ هـــیچ کاتێـــك دڵـــم گوشـــاد نییـــە
ئەگـــــەر رووی تـــــۆ ببیـــــنم غـــــەم نـــــامێنی
ئەگـــــەر دەردی دڵـــــم دابـــــەش بکـــــەم
دڵـــــی بـــــێ دەرد لـــــە گێتـــــی دا نـــــامێنی

(*)باباتاهیر لە ئەوینیکدایە ئەگەر ئەویارەی نەبێت لە دڵیدا هیچ خۆشی نابێنیت، ئەگەر بێتوجارێك روخساری ببینی غەم لە دڵی نامێنی، ئەگەر بیتو ئەو دەردەی دەر نەخات و ئاشکرا نەبێت، دڵی دەردەدار لە جیهاندا نامێنی.ئەبێ بابا چەند لە سەودای ئەویارەدا بێت ؟وەدەبێ ئەو یارە چ جۆرە یارێك بێت؟؟.

(١٧١)

دەر ئـــین بـــووم و بـــرانم پـــەروەرش نـــە
شـــەوانم جـــا وەڕۆزانم خـــەوەرش نـــە
ســـەری دیـــرم کـــە مـــەغزی ئەنـــدەراونی
تـــەنی دیـــرم کـــە پـــەروای ســـەرش نـــە

بوم وبرانم=وجود، نیشتمان، دونیا.پەروەرش=پەروەردە.
مەغز=مێشك.ئەندەراونی=لە ژێر ئاو.پەروا=شەرم

(١٧٢)

مـــــو ڕا دەرد دڵـــــم کـــــردە واتـــــە
نـــەزونی دەرد دڵ ئـــەی بـــێ وەفاتـــە
بـــۆرە مـــو ســـووتە دڵ واتـــە ســـپارم
نـــە زونـــی بـــا دڵ زونـــە پـــا تـــە

واتە=گوفتە، ووتن.واتە سپارم= بە تۆی دەسپێرم . نەزونی=نازانی.بێ وەفا تە=تووی بێ وەفا.پا=پلە.

(١٧٣)

ســـەحەر گاهـــان کـــە ئەشـــکم لاوە گـــیرە
زە ئـــاهم هـــەفت چـــەرخ ئـــا لاوە گـــیرە
چـــنان ریـــزم زە دیـــدە و ئەشـــك خـــونین
کـــە گێتـــی ســـەر بـــە ســـەر ســـەیلاو گـــیرە

ئەشك=فەرمێسك.لاوە گیرە=هەراسان دەبێت.ریزم=دەرێژم، زەدیدە=لە چاوان.سەیلاو=لافاو.هەفت چەرخ=هەفت تەبەقەی ئاسمان و زەمین.سەر بە سەر=سەرانسەر، هەمووی.

(*)باباتاهیر لیرەدا پەرۆشی و نارەحەتی خۆی دەر دەبرێ کەبە فەرمێسك ڕشتن و ئاه وفیخان دونیای هەراسان کردوە، ئەو فەرمێسکە خوێناوەی دەڕێژی، هەموو دونیای کردوە بە لافاو. ئەم پەروشی ونارەحەتیە وەك دەروێشیکی سۆفی، لە پێناو بارو دۆخی دونیایە یان لە پێناو دووری پیروانیەنی و بیرو باوەری ڕێبازی سوفیگەریەکەیەتی.؟؟

(١٧٤)

دلْ عاشق بە پیخامیْ بساچە
خومار ئالوودە با جامی بساچە
مەرا کەیفیەت چەشم تو کافی ئەست
قەناعەت گر بە بادامی بساچە

پیخام=نامە، هەوالْ.بساچە=بسازنە، بژی.خومار ئالْودە=چاوان پر خومار.جام=ئاوینە، دەفر.بادام= بادەیەك.

(١٧٥)

غەریبی سەخت مرا دلْ گیرداره
فەلەك بەر گەردەنم زنجیر داره
فەلەك ئەز گەردەنم زنجبر بەردار
کە غوربەت خاك دامین گیر داره

مرا=هی من.داره =هەیەتی. بەردار=لایبە، بیکەوە.غوربەت خاك=غەریبی ولاْت.

دڵزار له ل٨٦دا کردویه به سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە :-

غـــەریبی نـــاخۆش کـــە دڵگـــیر مـــە
فەلـــەك هـــۆی ملـــی بـــەزنجیر مـــە
فەلـــەك لـــە ملمـــا زنجـــیر دەڕێنـــە
کـــە خـــاك غوربـــەت دامـــەن گیرمـــە

(*)وادیـارە باباتـاهیر غـەریبی پـێ قـورس بـووە، کـە خـۆی لورسـتانیە، سەرهەڵدانی ڕێبازەکەی وپیروانـی لـە ناوچـەی لورستان بـوون، ئیسـتا لـەو دووره "لــە هەمــەدان" وناوچــەی هــەوراما‌ن دەگــەرێ بــەدوای بــڵاو بوونــەوەی بــیروڕای ڕێبازەکــەی‌و ســەر دانــی موریــدانی، وەلــە شــاری هەمەدان نیشتە جێ بووە.بۆیە باس لە زنجیرو پرسیار وداواکاری لەفەلـەك دەکات .چونکە پا بەندی ئەو مەبەستەیە.

(١٧٦)

دڵـــم مـــەیل گوڵبـــاغ تـــە دیـــرە
سەراســـەر ســـینەم داغ تـــە دیـــرە
بـــشم ئەلالـــە زاران دڵ کـــەرم شـــاد
دیـــم ئالالـــە هـــەم داغ تـــە دیـــرە

دیرە=هەیەتی. داغ= خەفەت. بشم= بچین.دانشین.
صدیق بورەکەی لەل٩١دا بەم شێوەی نوسیوەتەوە:-

دڵـــوم مـــەیل گـــول بـــاغ تـــە دیـــرە
سەراســـەر ســـینە ئـــوم داغ تـــە دیـــرە
بـــشوم ئالالـــە جـــاران دل کـــەرۆم شـــاد
دیـــوم کالالـــە هـــەم داغ تـــە دیـــرە

واتە=دڵم ئارەزووی گوڵ وباغی تۆی هەیە، لەسەراسەری سینەمدا داخی تۆی هەیە، هاتم بچم بۆجاری گولاڵە تا نەختێ دڵم خۆش و شاد بێ. دیم گولاڵەش داخی توێ هەیە.

ئەحمەد تاقانەلەلا٥٥داکردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵـــم مـــەیلی گـــوڵ وبـــاغی ئـــەتۆی هـــەس
سەراســـەر ســـینگی مـــن داغـــی ئـــەتۆی هـــەس
دەڕۆمـــــە لالـــــە زاران دڵ بکـــــەم شـــــاد
دەبیـــنم لالەکـــەش داغـــی ئـــەتۆی هـــەس

(*)بابا لیرەدا بۆ مەعشووقەکەی دەدوێ کە چەند بە پەروشە بیبینێ کە چەند بەغەم وخەفەتەوە یە دڵ غەمگینە لە دووری ئەودا، کە دەرواتە ناو گوڵزاران تا هەندێ ئەو غەمەی برەوێتەوە کەچی گوڵزاران هەم بەغەم و پەروشی ئەوەوەن بۆ دیتنی ئەو یارەی بابا تاهیر.

(١٧٧)

بـــە دونیـــا مـــو نەوینـــەم کـــام بـــێ تـــە
بـــە دەس هـــەرگز نـــەگیرەم جـــام بـــێ تـــە
بلـــەرزەم ڕۆز و شـــەو چـــوون بیـــد مـــەجنون
نـــەدارم یـــەك نەفـــەس ئـــارام بـــێ تـــە

بێد= دار بی.

دڵزار لە لا٨٧دا کردویە بە سۆرانی بەم شێوەی خوارەوە:

بـــێ تـــۆ نـــابینم لـــە دونیـــادا کـــام
مـــن بـــە دەســـتەوە هـــەرگیز نـــاگرم جـــام
ئەلـــەرزم ڕۆژوشـــەو وەك شـــوورە بـــی
بـــەبێ تـــۆ نیمـــە یـــەك نەفـــەس ئـــارام

(*)بابالـەم چـوارینەیەدا هەستی خـۆی دەردەبـڕێ بەرامبـەر بـە یـار (مەعشووقە)کە بەبێ ئەو هیچ ئارەزویەکی نیە لەم دونیایـەدا، وەلـە عیـشقی ئەو نـەبێت جامی سـەر مەستی دەروێشی بـە دەستەوە ناگرێت، ئـەو هـەر خەریکی زکرو مناجاتەشەو ڕۆژ وەك داری بی بەدەم باوەدەلەرزێت، بە بێ ئەویش هەناسەی نامێنی .

(١٧٨)

هـــەر ئـــان دولبـــەرم کـــە چەشـــم مەســـت داره
هـــــەزاران چـــــوون منـــــی پـــــا بەســـــت داره
مـــــەیان عاشـــــقان ئـــــان مـــــاه ســـــیما
چـــــو شـــــعر مـــــن بلنـــــد و پەســـــت داره

دڵزار لە لا٧٨دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

هـــەر ئـــەو دولبـــەرەی چـــاوی مەســـتی هـــەس
هـــــەزارانی وەك مـــــن پـــــا بەســـــتی هـــــەس
لـــــە نـــــاو عاشـــــقانا ئـــــەو مـــــانگ روخـــــساره
وەکـــــو شـــــیعری مـــــن بـــــە رزو پەســـــتی هـــــەس

شـیخ مەحەمـەدی خـاڵ لـە لا٢٤٧دا دەڵێـت:- چـوارینەکانی باباتـاهیر زۆریان لەیەك دەچن لە عیبارەت ولە مەبەستاو ئەوانـەیزۆر بـەرز نـین، هـەر لەبـەر ئەوەیـە کـە خۆیـشی دان دەنـێ بـە پەسـتی هێنـدێکیان، وەك ئـەم چوارینەیە.

(١٧٩)

ســـــــەحەر گاهـــــــان فغـــــــان بولبلانـــــــه
بـــــه یـــــاد رۆی پـــــڕ نـــــوور گولانـــــه
زه ئـــــاه مـــــو فەلـــــەك ئـــــاخر حـــــەزەر کـــــه
ئەســـــــەر دەر ناڵـــــــه ســـــــووته دلانـــــــه

حەزەر=ئاگاداری. ئەسەر=بە جێ ماو . (ئەساوەر) هەردوك ووشەی عەرەبین.

(*)بابا لیرەدا وەك بولبل لەسەحەردا خەریکی نالەو زکرو مناجات و نوێژ کردنە لە ناخی عبادەتدا لە بۆدوا رۆژ، لە کاریگەری ئەوەدا و دڵسوتاوی دونیای هاژاندوەو ناو بانگی داوەتەوە.

(١٨٠)

بـــەدونیا مـــسل مـــو دڵ ســــووتەی نــــە
بـــەدەرد ســـۆز غـــەم ئەندوتـــەی نــــە
چـــسان بەنـــدم را ســـەیل دوو دیـــدە
کـــە ئـــین زەخـــم دڵـــم لـــو ســـووتەی نــە

ئەندوتە=پاشەکەوتکراو. لو سووتەی= لێو سوتاو. چسان=( ) .
سەیل = لافاو. سێل=نیگاکردن، تەماشا کردن

(١٨١)

غـــــەم دەرد دڵ مـــــو بـــــێ حـــــسابە
خـــودا زونـــە کـــە مـــرغ دڵ کەبابـــە
بنـــازم دەســـت و بـــازوی تـــە جـــەلاد
ئەگـــەر قـــەتلم کـــری واللـــە ســـەوابە

دلزار لەلا٥٩دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

غـــەمی دەردی دڵـــی مـــن بـــێ حیـــسابە
خـــودا ئـــەیزانی تـــەیری دڵ کەبابـــە
بـــە قـــەتلی دەســـت و قـــامی تـــۆ ئـــەنازم
ئەگـــەر بـــێ و بمکـــوژی بـــەخوا ســـەوابە

(١٨٢)

دڵ مـــو دایـــم ئەنـــدەر ماتـــەم تـــە
بـــە دڵ پێویـــستە بـــێ دەردو غـــەم تـــە
چـــە پرســـی کـــە چـــرا قـــەدت بپووســـەم
خەمـــە قـــەدم ئـــەز ئـــان پـــیچ وخـــەم تـــە

ئەنـــدەر=ئانـــدەر=لـــە نـــاو.ماتـــەم=تازیـــە.چـــە پرســـی= چـــی دەپرسی.بپووسەم=ماچ بکەم.خەمە=دەیخەمە، چەماوەیە، لاری.

(١٨٣)

زەخـــم جـــان دەر تـــەنم دەرگـــیر وداره
ســـەرم دەر رەهـــن تـــیخ ئابـــداره
نـــەدارم ئیختیـــاری ئـــەز چـــە جۆشـــش
دڵ مـــو تـــاب ئـــین ســـەودا نـــەداره

زەخـــم=بـــرین.دەرگـــیروداره=لـــە گیروگرفتدایـــە، لـــە شەلەژاویدایە.رەهن=مەرج.تیخ ئابدار=چەقووی ئاودار.
نەدارم=نیمە.تاب=تاو.جۆشش=جۆشی.

(١٨٤)

کوجـــابی جـــای تـــوو ئـــەی یـــار دڵخـــواه
کـــە تـــا بـــسپرم ئانجـــا یـــە ك راه
هەمـــە جـــا جـــای مـــو کـــۆر بـــاتن
غەلـــەت واتم غەلـــەت ئەســـتخفر اللـــه

کوجا=لە کوێ.بێ جا=بێ جیگا، بێ ماوا..بسپرم=بسپێرم

ئانجا=ئەوجیگایە..کوٚر باتن=بە یەکیٚ دەوتریٚ هیچ نەزان بیٚت یان بەدوای شتیکا بگەریٚت ونەیدوٚزیتەوە .غەلەت واتم= هەلٚەم ووت، خەتام کرد.

دلٚزار لەلا۹۰دا کردویە بە سورانی بەم شیٚوەی خوارەوە:-

کییٚــە جیگـــای تــوٚ ئــەی یـــاری دلٚخـــوا
هـــــەتا ئـــــەو جیٚیـــــە بکـــــەم بـــــەریٚگا
هـــەموو جـــیٚ جیٚـــی تـــە کـــوٚری بـــاتنم
خـــــەتام وِت خـــــەتا ئەســـــتخفر اللـــــه

شیخ مەحەمەد خالٚ لە لا۱۹۷دا دەلیٚت:-"لە شیعری یەکەمدا پرسیارلە جیٚـی خـودا دەکـات لـە پاشا پەشیمان دەبیٚتـەوە ودەلٚـی:خوایـە تـوٚ بـیٚ جیٚگایت و جیٚگای تایبەتیت نیە، بەلٚکو لە هەمو جیٚیەك هەیت بوونەوەر عەرشـی توٚیـە، بەلٚکو عەرشـی تـوٚ لـە بوونـەوەر فـراوانترە.بەلاٚم من چـاوی دەروونم کویٚرە لە بەر ئەوە خەتام وت کە پرسیارم لە جیگاو ریٚگـای تـوٚ کـرد و پەشیمان بوومەوە وداوای لیٚخوٚشبوون دەکەم."

(*) کویری باتن=لە دونیای سوفیگەریدا مەبەست پەردەی چاوە کە لـە ریٚگای عبادەتی قولی سووفیاندا بە ئاواتن ئەو پەردەیە لاچیٚت، واتە پشتی پـەردەیان لیٚ دیـار بیٚـت، ئـەو کـات دەگـەن بـە ئـاوات و شـاد بـوونی هەمیشەیی. لە زانستی دەروونناسی پیٚی دەوتریٚت (میتا فیزقیا)

(۱۸۵)

ســـەرم چـــوون گـــوٚی دەر مەیـــدان بگـــەردە
دلٚـــم تـــەر عەهـــدو نـــز پـــەیمان بگـــەردە
ئەگـــــەر دەوران بـــــە نامـــــەردان بمونـــــە
نـــــشینەم تـــــا دیگـــــەر دەوران بگـــــەردە

بگەردە=بسوورێتەوە. تەر=وەك. نز=دەور، لە پاڵ.
فەهمی كاكەی لەلا٩١دا كردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-
سەرم وەك گۆیەك لە مەیدان بگەڕێ
دڵم بە دەورعەهدو پەیمان بگەڕێ
ئەگەر دەوران بۆ نامەردان بمێنێ
دەنیشم تا دەورانی تر بگەڕێ

(*)چاوەروانی باباتاهیر بۆ دورانیكی تر چاوەروانی( فریا ڕەسە) بۆ دونیای خواناسی و یاسا پەیرەو كردن كە لە ئاینە كونەكاندا بەم شێوەیە ناوی هاتوە:( بیرە باوەری كۆنی چینیەكان ناوی یترتنكر-موبەشیر، بیرو باوەری بوزایی ناوی بوزای پینجەمە.بیرو باوەری هیندی ناوی ئوتار "دیشنوی دەهەم".بیرو باوەری زەردەشتیەكان ناوی سوشیانت.بیرو باوەری ئیسلامی مەهدی ئاخر زەمان.بیرو باوەری مەسیحیەكان عیسای كوری مەریەمە.) كە زۆر لە عارفان ئاین زانان سوفی وپیاو چاكان پێش بێنیان كردوە.

(١٨٦)

بە كەس دەرد دڵ مو واتەنی نە
كەسنگ ئەز ئاسموون ئەنداتەنی نە
بەمو واچن كە تەرك یار خود كە
كەسیش یارم كە تەركش واتەنی نە

واتەنی نە=ناڵێت. ئاسموون=ئاسمان.سنگ= بەرد.
فەهمی كاكەی بەم شێوەیە كردویە بە سورانی:-
بەكەس رازی دڵم گوتەنی نییە
بەرد لە ئاسمانەوە كەوتنی نییە
پێم دەبێژن تەركی یاری خۆت بكە
كەسێكە یارم تەرك كردنی نییە

(*)مەبەست لەم چوارینەیە نەدرکاندن و پاراستنی نهێنیە کە زۆر باوە لە ناو ئاین زانان و سووفیان، مەبەستیش لە یار پیروانی ڕێبازەکەیەتی. کە شەیدای بینین و پێگەیشتنیەتی.

(١٨٧)

دڵ ئـــەز مـــوهرت نـــوورزە بـــەر چ ئـــەرزە
نـــەخواهم دڵ، کـــە مـــوهر تـــە نـــوورزە
گریبـــان هـــەر کـــە ئـــەز دەســـتت کـــرە چـــاك
بەیـــــــەك عالـــــــەم گریبـــــــان وا بـــــــیرزە

نوورزە= ڕوناکە . ئەرزە= بێ نرخە، هەرزانە. بیرزە =پیروزە، بیزارە .گریبان= گیرفان، یەخە، بەرووك. موهر =روخسار، ئەوین.چاك =درز، قلیش.

(١٨٨)

دڵ مـــو غـــەیری تـــە دولبـــەر نـــەگیرە
بـــە جـــای جەوهـــەری جەوهـــەر نـــەگیرە
دڵ مـــو ســـووتە و مـــوهری تـــە ئـــازەر
بنـــــی نـــــا ســـــووتە ئـــازەر دەر نـــەگیرە

بەجای =لەجێگای، لەجیاتی.نەگیرە =ناگرێت، دانانێت. موهر=ئەوین، روخسار .ئازەر =ئاگر

(*) بابا تاهیر بە پەرووشە بۆ ئەوینی ئاگرینی یار، هەرچەندە دڵسوتاوە بەلاَم ئەو ئەوینە ئاگرینەی ئەو نایسوتێنی گڕ ناگریت، بۆیە داوا دەکات بێتە لایەوە وخۆی پیشان بدات.

(١٨٩)

سـەرم سـەودای کیـسوی تـە دارە
دڵـم مـوهر مـاهی ڕووی تـە دارە
ئەگـەر چـەشمم بـەماه نـوو کـەرە مـەیل
نـەزەرتان ئـەبروی تـە دارە

کیسوی =ئەبرۆی. ماه= مانگ . دارە =هەیەتی. نووکەرە =تازەی کەرەوە، نوێی کەرەوە .نەزەر= تەماشا، چاو.تان =تان وپوو، .
م. فۆاد حسین لەلا ٥٤دا دەڵێت :-" ئەم هەستیارە کوردە روانیوەتە پلەو نرخی هەمەرەنگی دوڵبەرەکەی؟
(*) باباتاهیر سەرە ڕای ئەوەی شاعیرە وهەستێکی ناسکی هەیە، پیاوێکی ئاین زانی سوفیە، سوفیانیش فەلسەفەی تایبەتیان هەیە لە ژیانـدا، وە لە دونیایەکی تایبەتدا دەژین.وە یەکێکە لە نوێ کەرەوەی ڕێبازی یارسان لەگەل شا خوشیندا . لە ناوچەی لورستان و هەمەداندا.

(١٩٠)

دڵـی دیـرم چـو مـرغ پـا شکـستە
چـو کەشـتی بـەر لـوب دەریـا نشـستە
هەمـە گویـەن کـە تـاهیر تـار بنـواز
صـەدا چـوون میدەهیـد تـار شکـستە

مرغ= مریشك، باڵدار. بەر لوب دەریا = لە کەناری دەریا. تار بنواز =تەمیرە لیدە. صەدا =ئاواز، دەنگ. میدەهید=دێت، دەر دەچێت.

(۱۹۱)

نەزونـــەم لـــوت و عوریـــونم کـــە کـــردە
خـــودم جـــەللاد وبـــیٚ جـــوونم کـــە کـــردە
بـــدە خەنجـــەر کـــە تـــا ســینە کــونم چـــاك
ببینـــەم عـــشق بـــە جـــوونم چـــە کـــردە

لوت وعوریونم =روت قووت .کە =کیٚ. نەزونەم =نازانم. خـودم =خـۆم .کونەم= بیگەم.

(۱۹۲)

وابیٚـــدم پـــیرو بـــەر نـــائیم نمونـــدە
بـــە تـــەن تـــوش وتوانـــائیم نمونـــدە
بـــە مـــو واچـــن بـــڕو ئالالـــە بـــەر چـــین
بـــچینم چـــوون کـــە بینـــائیم نمونـــدە

بیٚد =باشی، داربی. بەر نائیم =دەرهاتنم. تووش= گرفتار. بەر چین =بەر بچیٚنە، بەر بکەوە.بینائیم= بینای چاوان، بینینم.نەموندە= نەماوە.

(۱۹۳)

دوو چـــەشمم ڕا تـــەخوون پـــالاٚ کنـــی تـــە
کـــەلاٚە عـــەقلٚم ئـــەز ســـەر واکنـــی تـــە
ئەگـــەر لیلـــی بپرســـە حـــالٚ مـــەجنوون
نـــەزەر ئـــەو ڕا ســـوی ســـەحرا کنـــی تـــە

پالاٚ =پالاٚوتن. کەلاٚە =کلاٚو. وا= دەکەیتەوە، هەلٚ ئەگری.نەزەر ئەو ڕا =بە بۆچوونی ئەو.سو= سبەینیٚ.

(١٩٤)

مـــەرا عـــشقت زە جـــان ئـــازەر بـــەر ئـــارە
زە پیکـــــەر مـــشت خاکـــستەر بـــەر ئـــارە
نیهـــال مـــــوهرت ئـــەز دلْ گـــــەر بـــبرِن
هـــەزاران شـــاخ هـــەر ســـو ســـەر بـــەر ئـــارە

بەر ئارە =دەر ئەهێنی . پیکەر =پەیکەر . نیهال =جوانی. خاکستەر =خۆڵەمێش .

(١٩٥)

درەخـــت غـــەم بـــەجانم کـــردە رِیـــشە
بـــە دەرگـــاە خـــودا نـــالْم هەمیـــشە
عـــەزیزوون قـــەدر یەکدیگـــەر بدونەنـــد
ئەجـــەل سەنکەســـت و ئـــادەم مـــسل شیـــشە

دلْزار لەلا ٤٦دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-
درەختـــی غـــەم لـــە گیـــان کردوویـــە رِیـــشە
لـــە دەرگـــەی خـــودا ئـــەنالێنم هەمیـــشە
عـــەزیزان بـــا بـــزانین قـــەدری یـــەکتر
ئەجـــەل وەك بـــەردە وئینـــسان چەشـــنی شوشـــە

شیخ مەحەمەد خالْ لەلا٢٤٧دا دەڵێت :-" گرنگی وقورسی هەندی چوارینەی باباتاهیر لەوانەیە کەبیْ بە پارسەنگی ئەو شیعرانەی کەوا لەتەرازووی کێشانا سووکن، بە جۆرێك کە هەمویان قورس بکات وکەم وکوریان داپۆشیْ."

تێبینی:- عەباس رەجەوی لە چاپی کۆنی دیوانی باباتاهیر دا لە پاشکوی کتیبەکەلەلا١١٥ دا گورانیە تازەکانی دیهاتی کرمانی نوسیوەتەوە، کە هەمووی بەشێوەی چوارینەیە، ئەم چوارینەی بابا یەکێکە لەو گورانیانە.
ئەحمەد تاقانەش لە لا٥٥دا کردویە بە سورانی.

(١٩٦)

بــــەلاَ رەمـــــزی زە بـــــالاَی تـــــە باشـــــە
جنــــون قــــسمی زە ســــەودای تەباشـــــە
بــــە ســــورەت ئافــــەرینم ئــــین گومانــــە
کەپــــەنهان دەر تەماشــــای تــــە باشــــە

رەمز =نیشانە .جنون= دیوانەیی.

(١٩٧)

کــــەرم رونــــی روم خــــوونی تــــە زونــــی
وەرم ئــــاخر بــــسوزونی تــــە زونــــی
وەرم بــــە ســــەر نمــــی ئەلْوەنــــد ومیمەنــــد
نمیــــوازم خــــودا زونــــی تــــەزونی

کەرم رونی =دەرم کەیت .خونی = لە مالْ .وەرم ئاخر =سەر ئەنجام .وەرم = سیبەری بەرد، ئەشکوتی بچوك. ئەلْوەند= روبارە . میمەند =ناوە. نمیوازم =داخوازم نیە .رووم =برۆم.

صدیق بورەکەی لەلا ٩١دا بەم شێوەی خوارەوە نوسیوەتەوە :-

کــــەرۆم روونــــی وەروم خــــوونی تــــە زونــــی
وەروم ئــــاخر بــــسوزونی تــــە زونــــی
وەروم بەســــەر نــــەهی ئەلْوەنــــد مەیمەنــــد
نــــەمی وازۆم خــــودا زوونــــی تــــەزوونی

(*) باباتاهیر لەم چوارینەدا منەت باری خۆی پیشان دەدات بەرامبەر خوای گەورە کە هەرچی لیّ بکات قەبوڵیەتی، تەنها ئەو لیی ڕازی بیّت .

(١٩٨)

ئـــەز ئـــان روزی کـــە مـــارا ئافەریـــدی
بـــە غـــەیرە ئـــەز مەعـــصیەت چـــیزی نەدیـــدی
خوداوەنـــد بـــە حـــەق هەشـــت و چـــارت
زە مـــو بگـــوزەر شـــتر دیـــدی نەدیـــدی

مەعصیەت =یاخی بوون .هەشت وچوار =مەبەستی بابا لە هەشت وچوار خواو حەوت فریشتە و چوار فریشتەکانی بە کار سپیراون.

فەهمی کاکەی لەلا ٩٠ دا لەگ.م. ك. کردویە بە سورانی بەم شیّوەی خوارەوە :-

لـــەو ڕۆژەی ڕا کـــە ئیمـــەت هیّنایـــە دی
بـــیّ لـــە بـــیّ ئـــەمری هیّـــچت لیمـــان نـــەدی
خودایـــە بـــۆ خـــاتری هەشـــت وچـــوارت
لیّمـــان گـــەڕیّ حوشـــترت دیـــت ونـــەدی

دەربارەی هەشت وچوار دەلیّت :-خودایە لە بەر خاتری هەشت تەن وچوار تەن لیّمان ببورە.کە هەشت تەن بریتیە لە هەفتەوانە و خودا خۆی، لە بیابیسی ساج ناری، هەر وەها چوار تەن بریتیە لە چوار مەلەك (مەلایکە). کە باباتاهیر خۆی یەکیّك بووە لە چوارتەن لە دەورەی شا خوشیندا، چوار تەنیش بازنەیەکی ناو هەفتەنە. ئەم لیّدوانە بە پیّی باوەری یارسانە، بەلاّم د. مارف خەزنەداردەلیّت :" هەشت وچوار هەر دوو ژمارە دەکاتە دوانگزدە، بە دوانگزدە ئیمامی شیعەکان لە قەلّەمی دەدات.هەر چەندە لای یارسان پیروزن چونکە نەوەی پیّغەمبەرن(د.خ) لەگەل ئیمامی عەلی (س.خ).

هەر وا دەقی چوارینەکە لە لای د. مارف جیاوازی هەیە لەگەل ئەوەی عەباس رەجەویدا لەم وشانەی خوارەوە :-"ڕۆژی بووە بە رۆچی، جیزی نەدیدی بووە بە ئەر ماچ دیدی۱چارت بووە بە چاروت.

وە لە کوتایی بە گورینی بوو سورانی دوا دیڕ لەجیاتی لێما گەڕێ حوشترت دیت ونەدي. کردویە بەلێمان خۆش بە و وا بزانە گوناهمان نەکردووە.

ئینجا د. مارف دەلێت :-شاعیر پڕ باوەرە کە خوداوەند لێی خۆش دەبێ ولە (دوور)ی ئەم نامێنێتەوە بەلکولێی(نزیك) دەبێتەوە.

(۱۹۹)

زە گـــشت خـــاترم جـــز غـــەم نـــەروئی
زە بـــاغم جـــز گـــولێ ماتـــەم نـــەروئی
زە ســـەحرای دلێ بـــێ حاصـــل مـــو
گیـــاه نـــا ئومیـــدی هـــەم نـــەروئی

فەهمی کاکەی لەلا۹۱دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

لـــە دلمـــدا بێجگـــە لـــە خـــەم چ نـــاروێ
لـــە بـــاغم بـــێ گـــولی ماتـــەم چ نـــاروێ
لـــە ســـارای دلـــی بێبـــەری منـــدا
تەنانـــەت گیـــای نائومیـــدیش هـــەر نـــاروێ

(*)غەم و نائومێدی باباتاهیر دەگەرێتەوە بۆ نەگەیشتنی بە یار و غەریبی و وون بوونی کوڕەکەی وەك دەلێن.

(٢٠٠)

مـــن ئـــان شـــەمعم کـــە ئەشـــکم ئـــازەرین بـــی
کەســـیٚ کـــە ســـووتە دلْ ئەشـــکش هـــەمین بـــی
هەمـــە شـــەو سووچـــەم و گریـــەم هـــەمو ڕۆز
زەتـــە شـــامم چـــنان ڕۆزم چـــەنین بـــی

شەمع= مۆم .چنان =وەها .چەنین =وەك ئەو.

(*) بابا تاهیر دەڵێت :- " من وەك مۆم فرمێسکی ئاگرین دەرژێنم، دلْ سوتاوم بۆیە هەمیشە دەگریێم، بە شەوان دەسوتێم و بە ڕۆژ دەگریێم، بەو حالْە شەوو ڕۆژ دەکەمەوە. ئەمەش سکالاْیەکە بۆ مەعشوقەکەی دەکات، پەروشی خۆی پیشان دەدات، کە هیشتا لێی دوورە و نەگەیشتوەپێی .

(٢٠١)

بـــەهار ئـــائی بـــە هـــەر شـــاخیٚ گـــولْیٚ بـــی
بـــە هـــەر بـــاغیٚ هـــەزاران بـــولبلیٚ بـــی
بـــە هـــەر مـــەرزیٚ نیـــارم پـــا نهـــادن
مـــەباد ئـــەز مـــو بـــتر ســـووتە دلْـــیٚ بـــی

ئائی =هات .نیارم پا =پێم ناوە .مەرز =سنوور . نهادن =دامەزراوە .مەباد =دەبیٚ .بتر =زیاتر .

(٢٠٢)

دلْـــت ئـــەی ســـەنگ دلْ بـــەر مـــا نەسوچـــی
عەجـــەب نـــەبوود ئەگـــەر خـــارا نەسووچـــی
بـــسووچەم تـــا بـــسوچانم دلْـــت ڕا
دەر ئـــازەر چـــوپ تـــەڕ تـــەنها نەسووچـــی

د. مارف خەزنەدار دەقەکەی بەم شێوەیە نوسیوەتەوەلەلا٢١٦دا :-

دڵـــت ئـــەی ســـەنگ دڵبـــەر مـــا نەســـووجە
عەجـــەب نـــەبود ئەگـــەر خـــارا نەســـووجە
بـــــسووجم تـــــا بـــــسووجونم دلـــــت را
دەر ئاتـــەش چـــووبی تـــەر تـــەنها نەســـووجە

بە سۆرانی:-

ئەی خاوەن دڵی وەك بەرد دڵت بە ئێمە ناسووتیٚ
ســـەیریش نـــی یـــە ئەگـــەر بـــەرد بـــسووتێنم
مـــن دەســـووتێم تـــا دڵـــی تـــۆ بـــسووتێنم
لـــەناو ئـــاگر تـــەنیا داری تـــەڕ ناســـووتیٚ

ئینجا د. مارف دەڵێت :-شاعر دەڵێت : دڵی خۆم دەسووتێنم تا دڵی دڵبەر بسووتیٚ، چونکە هەردووکیان یەکێکن.دڵی دلبەر لەناو دڵی شاعردایە، بەم جۆرە دڵکە لە ناو دەبات چونکە تەڕایی تیادا نییە، بۆیە دەسووتیٚ، هەمو شتێك بە ئاگر دەسووتیٚ تەنیا داری تەڕ نەبیٚ.

هەر وا دلزاریش لە لا٩٦دا کردویە بە سورانی .

(٢٠٣)

بـــیٚ تـــە ئەشـــکم زە موژکـــان تـــەر ئـــایی
بـــیٚ تـــە نـــەخلْ حـــەیاتم بـــیٚ بـــەر ئـــایی
بـــیٚ تـــە دەر کـــونج تـــەنهائی هەمـــە ڕۆژ
نـــشینم تـــا کـــە عـــومرم بـــەر ســـەر ئـــایی

نەخلْ =دار خورما. کنج =سووچ، قورنە، پەنا.

د. مارف خەزنەدار لە لا٢٠٩دالە نوسینی ئەم چوارینەیەدا ووشەی ئایی بوە بە ئایوو، وە هەمە رۆژ بووە بە شەوورۆچ، ئینجا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

بــێ تــۆ فرمێــسك لــه چــاوم دێتــه خـــوواری
بــــێ تـــــۆ داری ئۆمێـــــدم بـــــێ بـــــه‌ره
بــێ تــۆ لـــه كـــونجی تـــه‌نیاییم شــــه‌ووروژ
هــه‌روا ده‌مێنمــه‌وه تــا عــومرم به‌ســه‌ر ده‌چـــێ

(*) نه‌گه‌یــشتن بــه مــوراد واتــه نه‌گه‌یــشتنی باباتــاهیر بــه پیروانـــی ڕیبازه‌كـه‌ی(مه‌عـشووقه‌كه‌ی)، په‌شـێوی ونائومێـدی پـێ به‌خـشیوه، بۆیـه ده‌لێت داری ژیانی بێ به‌ر بووه، به تـه‌نهایی ماوه‌تـه‌وه و ده‌مێنیته‌وه‌لـه‌م دونیایه‌دا تا كوتایی ته‌مه‌ن.

(٢٠٤)

خوشــــا ئانـــــان كــــه اللـــــه یارشــــان بـــــی
كــه حه‌مــدو قــول هـــوه اللــه كارشـــان بـــی
خوشــــا ئانــــان كـــــه دایــــم ده‌ر نه‌مازه‌نـــد
به‌هه‌شـــــــت جاویــــــدان بازارشــــــان بـــــی

یارشان =یاریان . كارشان =كاریان. نه‌ماز =نوێژ. بازارشان = بازاریان .جاوید =نه‌مر.

(٢٠٥)

ئه‌لالـــــه‌ی كوهـــــساران هه‌فتـــــه‌یی بـــــی
به‌نه‌فـــشه‌ی جـــو كنـــاران هه‌فتـــه‌یی بـــی
مونــــادی میگــــه‌رد شــــه‌هرو بــــه شـــــه‌هرو
وه‌فــــای گــــــولعزاران هه‌فتــــه‌یی بــــــی

دلزار له لا ۲ دا کردویه به سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

هەلالـــــەی کوهـــــساران هەفتەیەکـــــە
وەنەوشـــــەی جوکنـــــاران هەفتەیەکـــــە
کـــە جارچـــی شـــار بـــە شـــارباتگ ڕا دەهێلـــێ
وەفـــــای گـــــولعزاران هەفتەیەکـــــە

د. مارف خەزنەداریش له لا٢١٤دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی:-

هەلالـــەی بـــاغی نـــاو شـــاخان هەفتـــەیی یـــە
بنەوشـــەی گـــوێ ی ئـــاوان هەفتـــەیی یـــە
بانگـــدەر بـــا شـــار بەشـــار بـــانگ بـــدا کـــە
وەفـــــای گـــــولعزاران هەفتـــــەیی یـــــە

ئینجا دەڵێت :"-هەموو کەس گرفتاری جوانی دڵبەرە، بۆیە بێ باکە، هەروەها بێ وەفاشە، وەفای ئەو هەمیشەیی نیە، کورتە لە تەمەنی گوڵ دایە.

م. فوأد حسین لە لا٥٦دا دەڵێت :-"باباتاهیر هەرچەندە وەفای گوڵعزاران بەهەفتەیەك دەزانی، بەلام لە هەمان کاتدا پیشان دەدات کە ئافرەتی دڵبەر بێ وەفایە. وەخوشەویستی ودڵداری بە ئاکامێکی زیان بەخش وبێ سوود دەزانێت.

(*) بەڕای من ئەم دەربڕینەی باباتاهیر بەرامبەر ئافرەت نییە، دەربڕینێکی مەجازیە، چونکە باباتاهیر وازی لە خوشی ژیان هێناوە تەنها لە سەودای ئاین وئاینداریدایە، و گەیشتن بە پیروانی هەقیقەت ویەکبوون وشاد بوونی هەمیشەیی.

(٢٠٦)

بـــــەلاَ بــــی دلْ خودایـــــە بـــــەلاَ بــــی
گونـــە چـــەشمان گـــرو دلْ موبتـــەلا بـــی
ئەگـــــەر چـــــەشمان نەكـــەردی دیــــدەبانی
چ دانـــــستی دلْـــم خوبـــان كوجـــا بـــی

د. مارف خەزنەدار لەلا٢٢٢دا بەم شێوەی نوسیوەتەوە:-

بەلاَیـــــــە دلْ بەلاَیـــــــە دلْ بەلاَیـــــــە
گونـــدە چـــەشموون كـــەرون دلْ موبتەلایـــە
ئەگـــەر چـــەشموون نـــەوینن رووی زیبـــا
چ زونـــوو دلْ كـــە خوبـــوون دەر كوجایـــە

واتاكەی :-

بەلاَیـــــــە دلْ بەلاَیـــــــە دلْ بەلاَیـــــــە
گونـــاهی چـــاوە كـــە دلْـــی موبتـــەلا كـــردوە
ئەگـــەر چـــاو روخـــساری جـــوان نـــەبینێ
دلْ چـــــوزانیْ جووانـــــان لـــــە كـــــوێن

ئینجـا دەلێـت : - هێلانـەی مەلْبەنـدی دلْـداری دلْـە، دلْ لـە ڕێگـای چاوەوە جوانی دەدوزیتەوەو دلْ گیرودەو گرفتار دەكات.

دلْزاریش لە لا٦٤دا كردویە بە سورانی .وە ئەحمەد تاقانەش لەلا٦٥دا كردویە بە سورانی .

(٢٠٧)

کـــشیمان گـــەر بـــەزاری ئـــەز کـــە ترســـی
برونـــی گـــەر بخـــوازی ئـــەز کـــە ترســـی
بـــە ئـــین نێمـــە دڵ ئـــەز کـــەس مـــو نەترســـەم
دوو عالـــەم دڵ تـــوو داری ئـــەز کـــە ترســـی؟

مارف خەزنەدار بەم شیوەی نوسیوەتەوە لەلا٢٢٢دا :-

کوشـــیمون ئـــەر بـــەزاری ئـــەز کـــە ترســـی
بـــەرانی ئـــەر بـــە خـــواری ئـــەز کـــە ترسـی
مـــو وائـــین نیمـــە دڵ ئـــەز کـــە نەترســـەم
دوو عالـــەم دڵ تـــەداری ئـــەز کـــە ترســـی؟

واتاکەی :-

ئەگـەر بمکـوژی بـە دڵ شـکاوی لـە کـێ دەترسـی
ئەگـەر دەرم بکـەی بـە کەساسـی لـە کـێ دەترسـی
منـــی لاواز بـــەنیو دڵ لـــە کـــەس ناترســـم
تـــۆ دڵـی دوو گێتیـت هەیـە لـە کـێ دەترسـی؟

(*)باباتاهیر لەگەل ئەوەی بێ تواناو هەژار بـووە، خـۆی بـەبێ کـەس و غـەریب زانیـوە، بـەلام بـیرو ڕای ڕێبازەکـەی هێـزو توانایـەکی گـەورەیان داوەتێ، وە پشت بە خواو پیروانی خۆی بە دەوڵەمەنـد و کەسـدار زانیـوە، بۆیە گوێی نەداوەتە هیچ ونەترس بووە . ئەو پرسیارەی ئاراستەی کـردوە بۆ ئەوەیەخۆیان پیشانی بدەن و بیانگاتێ و ئەم دونیای تـەم ومژاویـەی بـە جـێ بهیڵـێ و شـادی هەمیـشەیی بێگرێتـەوە.واتـە بـەپێی فەلـسەفەی سۆفیگەری بگاتە پلەی یەکبوون .

(٢٠٨)

هەر ئوون باغیٚ کە نەخلش سەر بەدەر بی
مەدامش باغەبوون خونین جگەر بی
بیایەد کەندەنش ئەز بیغ و ئەز بن
ئەگەر بارش هەمە لەعل و گەهەر بی

باغەبوون =باغەوان. مەدامش =مادام، ئەگەر وایە. کەندەنش = هەڵکەندن، دەرهینان.ئەز بیغ وئەز بن =لە ڕەگ وڕیشەوە .

(*) باباتاهیر لەو کاتەی تووشی داوو ئەوینی ئەم ڕیبازە بووە غەم وپەژارەو پەشیوی دایگرتوە، هەر لە سەودای گەیشتن بە مورادە(بەرهەمی لەعل وگەوهەر)، مەبەستی لەم چوارینەدا ئەویە تاکەی چاوەروان بێت ؟

(٢٠٩)

عاشق ئوون بی کە دایم دەر بەلاٚ بی
ئەیوب ئاسا بە کرموون موبتەلا بی
حەسەن ئاسا بنوشە کاسەی ژەهر
حوسین ئاسا شەهید کەربەلا بی

ئاسا =وەك، بەشێوەی. دلٚزار لەلا٤٧دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

ئەو دلٚدارە گیرودەی بەلاٚیە
ئەیوب ئاسا بە کرمان موبتەلایە
حەسەن ئاسا بنوشیٚ کاسەی ژەهر
حوسین ئاسا شەهید کەربەلایە

فەهمی کاکەی لەلا٩٠دا کردویە بەسورانی و لە سەری دەدویٚ ودەلێت :- "بابا عاشقی رێی راستیە، پیویستە لە سەری وەکوو هەر

مرۆڤیکی راستی پەرست تاڵی وسویری سەختی ئەو ریگایە ی گرتوویەبەر قبوڵی بکات .

(*) زۆر جار باباتاهیر بە شیعە لە قەڵەم دەدەن بە هۆی ئەوەی هەندی جار باسی رووداوی کەربەلا دەکات یان ناوی دوانگزە ئیمام دەهێنی، ئەمەش لە ڕاستیوە دوورە، بەلاّم لە یارساندا ئەوانە پیرۆزی خۆیان هەیە بۆ یە ناویان دەبات.

(٢١٠)

دلاّ راهــــت پــــرِ ئــــەز خــــارو خەســــك بــــی
گــــوزارت بــــەر ســــەر چــــەرخ و فەلــــەك بــــی
گــــەر ئــــەز دەســــتت بــــەر ئایــــە پوســــت ئــــەز تــــەن
بــــەر ئــــاور تاكــــە بــــارت كــــە متــــەرەك بــــی

د.مارف خەزنەدار لەلا٢١٥ دا نوسیویەتیوە وکردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

دلا راهــــی تــــە پــــرِ خــــارو خەســــك بــــی
گــــوزەر گــــاهی تــــە بــــەر ئــــەوجی فەلــــەك بــــی
گــــەر ئــــەز دەســــتت بــــەر ئــــایوو پۆســــت ئــــەز تــــەن
بەرەفکــــەن تاكــــە بــــارت كەمتــــەرەك بــــی

واتاکەی :-

ئــــەی دڵ رێگــــەت بــــا پــــڕ لــــە دڕك وداڵ بــــی
رووت بــــەرەو کاکێــــشانی فەلــــەك بــــی
ئگــــەر بــــۆت کــــرا پێــــستت رزگاربکــــەی لەدەســــت لــــەش
لەشــــت بــــەجێ بهیڵــــە تــــا بــــە کــــۆڵێکی ســــووك دەر بــــچێ

باباتاهیر ئاخافتن لەگەل خۆی دەکات وەك د. مارف دەڵێت بەدڵی دەڵێت کە گوناهی زۆرە، ئەم گوناهە بێ گومان لە لەشدا خۆی دەنوێنی، بۆیە دەڵێ لەشی قورسی پڕ گوناهت بە جێ بهێڵە تا بە سووکی بگەیە جێ وبارت قورس نەبێ.

فەهمی کاکەی لە لا۹۳دا دەڵێت :- ئەی دڵ ڕێگات پڕ لە دڕك وبەردە، گوزەرگات بەسەر فەلەك بێ، گوناهت هەڵوەرێنە تا بارت سووك بێت کە دەچیتە حزوری خودا .

(۲۱۱)

شـــەو تـــار و بیابـــان پـــر وەرك بـــی
هەمـــە ســـەحرا پـــڕ ئـــەز خـــارو خەســـك بـــی
نـــە باشـــد ئەنـــدەرین ڕە ڕوشـــنایی
خوشـا ئـان کـەس کـە بـارش کەمتـەرك بـی

وەرك =گورگ. ئەندەرین =عالەم . کەمتەرك =کەمتر، سوکتر .خەسك =بەرد، کەستەك.

(*) بابا دەڵێت :-ئەگەر شەو تاریك و بیابان پڕ لە گورگ بێت، بیابان هەمووی پڕ دڕك ودالْ و بەرد بێ، هیچ ڕێگا لەم دونیایەدا ڕوون نەبێت .خۆشە لە دوا ڕۆژی حیسابدا بارت سووك بێت و گوناهت نەبێ.

(۲۱۲)

مسلـــسل زوڵـــف بـــەر ڕوو ڕێتـــە دیـــری
گـــوڵ و ســـونبل بەهـــەم ئامێتـــە دیـــری
پەریـــشان چـــوون کـــەری ئـــان تـــارو زولفـــان
بـــە هـــەر تـــاری دڵـــی ئاوێتـــە دیـــری

مسلسل = قەف .باقە. ڕێتە دیری =دارژاوەتەوە، شووڕ بوەتەوە .ئامیتە =هاودەمبوون، بوونە یەك. ئاویتە =هەڵواسراو.

دلزار لەلا ٥٥دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

بەســـەر ڕوتـــا زوڵـــف قـــەف قـــەف رژاوە
کـــەوا ســـونبل بـــە گـــولّ تێکـــەلّ کـــراوە
پەریـــشان چـــوون ئەکـــەی تـــۆ تـــاری زوڵفـــان
بەهـــــەر تـــــاریّ دلّـــــیّ هەڵواســـــراوە

صدیق بۆرەکەی لە لا ٩٥دا لە میژووی ویژەی کوردیدا دەڵێت:-

-زوڵفت بە زنجیرە رژاوەتە سەر ڕوومەتت، ڕوومەتی وەکو گوڵت وزوڵفی سونبولت تێکەڵاو وئاویتە کردووە، کاتی هەودای زوڵفەکانت بلاّوو پەریشان ئەکەیتەوە لە سەر هەر هەوداییکەوە دڵێك هەڵواسراوە .

(*) دەبیّ باباتاهیر شەیدای ئافرەتێکی جوان وقەشەنگ بوبێت وا بەو شێوەیە وەصفی دەکات ؟

پیاوانی سووفی وا بووە کە ڕیش وسمیلّ و سەریان بەر دەدەنەوە و خزمەتی دەکەن، هەروا زۆر جار پیاوانی ماقوول چاویان دەرێژن. پیروانی بابا تاهیر لەو جۆرە بوونە دەشیّ بەوانیدا وتبیّ.

(٢١٣)

تـــە کـــە نازنـــدە بـــالاّ دلـــەر بـــائی
تەکـــە بـــیّ ســـورمە چـــەشمان ســـورمە ســـائی
تەکـــە موشـــکین دەر کیـــسوو دەر قـــەفائی
بـــەمو واچـــی کـــە ســـەر گـــەردان چـــرائی

نازندە= خاوەن .بالاّ = قەدو بالاّ .دلەر بائی =دڵگیری .سورمە سائی =بەسورمە رەشتووتە، بەکل ریژراوی. کیسوو=زوڵف .قەفائی =قەف (قەفی زوڵف).

د.مارف خەزنەدار لەلا٢١٣دا بەم شێوەی خوارەوەی نوسیوەتەوە:-

تەکـــەت نازنـــدە چـــەشموون ســـورمە ســـائە
تەکەتـــــە باڵنـــــدە بـــــالاٚ دلْ روبایـــــە
تەکـــەت موشـــکین گیـــسوو دەر قەفایـــە
ئـــەبێ واچـــی کەســـەر گـــەردوون چـــرایە

واتاکەی :-

تۆکـــە خـــاوەن چـــاوی بـــەکل رێـــژ راو پـــڕ نـــازی
تۆکـــــە خـــــاوەن بـــــالای بـــــرزو دلگـــــیری
تـــــۆکـــــە خـــــاوەن زولفـــــی موشـــــکینی
بـــۆ ســـەر سـام و ســـەر گـــەردانی لـــە ســـەر رووی زەوی؟

لــە دوا دیـڕی چـوارینەکە باباتـاهیر دەڵێـت : (بـەمو واچـی کەسـەر گەردانی چرائی ) د.مارف کردویەبە ئەبی واچی، بە خۆی بەمو واچی راستە( بەمانای بەمن دەڵێی بو وا سەر گەردانی؟.) واتە بابا دەڵێت: تۆ خاوەن ئـەو هـەموو شتەی و مـن عاشقی تـۆم چـۆن پێم دەڵێیـت بـۆ وا سەرگەردانی؟

(٢١٤)

ئەگـــەر دەردم ئێکـــی بـــوودی چ بـــوودی
ئەگـــەر غـــەم ئانـــدەکی بـــوودی چ بـــوودی
بـــە بـــالێنم حـــەبیبی یـــا تـــەبیبی
ئـــەز ئـــین هـــەردوو یـــەکێ بـــوودی چ بـــوودی

ئێکی =یەکی .ئاندەکی=جیهان، دونیا. بوودی =ببی، بووی.
(*) واتە:-

ئەگـــەر دەردی مـــن یـــەکێ بوایـــەی چ دەبـــوو
ئەگـــەر غـــەمی مـــن دونیـــای بوایـــەی چ دەبـــوو
تۆبوبـــاڵای مـــن خوشەویـــستی یـــان تیمارکـــەری
ئەگـەر لـە هـەردووکیان یـەکی بوایـەی چ دەبـوو

بابا لەم چوارینەیەدا بە ئاشکرا دەڵێت کە غەمی ئەم دونیای فانیە لە ئاستی مرۆڤی هاودەمی خۆی نییە، هەوڵدانو غەمی ئەو بۆ دواڕۆژە و گەیشتن بە یار وە دروست بونی یەك بون و شادی هەمیشەیی ئەمەش ئاوات و مەبەستی پیاوانی ئاین و ئاینزانانن کە ئەم ڕێگایە هاڵدەبژێرن.

(٢١٥)

دوو چـــەشموونت پیالـــە پـــرزە مـــەی بـــی
دوو زولفونـــت خـــەراج موڵـــك ڕەی بـــی
هـــەمی وەعـــدە کـــری ئـــەمرووز و فـــەردا
نەزوونـــەم موکـــە فـــەردای تـــو کـــەی بـــی

م. فؤاد حسین بەم شێوەی نوسیوەتەوە لەلا ٤٢دا:-

دوو چـــەشمانت پیالـــە پـــرزو مـــەی بـــی
خـــەراج ئـــەبروانت ملـــك ڕەی بـــی
هـــەمی وەعـــدە کـــری ئیمـــروز وفـــەردا
خـــودا نەکـــەی فـــەردای تۆکـــەی بـــی

م. فؤاد لە سەر ڕای م.عەلاء الدین سجادی لە کتیبەکەیدا دەردەخات وەدەڵێت :-" باباتاهیر فاتمە ناوێك بە دوو چاوی مەست ودوو ئەبرۆی هیلالی یەوە بە دەنگدانی ئیمروز و سبەی کورەی دڵی بابا تایەر دینیتە

جۆش و ئەبێتە هۆی ئەوە کە قاپی شیعری لێ ئەکرێتەوە بۆیە لەم چوارینەیە دەدوێت.

پرزە =نمە. فەردا =سبەی .خەراج =سەرانە، باج. ڕەی =شاری ڕەی.

(٢١٦)

دڵم بی عەندەلیب خۆش نەوائی
کە مینالند زەغم هەر سوبح گاهی
بە شاخ گوڵ سەحەر بەلبل هەمی گوفت
کە ئەی گوڵ بێ وەفائی بێ وەفائی

عەندەلیب (وشەیەکی عەرەبییە) = ناوی بولبلە.خۆش نەوا = خۆش ئاواز. مینالند = دەناڵێنی .سوبح گاه = بەیانیان، سبەینان.بەشاخ =بەسەر لوتکە.

(٢١٧)

تار زولفت چرا بەسەر لالە دیری
نەرکس ڕا ناز دەر دونبالە دیری
سەرێ ڕۆژی بیشم دەر نیاری
کە دەرناز چەندین ساڵە دیری

واتا:-

چۆن ئەو زولفە ڕەشانەت ها بە سەر گوڵاڵەوە
ئەو نازەت لە بەردەوامی نازی نەرکسەوەیە
ڕۆژێك سەرێت لە پێشی من دەر نەهێنا
تۆ چەند ساڵە وا لەم نازەدای

ئایا لەم چوارینەیە باباتاهیر لە ناخی عیشقی یارێکی زولف ڕەشە یان ئەم عیشقە مەجازیە ؟.

(٢١٨)

مـــو ڕا نـــه فکـــر نـــه ســـه‌ودائی نـــه ســـوودی
نـــه ده‌ر دڵ فکـــر بـــه‌هبوودی نـــه بـــوودی
نـــه‌خواهم جـــو کنـــا ر و چـــه‌شمه ســـاروون
کـــه هـــه‌ر چـــه‌شمم هـــه‌زارون زنـــده روودی

نه‌سود =بێ سود . به‌هبوود=چاکه. جو کنار =ڕۆخی رووبار.ساروون =کانی، بێ گه‌رد.زنده روود=زێی رویشوو، (پڕ ئاو ).

(*) باباتاهیر چاوه‌کانی وه‌ك رووباری تیژ ره‌و فرمیسك لێی دێته خـوار، چونکه یار هیچ ئاورێکی لێ ناداته‌وه، خۆی پیشان نادات . ئه‌مه‌ش جـۆره سکالآیه‌که ده‌ربرینی باری ده‌رونیه‌تی بۆ به‌رامبه‌ر که‌شه‌یدای بووه

(٢١٩)

نیگارینـــــــا دڵ و جـــــــانم تـــــــه داری
هه‌مـــــه په‌یـــــدا و پـــــه‌یمانم تـــــه‌داری
نمیدونـــــه‌م کـــــه‌ئین ده‌رد ئه‌گـــــه‌ر دارم
هـــه‌مین دونـــه‌م کـــه ده‌رمـــونم تـــه‌داری

د. مارف خه‌زنه‌دار به‌م شێوه‌ی نوسیوه وکردویه به سورانی:-

نیگارینـــــا دڵ وجـــــانم تـــــه دیـــــری
هه‌مـــــه په‌یـــــداو پـــــه‌نهانم تـــــه دیـــــری
نه‌زونـــه‌م موکـــه ئـــین ده‌رد ئـــه‌ز کـــی دیـــروم
هـــه‌می زوونـــوم کـــه ده‌رمـــانم تـــه دیـــری

واتاکه‌ی:

ئـــه‌ی جـــوان تـــۆ خـــاوه‌نی دڵ وگیـــانی منـــی
تـــۆ خـــاوه‌نی بـــوون و نـــه‌بوونی منـــی
مـــن نـــازانم ئـــه‌م ده‌رده‌م لـــه کوێـــوه هـــاتووه
بـــه‌لآم ئـــه‌وه ده‌زانم کـــه ده‌رمـــانم لای تۆیـــه

دلزاریش لەلا٥٧دا کردویە بە سورانی. پاشان د. مارف دەلێت : -" بابا نازانی لەبەر چی مەیلی بۆ مەعشوقە هەیە، بەلام لەوە دلنیایە کە ئەم ڕەوشتەی ڕاستە، توانەوە لە ناو مەعشوقە ئامانجی دوایی یەو ئەگەر عشق دەرد بێ، ئەوا دەرمان لای مەعشووقەیە.

(٢٢٠)

غەم عالەم نەسیب جان ما بی
بە دەرد ما فراغت کیمیا بی
رەسد ئاخر بە دەرمان دەرد هەرکەس
دلْ ما بی کە دەرمانش بە لا بی

فراغت = بۆشایی، دەست بەتالی.رەسد =دەگات. کیمیا =کەس نەدار . بەلا =ئافەت .

(٢٢١)

مادام دلْ پڕ ئاتەش دیدە تەڕ بی
ئەساس عەیشم ئەز خوون جگەر بی
تەکە هەرکز نەسوتە جانت ئەز غەیر
کوجا ئەز سوتە جانانت خەبەر بی

دیدە تەڕبی =چاوان بە فرمێسك بوو. ئەساس =بناغە . عەیش= ژیان.

(٢٢٢)

هەمایونم سەر کۆهم وەتەن بی
سەیر عالەم کەردم هەر جا چیمەن بی
نەخون دیرم نەمون دیرم نە سامون
دەم مردن پەڕو بالْم کفن بی

هەمایون =پیرۆزی .

فەهمی کاکەی بەم شێوەیە کردویە بە سۆرانی :-

هەڵویەکی لوتکەی کێوی‌وەتەن بی
سەیری عالەم دەکەم گشتی چەمەن بی
نەخانم هەس نەمانم هەس نەسامان
کاتی مردن پەڕو باڵم کفن بی

(*) باباتاهیر خۆی لە ئارەزوەکانی دونیا دوور دەخاتەوە، دەستی لە خۆشی ژیان هەڵگرتوە، تا لە مەعشووقە نزیك بێتەوە.

(٢٢٣)

جان بێ وەفا زندان ما بی
خار غەم قسمەت دامان ما بی
سەبر ئەیوب ومحنەتهای یەعقوب
هەمە گوئی نەسیب جان ما بی

دلزار لەلا٨٢دا بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سورانی :-

دونیای بێ وەفا زیندانی مەیە
درکی غەم بەشی دامانی مەیە
سەبری ئەیوب ومەینەتی یەعقوب
هەمووی نەسیبی گیانی مەیە

(٢٢٤)

هەمە بەند تەنم مانەند نی بی
مەدامم دەرد هیجرانت ژ پی بی
مە را سوز و گودازە تا قیامەت
خودا دوونە قیامەت تا بەکێ بی

بەند =پەیکەر، پەت. نی =شمشاڵ .پێ = دەوا. گودازە =قووڵ، سەخت.

(٢٢٥)

چ خۆش بی وەسڵت ئاهەنگێك بی
مەرا وەسڵ تو ئارام دڵەك بی
زە هیجرت ئەی بت شیرین چالاك
دەمادەم دەست حەسرەت بەر سەرك بی

دڵەك =دڵت . سەرك = سەرت. دەمادەم =دەم دەم، جارجار.

(٢٢٦)

خورەم ئوون دڵ کە ئەز غەم بەهرەوەربی
پاوەن دڵ وای کز غەم بێ خەبەر بی
بەبازار موحەبەت نەقد رایج
کەسێ دارە دەرونش سووتەربی

پاوەن =پاوەند، خرخاڵ.کز غەم =کزەی غەم .نەقد =شتی بەنرخ .رایج = رەواج.

(*)واتا :-

ئەو دڵەم خۆش دەوێ کە بەهرەداری غەمە
دڵ کەپاوەنەو لە تینی غەم بێ خەبەرە
لەبازاری موحەبەتدا جۆرە نەقدێك رەواجدارە
ئەوکەسەی سووتاوی دەروونی زیاترە

(٢٢٧)

رووزم ئەز شەو شەوم ئەز رووزبەتربی
بەخت ئاشفتەم زیرو زەبر بی
شەوو رووز ئەز فەراغت ناڵەمو
چو ئاە بێ نەوایان بێ ئەسەر بی

بەتر بی =خرابتربی .ئاشفتەم =شپرزەم . زیرو زەبر =ئەم دیو ئەو دیو، سەرو ژیر. فەراغت =نەبوونیت، دوریت .بیٚ نەوایان =بیٚ جیگا وریگا، سەر گەردان .

(۲۲۸)

خـــۆر ئـــاین چـــەهرەت ئەفروختـــەتر بـــی
بـــە جـــانم تـــیر عـــشقت دووتـــە تـــر بـــی
زە چ خـــــالٚ رەخـــــت زوونـــــی ســـــیاهە
هـــەر ئـــان نزدیـــك خـــۆر بـــی ســـووتەتربی

ئەفروختە =هەلٚگیرساو .دووتە= دووتا، دووبارە .خالٚ = خەیالٚ. رەخت =بەرگ، جل وبەرگ .ئایین =تین، شرارە.

(۲۲۹)

زە ئـــاهم هـــەفت گـــەردوون پـــڕ شـــەرەر بـــی
ئەگـــەر ئـــاوا كـــەرم خـــوون جگـــەر بـــی
تەكـــە ئـــەز غـــەمی دلٚـــت هـــەرگیز نەســـووتە
كوجـــا ئـــەز ســـووتە دلٚهـــا بـــا خەبـــەر بـــی

پڕ شەرەر =پڕ گڕی ئاگر .كوجا =لەكویٚ. سووتە دلٚها =دلٚ سوتاوان.

(۲۳۰)

هـــەزارون لالـــە گویـــەن دەر جیهـــان بـــی
هەمـــە بـــەر مودهـــەن پـــڕ دلٚ گـــران بـــی
ئالالـەی خـوٚم كـە خـوٚش ڕەنگەسـت و خـوٚش بـوٚ
ســـــەر ئـــــەفراز هەمـــــە ئالالیـــــان بـــــی

گویەن = دەلٚین. بەر مودهەن =لە ماوەیەگدا ..سەر ئەفراز =سەر بلٚند، سەر فراز.

(٢٣١)

شـــەوم ئـــەز شـــام یلْـــدا تـــیر تـــر بـــی
دەرد دلْـــم ئـــەز بـــو دەردا بـــەتربی
هەمـــە دەردا رەســـن ئـــاخر بـــەدەرموون
دەرمـــان دەرد مـــا خـــود بـــیْ ئەســـەر بـــی

یلْدا =شەوێکە ڕێك کەوتی نیوان پایزو زستانە لە هەمو شەووکان دریژترە، گوایە شەوێکی شووم ونەکبەتە.

تیر تر بی =تاریك تر بی .ئەز بو دەردا =لەم دەردە . ڕەسن =دەگەن.

(٢٣٢)

شـــەویْ کـــە نـــازەنینم ئـــەز دەر ئـــائی
گوزەشـــتە عـــومرم ئـــان شـــەو تـــەر ســـەر ئـــائی
هەمـــە شـــەو دیـــدە مـــو تـــا ســـەحەر گـــاە
بـــود بـــەر راە تـــە تـــا خـــود بـــەر ئـــائی

سەحەرگاە =شەفەق .ئائی =بێیت .دەر =دەرگا، دەرەوە. گوزەشتە =تێپەر بوو.

(٢٣٣)

پـــیْ مـــەرگ نـــە گویـــان گـــولْ نـــەروئی
وەگـــەر روئـــی نـــەرەنگش بـــی نـــەبۆئی
زە خـــودرو هـــیچ حاســـلْ بـــەر نـــەخیزەد
بەچـــز بـــەد نـــامی وبـــیْ ئـــابرویی

نەگویان =نەڵێن .بۆئی =بۆن .ڕووئی =ڕواندن، نیگا .
نەخیزەد =سەر هەڵدانی نابی، نەگرتن . خودڕو= سروشتی، لە خۆوەڕواو.

(٢٣٤)

زەرێ چـــوون مـــو نـــە ئەنـــدەر بووتـــە بـــی
نـــە چـــوون مـــو غـــەم بـــە دڵ ئەندوتـــە بـــی
بـــەجز شـــەمعم ببـــاڵین هەمـــدەمێ نیـــست
کـــە یـــار ســـووتە دڵ، دڵ ســـووتە بـــی

زەر =زربـرا، نائەصـڵ، بوتـە =بـۆ تـۆ .ئەندوتـە =عالـەم . ئەندوختـە = پاشەکەوت کردن .باڵین = سەرین .هەمدەم =هاودەم .

(٢٣٥)

ســـەرا ســـەر هـــوون نـــشینەم تـــا تـــۆ ئـــائی
دەر شـــادی بـــە رووی مـــو گـــشادی
ئایـــە ڕوزی بـــە ڕوز مـــو نـــشینی
بـــوێنی تـــا چ ســـەختە بـــێ وەفـــایی

ئایی =هاتی، دێی . گشادی =دەکشێتەوە، دەرەویتەوە .
هوون =خوون .هونە =خانە، ماڵ.

(٢٣٦)

زە شـــور ئـــەنگیزی بـــی چـــەرخ وفەلـــەك بـــی
کـــە دایـــم چـــەشمی زەخمـــم پـــڕ نمـــەك بـــی
دەمـــا دەم دوودی ئـــاهم تـــا ســـەماوات
تـــەنم نـــالان و ئەشـــکم تـــا سمـــك بـــی

شور ئەنگیز =هەیەجان، خراپی . سمك =ئێسقان (وشەیەکی تورکیە)
د.مارف خەزنەدار بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سورانی:-
بە هـۆی ئەو خراپی یەی لە چەرخ وفەلەکەوە بۆم دێ
هەمیـــشە چـــاوی بـــرینم پـــڕ خـــوێ دەبـــێ
دەمـــاودەم دووکـــەڵی ئـــاهم تـــا ئاسمـــان دەڕوا
لەشـــم دەنـــاڵێ وفەرمێـــسکم دەگاتـــە( ماســـی)

هەر وا دەڵێ :-باباتاهیر بۆ دەربرینی هەستی بەرامبەر بەوەی لە دڵی دایە کە هەر یارە وعەوداڵی ئەوە، وێنەی ڕەسەنی ئەوتۆ دروست دەکا کە دەبێتە نمونەو هەرگیز فەوتانی بۆ نی یە.

(٢٣٧)

مـــەدامم دلْ پـــڕ ئـــازەر دیـــدە تـــەڕ بـــی
جـــام عەیـــشم پـــڕ ئـــەز خـــوون جگـــەر بـــی
زە بویـــەت زینـــدەگی یـــا پـــەس زەمـــەرگ
تـــە راگـــر بەســـەر خـــاکم گـــوزەر بـــی

جام عەیشم =دەرگای ژیانم .زە بویەت =لە بوونت .ڕاگر = ڕێ گر، رێڕەو. یاپەس =پەروشی، دەر حالْ.

(٢٣٨)

فەلـــەك دەر قەســـد ئـــازارم چـــرا بـــی
گـــوڵم گـــەر نیـــستی خـــارم چـــرا ئـــی
تەکـــە بـــاری زە دۆشـــم بـــەر نـــەداری
مـــەیان بـــار ســـەر بـــارم چـــرائی

دۆشم =کۆڵم، شانم .بەر نەداری =لانەدەی، دانەگری .مەیان = نێوان.

(*)واتە :-

ئـەی فەلـەك تـۆ لـە ئـازاردانی مـن چـۆنی
ئەگـەر گـوڵ نیـت بـۆم بۆچـی دڕکـی
تـۆ کـە بـاری سـەر شـانم سـوك ناکـەی
لـە نیـوان ئـەو بارانـەی کـۆڵم بۆسـەر بـاری

(٢٣٩)

بـــــەدەریای غـــــەمت دلْ غوتــــەوەر بـــــی
مـــەرا داخـــی فیراقـــت بـــەر جگـــەر بـــی
بەچـــــەشمم قـــــەترەهای ئەشــــك خـــونین
تـــوو گـــوئی لالـــەی بـــاغی ســـەحەر بـــی

غوتەوەر =مەلە کردن لە دەریای غەمدا، دالْغە لێدان .
(*)واتاکەی :-

لـەدەریاە غـەمی تۆیـا دلْـم زیـاتر پـڕ غـەم بـوو
وەلــە دووری تۆیــا داخێــك داویــە لەجگــەرم
وەلــە چــاوانم فەرمێــسکی خــوێنین دێتــە خــوار
تــۆ وتــت گولاْلــە ســوورەی بــاغی ســەحەرە

(٢٤٠)

دلْــــی نــــازك میــــسال شیــــشەم بــــی
ئەگـــەر ئـــاهی کـــشم ئەندێـــشەم بـــی
سرشـــکم گـــەر بـــوود خـــونین عەجـــەب نـــی
موئـــان دارم کـــە دەر خـــوون ڕیـــشەم بـــی

د. مارف خەزنەدار لەلا٢١٨دا بەم شێوەی نوسیوەتەوەو کردویە بە سورانی :-

دلْـی نـازك بـە سـانی شیـشە ئـەم بـی
ئەگـــەر ئـــاهی کەشـــم ئەندیـــشەئەم بـــی
سریـشکم گـەر بـووە خـوونین عەجـەب نیـست
مـوو ئـان دیـرم کـە دەر خـوون ڕیـشە ئـەم بـی

واتاکەی :-

دڵـــــی ناســـــکم وەك شووشـــــە وایـــــە
ئەگـــــەر ئـــاە بکێـــشم گێتـــی دەســـووتێ
ســـــەیرنی یـــــە فرمێـــسکم ببێتـــــە خوێنـــاو
مـــن ئـــەو شـــتەم دەمـــار لـــەناوخوێن دایـــە

(٢٤١)

صـــــەفا هـــونم صـــەفا هـــونم چ جـــائی
گەهـــــەر یـــاری گرفتـــەم بـــێ وەفـــائی
شـــوم یەکـــسەر برونـــەم تـــا بـــە شـــیر ئـــەز
کـــە دەر هـــەر مەنزلـــەم صـــەد ئاشـــنائی

صەفا =صەف، ریز. گرفتەم =تووشم بوو .شووم =شام، جووت بووم .برونەم =تەماشا بکەم.بەشیر =پەیام هێنەر، موژدە هێنەر .

(٢٤٢)

بـــە نـــادانی گرفتـــەم کـــورە ڕاهـــی
شـــودەم بـــا تووســـوی کوهـــسار ڕاهـــی
بـــە دل گوفتـــەم رەفیقـــی تـــا بـــە مـــەنزل
نـــە دونـــستەم رەفیـــق نێمـــە ڕاهـــی

بەنادانی =بەنەزانی.کورە ڕاهی =کوێرە ریگایەك.شودەم =بوومە .کوهسار=شاخاوی .گرفتەم =گرتمە بەر.

(٢٤٣)

مـــەدامم دل پـــڕ ئـــەز خـــوون جگـــەربی
مـــەدامم جـــان حـــەزین بـــی دیـــدە تـــەڕ بـــی
نـــشینەم بـــەر ســـەری ڕاهـــت شـــەوو ڕووز
بـــوود ڕوزی تـــووڕا بـــەر مـــو گـــوزەر بـــی

دڵزار لەلا ٩٤دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-
مـــادام دڵ پـــڕ بـــی لـــە خـــوێنی جگـــەر
مـــادام گیـــان زاربـــی ودیـــدەکانم تـــەڕ
شـــــەووڕۆژ لەســـــەرڕێت دائەنیـــــشم
ڕۆژی دێ بکـــــەی بـــــەلاما گـــــوزەر

(*)باباتاهیر دڵ نەوای خۆی دەکات، کە هەمیشە لە گریان وفیغاند لە گیان بێزاربووە، بەڵام لەگەل ئەوەشدا شەوو ڕۆژ لە سەر ڕێگای دادەنیشێ، دەبێت ڕۆژێك بێت وبەلایا تێپەڕ بکات، تاباش چاوی پڕ بکەوێ، وشاد بێت .

(٢٤٤)

سـیە بـــەختم کـــە بـــەختم واژ گـــون بـــی
سـیە ڕوزم کـــە ڕوزم تـــیرە گـــون بـــی
شـــودەم محنـــەت کـــیش کـــۆی موحەبـــەت
زە دەســـت دل کـــەیارەب غـــەرقی خـــوون بـــی

سیە بەختم =بەختی ڕەشم .واژ گون =سەرەو خوار.تیرە گـ =تارمایی، تاریك .

(٢٤٥)

چ شـــەو بـــی تـــوو، ســـەرم بـــەر بـــاڵش ئـــائی
چـــونی ئـــەز ئەســـتخوانم ناڵـــەش ئـــائی
شـــەوی هیجـــروون بـــەجای ئەشـــکم ئـــەز چەشـــم
بـــە موژگـــان شـــەعلەهای ئاتـــەش ئـــائی

باڵش =باڵی، ئامێزی .چونی =خەرمان . ئائی =دێیت.

(*) لیرەدا باباتاهیر باس وخواسی خۆی دەکات بۆ یاری نادیار وەدەڵێت :-لە دووری یار غەم وپەژارە دایگرتوە تا ناخی ئیسقان، کە ئیسقانەکانی هەمووی دەناڵێنن لە ژێر ئەو بارەداو لە چاواندا فەرمێسکی ئاگرین دەبارێنی.

(٢٤٦)

بەجز ئین مو نەدارم ئارەزوئی
کە باشد هەمدەمێ مو لالە روئی
ئەگەر دەردی دلم واژم بە کۆهان
دیگەر دەر کوهساران گوڵ نەروئی

واژم =وەرکیرم، بیخەمە.

(*)باباتاهیر بێزار بووە و هیچ ئارەزویەکی نەماوە، ئەوەندە دەرد وغەمی زۆرو گرانە ئەگەر هەڵی ڕێژیتە سەر چیا ئیتر لەو چیایانەدا گوڵ ناروێت. واتە ئەو چیانەش ناتوانن ئەو غەم ودەردەی بابا هەڵگرن.ئەوەندە سەخت وقورسە .

(٢٤٧)

دڵی بێ عیشق ڕا ئەفسەردەن ئەوەلی
هەرکە دەردێ نەدارە موردەن ئەوەلی
تەنی کە نیست پا بەست دەر راه عیشق
زەرە زەرە بە ئاتەش سووتەن ئەوەلی

ئەفسەردەن =خەموکی، نوقمی غەم بووە . موردەن =مردوە .نیست پا بەست = پەیوەندی نەبێت .

(٢٤٨)

منــــی دڵ ســــــووته رالایـــــەق نــــەزونی
کـــــە دەر دیـــــوانی عوشـــــاقت بخـــــونی
هـــــەزارون یـــــار ئـــــەز خـــــوونی بەیەوکـــــەم
زە تـــــوو زیـــــرا کـــــە بـــــەحر بیکـــــەروونی

لایـەق =ڕەوا .عوشـاق =عاشـقان.بەیـەو کـەم =بێـت کەمـە.بیکـەرونی =بەتاڵە، خالیە.خوونی=ماڵ، بخوونی= لەخوێندنەوە واتە خوێندن.

(٢٤٩)

یـــــەقینم حاصـــــلە کـــــە هـــــەرزە گـــــردی
ئـــەز ئـــین گـــەردش کـــە داری بـــڕ نـــەکردی
بـــــەرویی مـــــو ببەســـــتی هـــــەر ڕاهـــــی ڕا
بـــەدین عـــادەت کـــە داری کـــە نـــەموردی

هـەرزە =جلفـری، وەرەڵاڵا، گوشـادی . بـڕ نـەکردی =بـڕت نـەکرد، نەگەیشتی.بەروویی مو=بەروی من.نەموردی =نەمردی

(٢٥٠)

کـــــەرێمی کـــــە مـــــەکانش لامـــــەکان بـــــی
صـــــەفا بەخـــــشی تـــــەمامی گولـــــەرخان بـــــی
نیگاهدارنـــــــدەی ڕووز وشـــــــەوی خـــــــەلق
بەهـــــەر جـــــان بەنـــــدای ڕووزی ڕەســـــان بـــــی

صەفا =چـاکە، خۆشـی.گولـەر خـان =دونیـا رازاوە بـەگوڵ، جێگاکـان بـوون بـە گـوڵزار.نیگاهدارنـدەی=بـە ئاگـابوون . بەهـەر جـان بەنـدای= پەیوەنـدیت بـە هـەر کـێ کـرد .ڕوزی ڕەسـان =ڕۆژی شـادبوون، ڕۆژی گەیشتن بە ئاوات..

(٢٥١)

بواچـــی کـــە چـــرا تـــە بـــیٚ قـــەراری
مەگـــەر پـــەروەردەی بـــادی بـــەهاری
چـــرا گـــەردی تـــوو کـــوە ودەشـــت وســـەحرا
بـــە جـــانی تـــە نـــە دارم ئـــەختیاریٚ

دڵزار لەلا٤٩دا بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سورانی :-
ئەبیـــژی پـــێم کـــە بۆچـــی بـــیٚ قـــەراری
ئـــەڵێی پـــەروەردەی بـــایی بـــەهاری
لـــە بۆچـــی دیلـــی کێـــوو دەشـــت وســـەحرای
بـــەگیانت نیمـــە تـــاویٚ ئیختیـــاری

بواچی =بلێم .گەرد = گەڕان، سەیران .باد=با، هەوا.

(٢٥٢)

نـــە پەنـــداری کـــە بوســـتان خۆشـــترم بـــی
ســـەرم چـــوون گـــۆی مەیـــدان خۆشـــترم بـــی
چـــو گوڵـــشەن تـــارو تاریکـــە بـــە چـــەشمم
گەڵـــستان بـــیٚ تـــە زنـــدان خۆشـــترم بـــی

پەندار =پەنابردن، شاردنەوە.
(*) باباتاهیر بە بیٚ گەیشتن بە یار، دونیای لا زندانە، هەموو شت لە م دونیایەدا تاریکە لە پێش چاوی، بەبیٚ بوونی ئەو سەر گەردانە.

(٢٥٣)

زە بێـــدادی فەلـــەك یـــارون ئـــەمان بـــی
ئـــەمان چیـــستەن ڕوزی ئـــاخر زەمـــان بـــی
ئەگـــەر پـــارە کـــەرم یەخـــە بـــە جـــا بـــوود
کـــەوامو ئـــاسموون پـــڕ، ســـەرگەران بـــی

یـارون =یـاران.چیـستەن=چـین.پـارە کـەرم یەخـە= یەخـە دابـدرین. بەجابوود =بە جێ یە.وامو =هیوام .

(٢٥٤)

تەکـــە نۆشــــم نـــەئی نیـــشم چـــرائی
تـــە کـــە یـــارم نـــەئی پیـــشم چـــرائی
تەکـــە مەرحـــەم نـــەئی زەخـــم دڵـــم ڕا
نمـــەك پاشـــی دڵـــی ڕیـــشم چـــرائی

نۆشـم = خواردنـەوە، نـۆش کـردن .نیـشم =ئـازار . پیـشم =بـەردەم. لەپێش.چرائی =چوونی.ڕیش=ڕەگ.دڵڕێش=دڵنەوایی. نمەك پاشی= بێ نمەك.

(٢٥٥)

مـــو ئـــان ئەســـپیدە بـــازم هەمـــەدانی
لالـــــە دەر کـــــوە دارم دەر نیهـــــانی
بـــەباڵ خـــود پـــەرم کۆهـــان بـــە کۆهـــان
بـــە چـــنگ خـــود کـــەرم نەخـــچیرەبانی

ئەسپیدە باز =هەڵوی سپی . پەرم =دەفڕم. کەرم =دەکەم.
فەهمی کاکەی لەلا٨٥دا کردویە بە سورانی :-
مـــن ئـــەو هـــەڵو ســـپێەم هەمـــەدانی
لانـــــەم لـــــو کێوانـــــە بـــــە پـــــەنهانی
بـــەباڵی خـــۆم دەفـــڕم کێـــوان بـــە کێـــوان
بـــە چـــنگی خـــۆم دەکـــەم نەیـــچیرەوانی

ئینجا دەڵێت :- لە ئاینی ئەهلی هەق مەبەست لە هەڵوی سپی (شاهبازە) یەکێتی بوون وزاتی لایەزالە (خودا) کە نووری ئەو دڵ ودەروونی عاریفان ڕووناك دەکاتەوە.

شیخ مەحەمەد خاڵیش لەلا١٩٧دا گوریویەتی بۆ سەر زاری سورانی .

لەم چوارینەدابابا تاهیر دوو مەبەست دەپێکی: یەکەمیان ئەوەیە کەرۆژ بەرۆژ پلەو پایەی ئاینی بەرز دەبیتەوە، نزیك دەبیتەوە لە یار، کەئەوەش مەبەستی سەرەکیە، ئەوی تر پەرە پیٚ دانی ڕێبازەکەیەتی.

(٢٥٦)

قەدم دایم زە باری غەصە خەم بی
چو من محنەت کشی دەر دەهر کەم بی
مە هەرگز ڕووی ئازادی نەدیدەم
دلٚ بیٚ تالع مو کوٚ غەم بی

خەم =نوشتاوە، چەماوە. غەصە =پیٚ هەڵکەوتن، نزگرە، قەدم =بالاٚم، قامەت .دەهر= زەمانە .

دلٚزارلی لا ٨٤دا بەم شێوەی خوارەوە کردویە بە سورانی:-

پێم دایم لە ژێر باری غەم خەمە
وەك من مەینەت کێشیٚ لە دونیا کەمە
لە دەس خەم هەرگیز ئازادیم نەدی
دلٚی بەد بەختم کوٚساری غەمە

دلٚزار قەدی بە پیٚ داناوە، بەلاٚم لە راستیدا قەدو بالاٚیە.

(٢٥٧)

عەزیزا مەردی ئەز نامەرد نائی
فیغان و نالٚە ئەز بیٚ دەرد نائی
هەقیقەت بشنەو ئەز پوری فرەیدون
کە شوعلە ئەز تەنوور سەرد نائی

دلزار لەلا ٩٥دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

ئــــازیز قـــەت مـــەردی لـــە نامـــەرد نایـــە
فیغـــــان ونالّـــــە لـــــەبیّ دەرد نایـــــە
ڕاســـتی لـــە ڕۆڵـــەی فرەیـــدون بیـــە
گـــــڕ لـــە تـــەنووری سەردوســـڕ نایـــە

فـەهمی کاکـەی دەربـارەی ئـەم چـوارینەیە لـەلا٨٦دا دەڵێـت :-
مەبەستی باباتاهیر ئەوەیە،
چاوەڕیی کاریك مەکە لە کەسێکەوە کە شیاوی ئەنجامدانی ئەو کارە نەبێت. بابا ئاشکرا دەڵێت کە ناوی باوکی فرەیدونە وەك دەڵیّ (حەقیقەت بشنەو ئەز پوري فرەیدون).

(٢٥٨)

کێــشم ئــاهیّ کــە گــەردوون باخەبــەر شــیّ
دلّ دێوانــــــــەم دێوانــــــــەتر شــــــــیّ
بـــــەترس ئـــــەز ســـــۆزئاه ســـــوته دلآن
کــــە ئــــاه ســــوته دلآن کــــارگر شــــیّ

باخەبەر شیّ = بەخەبەربێت، کارگر= کاریگەر

(٠) پیـاوانی ڕێبـازی سـۆفیگەری لـەناخی زیکـرو موناجاتـدان بـۆ وەگـڕ خـستنەوەی فکـر و ویـژدان لـە دونیـای بونـدا، لـە پـالّ مـەحروم کردنـی ئارەزووەکانی دەرون و ئازاردانی تـەن بـۆ خاوێن بونـەوەی روح وە نزیـك بوونەوە لە حەقیقەت وە یەکبون و شادبونی هەمیشەیی.

(٢٥٩)

ڕو خـــوونی ئـــەز حـــەیا خـــوون ڕیتـــە دیـــری
دوو مـــژگونی بـــە زەهـــر ئامێتـــە دیـــری
زە جـــادوئی دەر ئـــان چـــاهی زەنخـــدان
دڵـــــی هــــاڕووت ڕا ئاویتـــــە دیـــــری

ڕێتـە = وڕ بـوون وگیـژی. ڕو =شـەرم، حـەیا. خـوونی =ماڵـەوە .ئامێتـە =ئاوێتە .چاه =شوێن، زینـدان .زەن خـدان =ئاماژەیـە بـۆ زنـدانی ناو بیر (وەك ئەوەی حەزرەتی یوسف)دوومژکونی =دەم وفکری. جادوو=سحر. هارووت =ئاماژە بە هاروت وماروت دەکات .

(٢٦٠)

دەر ئەشـــکم بـــە دامـــان ڕیتـــە ئـــەوەلی
خـــوون دڵـــم زە چـــەشمان ڕیتـــە ئـــەوەلی
بەکـــەس حـــەرفێ زە جـــۆرت وا نـــەواجم
کـــە جـــورم جـــۆر پـــەنهان ڕیتـــە ئـــەوەلی

لە چاپی کۆندالەجیاتی (کە جورم جۆر) نوسراوە (حەرف جۆر).

بە دامان ڕیتە = لەدامێنی ڕێگاتە .بە کەس حەرفێ =بەکەس قسەی وام .زە جورت وا نەواجم=بەم جۆرەی تۆم نەوتوە.کە جورم جۆر پەنهان = کە گوناە بەم جۆرە پەنهان.

(*) بابا تاهیر بە دولبەرەکەی دەڵێ: ئەم خۆبەخت کردن وگوفتارانە بۆ کەس نەوتراوە تەنها ئەی یار بۆ تۆ نەبی، ئەگەرئەم جۆرە گوناهە لەسردایە لە ئەزەلەوەو لەڕێتایە .

(٢٦١)

زەنم ئـــەز بەهــــەريـــارێ كــێج و وێجـــی
شـــەوانم ئـــاوارە ئـــەز چـــەشمان برێجـــی
هەركـــــە راز دڵـــش واچـــــە بـــــە مــــەردم
يــــا ئــــەز ديــــوانكی بـــويـــا زە كێجـــی

زەنم =دەست پیێ دەكەم . كێج و وێجی =گیژو وێژی . واچـە =بلێ .برێجی =برێژی . ديوانكی = شێتم

(*) باباتـاهير لـە جـۆری عبادەت و زكـر كردنـی ئـاينی دەدوێـت لـە چـوارينەيەدا، كـە دەبێـت عبـاتی ڕاستەقينە لـە نهێنـی وخەڵوەتـدا بێـ بەهێزدەبێت جيگای خـۆی دەپێكـێ، ئەوەی رازی دڵـی خـۆی بـۆ كـە بلێتەوە يان نهێنی ئاشكرا بكات، شێتە يان گێژە(گێلە).

(٢٦٢)

دڵ تــــوو كـــەی زە حـــاڵم بـــا خەبـــەر بـــی
كوجـــا رەحمـــت بـــەئين خـــونين جگـــەر بـــی
تـــە كـــە خـــونين جگـــەر هـــەرگز نـــە بـــوودی
كـــەی ئـــەز خـــونين جگـــەرها بـــا خەبـــەر بـــی

(*) باباتاهير مەعشووقەكەی بە دڵ ناو دەبات، چـونكە لـە دڵـدا داينا هـەرگيز لـە بيری ناكـات، بـیێ ئـەو ژيـان لـەپێش چـاوی تاريـك وتاڵـە. پرسياری لیێ دەكات كەی لە حاڵی پەشێوی بابا خەبەر دار دەبێت؟
لە دووری ئەودا جگەری بۆە بە خوێن.

(٢٦٣)

شــــەوم تاریــــك و ڕوزم تــــیره تــــر بــــی
بــــەخت ئاشــــفتەم زیــــر و زەبــــر بــــی
زە موژگــــان خــــەدەنکش خــــوردام تــــیر
کــــە ناســــۆرش بەهــــەر دەم تــــازە تــــر بــــی

تیره =تارمایی . ئاشفته =بەد بەخت . زیرو زەبر =ترس و زۆرداری، زەبری پیێ کەوتوه .خوردام =خواردم .ناسۆر = برین وناسۆر

(٢٦٤)

کەســــیێ کــــە رەبــــە بێــــدارم بــــره نــــی
خەبــــەر بــــەر ســــەرو ئــــازادم برەنــــی
تــــەمام خــــوب رویــــان جــــەمع کردەنــــد
کەســــیێ کــــە یــــادت ئــــەز یــــادم بــــره نــــی

دلزار لە لا٨٥دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

کەسیێ نێیە ڕێم بۆ بیێ دادم بیا — خەبەر بۆ سەرووی ئازادم بیا
سەر پاکی جوانان گەر کۆبنەوە — کەس نێیە یادت لە یادم بیات

(٢٦٥)

خودایــــا دلێ زە مــــو بــــستوون بــــوزاری
نمــــی ئایــــە زە مــــو بیمــــار داری
نمــــی دوونــــەم لــــەبی لــــەعلت بخوونــــەم
چــــرا تــــشنە ئەســــت بــــائین ئابــــداری

زەمو=لەمن . بستوون =وەر گریێ، بسێنیێ .بەزاری =بەزۆری . نمی ئایە =نایەت . بێمارداری =بریندراری . تشنە =تینوو . ئابدار =ئاودار .لەب =لێو . لەعل =گەوهەر .

(٢٦٦)

ئەگــــەر نـــا میهرەبـــانیم میهرەبـــان بـــی
چـــرا ئـــەز دیـــدەکانم خـــوون ڕەوان بـــی
ئەگـــــەر دولْبـــــەر بـــــەمو دڵـــدار میـــــشد
چـــرا دەر تـــەن مـــەرا نـــەدڵ نـــەجان بـــی

میهرەبانی =دۆستایەتی. میشد = دەبێت .

(*) ئاواتی باباتاهیرە کە دولْبەر ببێتە دڵداری و دڵ و گیانی ئیتر دڵ گیانی ناوێت .ئەمەش گەورەترین ئاواتی بابایە لە ناخی سۆفیگەریدا، تا بە یەکجاری شادی بیگرێتەوە.

(٢٦٧)

بـــە ســـوی بـــاغ وبۆســـتان لالـــە وا بـــی
هەمـــە مووهـــا میـــسالی ژاڵـــە وا بـــی
وەگـــــەر ســـــوی خوراســـــان کـــــاروان ڕا
رەهـــانم مـــو ســـوی بـــە نگاڵـــە وا بـــی

وابی =کرایەوە، دەمی کردەوە .موو= تەور .ژاڵە، درەختی پڕ گوڵ و تاڵە.بەنگاڵە = جیێ گرتن، ، شوێنی داخراو .رەها =ئازاد.

(*)باباتـاهیر لێـرەدا جـۆرە پـێش بینـی دەکـات لـە ژیانـدا، ئەوانـەی دەخولێنەوە لەناخی سوفیگەری دا لە دونیای ئاین ئاین زانیدا ئـەم جـۆ رە پێشبێنانەیان هەیە .

(٢٦٨)

بـــەدامی دولْبـــەری دڵ موبتـــەلا بـــی
کـــە هیجـــرانش بـــلا وەصـــلش بـــەلا بـــی
دەر ئـــین وێرانـــە چـــز دڵخـــوون نەدیـــدەم
نـــەدڵ گـــوئی کـــە دەشـــت کەربـــەلا بـــی

بەدامی = بەداوی .

دڵزار لەلا ٦٣دا کردویە بەسورانی بەم شێوەی خوارەوە :-

بـــــەداوی دوڵبـــــەرێ دڵ موبتــــەلا بـــــی
کـــــەهیجرانی بــــەلا وەصــــڵی بەلایــــە
بەغــــەیرە خـــوینی دڵ نەمــــدی لــــە ناویـــا
دڵـــــی وێـــران بــــێ دەشـــــتی کەربەلایـــە

(٢٦٩)

غــــەم ئانـــــدەر ســـینەی مـــو خانـــە دیـــری
چـــو وێرانـــــە کـــــە بــــووم کاشـــانە دیـــری
فەلـــــەك ئـــان دەر دڵـــــی مـــــسکین موونـــــە
ئـــــەز ئـــین ڕو هـــــەر چـــــە دەر ئەنبانـــە دیـــری

ئان دەر =لەناو . دیری =هەیەتی . کاشانە =گۆشش، تەقەلا.موونە= دەمێنیتەوە .ئەنبانە =دەنگ وباس، هەمبانە.

بابا تاهیر هەستی خۆی دەردەبڕێ دەڵێ: هەرچەندە سینەی بۆتە عەمباری غەم و پەریشانی کردووە و دڵی لە تەقەلادایە، بەلاَم مەعشوقەکەی لەدڵدا جێگیر بووەو خۆشەویستی ئەو هاوتای ئەم غەم و پەژارەیەتی زیاتریش.

(٢٧٠)

ئیلاهـــی ئـــەی فەلـــەك چـــوون مـــو زە بـــوون شـــی
دڵـــت هەمـــچوون دڵـــی مـــو غـــەرق خـــوون شـــی
ئەگـــــەر یـــــەك لـــــەحزە بـــــێ غـــــەم ببینـــــی
یـــەقین زوونـــەم کـــە ئـــەز غـــەم ســـەر نگـــون شـــی

دڵزار لەلا ٥٠دا کردویە بەسورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

خودایــە ئـەی فەلـەك وەك مــن زەبــوون بــی
دڵــت هــەر وەك مــن غــەرق خــوون بــی
ئەگــەر ســاتێ ببینــی مــن بــەبێ غــەم
یــەقین مەســا لــە داخــا ســەر نگــون بــی

(٢٧١)

هــەر ئــان کاڵوەنــد دامــان مــو نــشانی
دامــان ئــەز هــەر دوو عالــەم دەر کــشانی
ئەشــك خــونین بــی پاشــم راه ئەڵوەنــد
تاکــە دڵبــەر بــە پــایش بــەر فــشانی

د.مارف خەزنەدار بەم شێوەی خوارەوە نوسیویەتیەوە و کردویە بە سورانی لەلا ٢٠١دا :-

بــشەم بــە ئەڵوەنــد دامــانی مــو نیــشانوم
دامــەن ئــەژ هــەردوو گێتــی هاویــشانوم
نیــشانەم تــوو لــەو موویــەم بــەزاری
بــی کــی بلبــل هــەنی وەویــل نیــشانوم

واتاکەی :-

دەچم بۆ دامەنی کێوی ئەڵوەند ولەوی دادەنیشم
خــۆم لــە هــەردوو گێتــی رزگــار دەکــەم
دادەنیشم وپرچم دەکەمەوەو واوەیلا دەکەم
با بلبل وگوڵ بەشداری لەم دانیشتنەم بکەن

د. صدیق بورەکەی هەمان شت نوسیویەتیەوە لەگەل هەندی جیاوازی کەم وەك :-بشەم = بشوم .وەویل =واول

کالوەند =روباری ئەلوەند .فشانی =بلاْوە .بەپایەش= بەپێی خۆی .بەر =مێوە، بەرو بووم .

(٢٧٢)

دونیــــا خـــــوان بـــی ومــــەردم میهمـــــان بـــی
ئـــــەمروز ئالاڵـــــە بــــی فــــەردا خـــــەزان بـــی
ســـیە چـــالْیْ کینـــەن نـــامش نەهنـــد گـــۆر
بـــــەمو واچـــــن کـــــە ئینـــــەت خانمـــــان بـــی

خـوان = خانـە، مـالْ . سیە چـالْ = چـالێکی رەش.کینـەن =دوژمـن . نەهند =دەنێن .

(٠)بابا تاهیر لێرەدا ئەوە دەخاتە روو مرۆڤ لەم دونیایەدا مێوانە و مردن لە رێیە گۆر (قەبر) مالْی هەمیشەیی مرۆڤە، با ئاگامان لەخۆ بێت نەکەوینە داوی ئارەزوەکانی دەرونەوەو لە خشتەمان بات.

(٢٧٣)

مـــو هـــەر شـــام و ســـەحەر گریـــەم بگـــوئی
کـــە جـــاریْ گـــردد ئـــەز هـــەر گۆشـــە جـــوئی
مـــــو بێـــــچارە ئەنـــــدەر بـــــاغ وەصـــــلْت
هـــــەر ئانـــــچە لالـــــە کـــــارم خـــــار رِوئـــــی

گەردد =دەگەریْ، سەیران دە کا. هەر گوشە جـوئی =لـە هـەر سـوچ وجێگایەك .ئەندەر =لە ژێر. لەدەرەوەی .هەر ئانچە =هەر ئەوەنـدە، هـەر ئەو کات.

(٠) بابا تاهیر بۆ مەعشوقی دیارنەبوەکەی گلەیی دەکات کە لە ژێر سایەی ئەوینی ئەودا هەرچی گولآلە سورە دەروێنیْ درك شین دەبیْ بۆیە شەو و رۆژ لە گریان و فیغاندایە.

(٢٧٤)

زه دلْ بـــــێ روون بەبـــەختم نالْــــه نـــائی
زه موژگـــــان تـــــوو مـــــو ژالْــــه نـــائی
شـــەوێ نایـــه کـــەمو خوابـــت بوێنـــەم
بەبـــەخت مـــو بـــه چـــەشمم نالْـــه نـــائی

ژالْه =درەختی ژالْه . موژگان =بیر، فکر .خوابت بوێنەم = خەوت ببینم .

(٠) بابا تاهیر بەیار دەلێت: ئەوین و زیکری تۆ لە ناخی دڵ نهێنییەکە کەس پێی نازانێ وە لە بیری تۆدا شتی خراپ نابینی ئە شەوێك نەبوو بێتە خاوم و بتبینم بۆ ئەوەی گریان و فیغان دەس هەلْگرێ.

(٢٧٥)

شـــەوێ نایـــه کـــز ئەشـــکم دیـــده تـــەر نـــی
ڕوژی نایـــه کـــه خـــونینم جگـــەر نـــی
شـــــەو و ڕۆژم روود بـــــا نالْـــــه و ســـــۆز
تـــوو خـــۆش خەفتـه زه حـالْی مـووت خەبـەر نـی

روود= دەروات، تێپەر دەبێت. خەفته =خەوتووی .مووت =له من، به

(٢٧٦)

ســـەحەرگاهان کـــه بولبـــل بـــەر گـــولْ ئـــایو
ئەشـــکی چـــەشمم بـــەدامان گـــولْ ئـــایو
ڕووم دەر پـــای گـــولْ ئـــەفغان کـــەرم ســـەر
کـــه هـــەر ســـوته دلْـــی دەر غەلغـــەل ئـــایو

بەر گولْ ئایو =دێته لای گولْ .ڕووم =دەڕۆم.کەرم سەر =دەیبەمه .ددر غەلغەل ئایو =به پەرۆشەوه دێن، به خوتیلکەوه دێن .

(٢٧٧)

سەراســـەر مـــاڵی دونیـــا ســـوتەنی بـــی
نـــەزەر ئـــەز مـــاڵ دونیـــا دۆتـــەنی بـــی
غـــەم و دەردی کـــە دەر دڵ داری ئـــەمروز
بـــەرای روز حەشـــر ئـــان دۆتـــەنی بـــی

دوتەنی =پاشەکەوت

(٢٧٨)

بـــەدونیا هـــیچ کـــەس کـــی مانـــدەنی بـــی
کـــە دامـــان بـــەر جهـــان ئەفـــشاندەنی بـــی
هـــــەنی لا تقتنـــــو خـــــوونی عـــــەزیزم
مەگـــــەر یاوەیلـــــەنا ناخوانـــــدەنی بـــــی

ئەفشاندن =چاندن، وەشاندن. لاتقتنو =جێنشین نەبی . یاوەیلەنا = وای بوو ئەو ڕۆژەی .دامان =داوێن.

(٢٧٩)

دڵ مـــن ئـــەز ئاتـــەش غـــەم ســـووتەنی بـــی
بـــەجانم ســـۆز عـــشق ئەفروتـــەنی بـــی
گـــره نـــا کـــردە ڕیـــشە دەر کفنهـــا
بەشـــاهان و گـــەدایان دووتـــەنی بـــی

ئەفروتەنی =ڕژاندن .گرە ناکردە =ئەوەی کردوتەو نەتکردوە.دوتەنی =پاشەکەوت .

(٠) بابا تاهیر دەڵێت: دڵ بە ئاگری غەم سوتاوە گیان بە ئەوینی یار رژاوە لەم دونیایەدا هەرچی بکەی هەر لە پاشە ڕۆژدا خەڵاتی تۆ تەنها کفنێکە گەر پاشا بیت یان گەدا، واتە ئاگات لە خۆ بێت نەکەویتە داوی تەماعی دونیاوە.

(٢٨٠)

هەرکــــە دەردێ نـــەدارە مـــوردە ئـــەوەلی
دڵ بـــێ دەرد وعـــشق ئەفـــسردە ئـــەوەلی
ســـەحەر بولبـــل زەنـــە ئـــاواز بـــە گولبـــەن
کـــە هـــەر کـــێ عـــشق نـــەدارە مـــوردە ئـــەوەلی

نـــەدارە= نـــەیبێت. مـــوردە=مـــردوە. ئـــەوەلی= لـــە ســـەرەتای ژیانەوە.ئەفسردە=خەمۆکە، گۆ شەگیرە.زەنە=دەستپێ دەکات.

(٢٨١)

دڵ ئـــەز دەســـت غـــەمت زیـــرو زەبـــەر بـــی
دوو چـــەشمانم پـــڕ ئـــەز خـــوونی جگـــەر بـــی
هـــــەر ئـــــان یـــــار عـــــەزیزش نـــــازوەر بـــــی
دڵـــش پـــڕ غەصـــە جـــانش پـــڕ شـــەرەر بـــی

دڵزار لەلا ٨٣دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-
دڵ لـــــە دەس غـــــەمت زیـــــرو زەبـــــەرە
چـــــاوانم پریـــــان خـــــوێنی جگـــــەرە
ئـــــەوەی دولبـــــەری جـــــوان و نـــــازدارە
دڵ پـــــڕ لـــــە داخ وگیـــــان پـــــڕ شـــــەرەرە

م. فۆاد حسین لە لا٥٧ دا دەڵێت:- " دولبەر جگە لە ئازاردانی هیچ ڕفتاریکی لەگەل ناکات."

(٢٨٢)

چـــە واچـــم هـــەر چـــە واچـــم واتەشـــان بـــی
ســـوخەن ئـــەز بـــیش واز کـــەم واتەشـــان بـــی
بـــە دەریـــا ڕوو شـــودەم گەوهـــەر بـــەر ئـــارم
هـــەر ئـــان گەوهـــەر کـــە دیـــدەم واتەشـــان بـــی

فەهمی کاکەی لە١٨٧٧دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی :-

چــــی بڵــێم هـــەر چـــی بڵــێم گوتوویانـــە
قـــسە چ زۆر یــــان کـــــەم گوتوویانـــــە
بـــۆ زەریـــا چـــووم تـــا گەوهـــەر دەربێـــنم
ئـەو گەوهـەرەی دیمـەوە بـە تۆیانـە(تـۆ بـووی)

(٢٨٣)

شـــەو تـــارت بـــوینم خـــواهش ئـــەز پـــەی
شـــودە کـــەون ومـــەکان ئـــەز خەلقـــەتی حـــەی
حەقیقـــەت بـــشنەو ئـــەز تـــاهیر کـــە گویـــەد
بەیـــەك کـــون خەلقـــەتی کـــەون ومـــەکان تـــەی

خواهش= تکا، ئاوات. پەی= مەبەستی خوابە. حەی= زیندوو. تەی= جیگـای ماتـەمی .شـوودە= بـووە. بـشنەو= ببیـستە. کـون= کـن فـیکن( وشەیەکی عارەبیە مەبەست لە ئەمری خودایە).

(٢٨٤)

زە موشــــکی چـــین ســـیاەتر ســـونبلت بـــی
هـــــەزاران دڵ بەقەیـــــدی کاکلـــــت بـــــی
نـــــە باشـــــد ناڵـــــەم ڕا دەر دڵـــــت ڕاە
زە خـــارا ســـەخت تـــر گویـــا دڵـــت بـــی

دڵزار لە١٩٧٧دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

لـــــە مـــــسکی چـــــین ڕەشـــــتر ســـــومبلتە
بەهـــــــەزاران دڵ بەنـــــــدی کاکۆڵتـــــــە
ڕێگـــــا بـــــە دڵـــــت نابـــــا ناڵـــــەی مـــــن
لـــە بـــەردان ڕەق تـــر ســـەخت تـــر دڵتـــە

(٢٨٥)

زەمـــــانی لالـــــە زارون هەفتـــــەیی بـــی
کـــە فەصـلّی نـــەو بـــەهارون هەفتـــەیی بـــی
غەنیمـــــەت دوون ویـــصالّی یـــاری جـــانی
کـــە فەصـــلّی رووی یـــاروون هەفتـــەیی بـــی

دلّزار لە لا٥٢١دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی:-

زەمـــــانی لالـــــە زاران هەفتەیەکـــــە
کـــــە فەصـــلّی بـــەهاران هەفتەیەکـــە
هەلێکـــە یـــاری گیانیـــت دەســـت کـــەوی تـــۆ
کـــە وەصـــلّی ڕووی یـــاران هەفتەیەکـــە

فەصلّی نـەو بـەهاران=وەرزی نـەو بـەهاران. فەصلّی ڕووی یـاران وەصلّی(پێ گەیشتنی) ڕووی یاران.

(٢٨٦)

واتـــە هـــەر کـــەس قـــوربش بیـــشتەر بـــی
دلّـــش ئـــەز دووری تـــە ڕیـــشتەر بـــی
ئەگـــەر یـــەکبار موژگـــان تـــە وینـــەم
بـــەجانم صـــەد هـــەزاران نیـــشتەر بـــی

قوربش=نزیك بوونەوەی. بیشتەر= لەپێشتر. ڕیشتەر=برین، زام.یەکبار یەکجار.نیشتەر=نەشتەر، چەقۆ.

(*)باباتاهیر لە باری خوا ناسیدا خۆی زۆر بە نزیك دەزانی، بەلاّ هێشتا نەگەیشتوە بە مراز، بۆیە دلّ بریندارو غەمووکە، ئاواتی ئەوەیە ئەگە یەك جاریش بیبینیّ دەبا سەد هەزار تیری پیّ کەوێت.

(٢٨٧)

بمـــيرم تاكـــه چەشــــم تـــەر نـــەوێنی
شـــەرارەی ئـــاه پـــر ئـــازەر نـــەوێنی
چـــنان ئـــەز ئاتەشـــی عـــشقت بـــسووچەم
کـــە ئـــەز مـــو ڕەنـــگ خاکـــستەر نـــەوێنی

فەهمی کاکەی لەلا۹۳دا بەم شێوەیە کردویە بە سورانی:-

بمـــرم تـــاکو چـــاوی تـــەر نـــەبینێ
بلێـــسەی ئـــاهی پـــڕ ئـــاگر نـــەبینێ
وەهـــا لـــە ئـــاگری عیـــشقت بـــسوزێم
کـــە لـــە مـــن ڕەنگـــی خاکـــستەر نـــەوینێ

(*) خاکستەر=خۆڵەمێشی، واتە ڕەنگ شیواو.

(٢٨٨)

دڵـــم بولبـــل صـــفت حـــەیران گـــوڵ بـــی
دەروونم چـــوون درەخـــت پـــی بیگـــل بـــی
خونابـــە بـــار دیـــرم ئەرغـــەنون وار
درەختـــی نەهلـــە بـــارش خـــوون ودڵ بـــی

پی بیگل=پیکوڵ یان پەیکوڵ درەختێکی دڕکاویە لە دەشت وچولأیدا خورسك دەروێت.

ئەرغـەنون=ئەرخـەوان وشـەیەکی تورکیـە بـە مانـای ئاشـەوان.وار= شایستە، پەسەند .خونابە=خوناو(نم نم باران). نەهلە=پوچ، لاواز.صفت= توندوتوڵ، خەسلەت.

(٢٨٩)

مــو ئــەحواڵم خراپــە گــەر تــۆ جــووئی
جگــەر بەنــدم کەبابــە گــەر تــۆ جــووئی
تــۆ کــە رەفتــی و یــار نــۆ گرفتــی
قیامــەت هــەم حیــسابە گــەر تــۆ جــووئی

جووئی=جیایی. یار نۆ گرفتی=یاری تازەت گرت.

(٢٩٠)

خــەیاڵت میکــەرم مــو گــاه گــاهێ
موســیبەت بــوو ئەگــەر مــوڕا نــەخواهی
تــە کــە کــەردی مــەڕا ئــاڵوودە دەر خــوون
نــە باشــد ڕەنــگ بــاڵاێ ســیاهێ

میکــەرم=دەکــەم. نــەخواهی= نەتــەوێت. ئــاڵوودە= ئەســیر. گیرودە.نەباشد=نابێت.

(*)بابا لەگەڵ پیروانی دەدوێت و دەڵێت :- تۆ خووت منت گیرودەی ئەم حاڵە خوێناویە کردوە، ناشێت ڕەنجم بسوتێنیت، بمخەیتە ماتەمینی وسەر تا پا ڕەش پۆشم بکەیت .

(٢٩١)

نیگــاری تــازە خیــز مــو کوجــائی
بەچــەشمان ســورمە ریــزی مــو کوجــائی
نەفــەس بــەر ســینەیی تــاهیر رەســیدە
دەمــێ مــردن عــەزیزی مــو کوجــائی

د. مارف خەزنەدار لە لا٢١٤دا بەم شێوەی نوسیوەتەوە:-

نیگـــاری تـــازە خیـــزی مـــوو کوجـــائی
بـــە چـــەشموون ســـورمە ریـــزی مووکوجـــائی
نەفـــەس بـــەر ســـینەی تـــاهیر رەســـیدە
دەمـــێ رەفتـــەن عـــەزیزی مـــوو کوجـــائی

واتەکەی بە سورانی وتووە:-

ئـــەی تـــازە جـــوانی ئێمـــە لـــە کـــوێ ی
ئـەی خـاوەن چـاوی بـەکل ڕێـژراوی ئیمـە لـە کـوێ ی
هەناســە لــە ســنگی تــاهیر دەرچــوو(گەیــشتە گــەروو)
ئـەو دەمـەی ڕۆیـشتی ئـەی خوشەویـستی ئیمـە لـە کـوێ ی

(٢٩٢)

زە خـــۆرئین چـــەهرەت ئەفزووتـــە تـــر بـــی
تـــیر عیـــشقت بـــدانم رووتـــە تـــر بـــی
مـــەرا ئەختـــەر بـــوود خـــاکی ســـیاهت
زە مـــۆر یـــارا کـــە ئەختـــەر سـووتە تـر بـــی

بدانم=بەجانم. رووتە=نەدارو فەقیر(رووتەڵ) .مۆر=درەختێکی باڵا بەرزە، گوڵێکی پێوەیە بۆنی وەك ڕەیحان و یاسەمینە.ئەفزوتە=زیاد کردن.

(٢٩٣)

بیـــا تـــا دەســـت ئـــەز ئـــین عالـــەم بـــداریم
بیـــا تـــا پـــای خـــود ئـــەز گـــڵ بـــەر ئـــاریم
بیـــا تـــا بـــرد بـــاری پیـــشە ســـازیم
بیـــا تـــا تـــوخم نیکـــوئی بکـــاریم

(*) واتاكەی:-

وەرە تالــەم دونیایــەدا دەســت بــەردار بــین
وەرە تــا پێــی خۆمــان لــەم قــوڕاوە دەرێــنین
وەرە بەســەبرو خــۆ ڕاگــری پیــشەیەك بنــوێنین
وەرە تـــا تـــۆی چـــاكی بـــچێنین

(٠)باباڵەگەڵ پیروانی دەدوێت و بانگیان دەكات بین بۆلای تا دڵ داكەوێ و پێكەوە لەو بارەی ڕزگاری بێت كردەوەی چاكە ببەخشێت .

(٢٩٤)

دلا ئـــەز دەســـتی تـــەنهائی بـــە جـــوونم
زە ئـــاە وناڵـــەی خـــود دەر فیغـــوونم
شـــەوانی تـــار ئـــەز دەردی جـــودائی
كـــەرە فریـــاد مـــەغزی ئەســـتخوونم

بەجوونم=بەگیانم.فیغوونم=فیغانم. ئەستغوونم=ئیسقانم. كـەرە دەكات.

(*) دادو فریادو فیغانی بابا تاهیر هەندە زۆر بوە گەیشتوەتە ناخی ئیسقانی لە دووری یارو مەعشوقەكەی.

(٢٩٥)

مـــوونی محنـــەت كیـــشی حەســـرەت نەســـیبم
كـــە دەر هـــەر ملـــك وهـــەر بـــەزمیٚ غـــەریبم
نـــەبو ڕۆزی كـــە ئـــائی بـــەر ســـەر مـــن
نـــەبود یـــەك شـــەب كـــە گـــەردی تـــۆ قـــەرینم

قەرینم= هاودەنگم، هاوڕێم.

(*) باباتاهیر لە باری غەریبی ومحنەت کیشی وحەسرەتدا، گلەیی لە یار دەکات و دەڵێت نابو ڕۆژیك سەریکم لیٚ دەی یان شەوێك ببیت بە هاودەنگم؟ .

(٢٩٦)

پــــسەر شـــەوقی ســــەر کـــۆی تـــۆ دیـــرم
بـــە دلٚ مـــوهری مـــاهی رووی تـــۆ دیـــرم
پـــوتی مـــن کەعبـــەی مـــن قیبلـــەی مـــن
تـــەی هـــەر ســـەر نـــەزەر سـوی تـــۆ دیـــرم

پسەر =کوڕ .کۆی=گلٚکوی، قەبر.

(*)باباتاهیر سۆزی دلٚ دەردەبڕێت بۆ تەنها کورەکەی کە دەمرێت، وەبروا وایە بابا دەستی لە دونیا هەڵگرتوە و مالٚ وحالٚی نەبوە.

(٢٩٧)

پـــسەر غـــەیری تـــە ســـەودائی نـــەدیرم
بـــەدلٚ جـــز تـــە تەممـــەنائی نـــەدیرم
خـــودا دوونـــە کـــە دەر بازارعیـــشقت
بـــەجز جـــوون هـــیچ کـــالاٚئی نـــەدیرم

سەودا =بیرکردن .کالاٚ=مەیل .جز =سوتاوی . جوون =گیان.

(*) بابا جارێکی تر سۆزی دلٚی خۆی دەردەبڕێت بۆ وون بوونی کورەکەی لەم چوارینەدا.

(٢٩٨)

غـــەم عیـــشق تـــە مـــا دەر زاد دیـــرم
نـــە ئـــەز ئـــاموزش ئوســـتاد دیـــرم
خۆشـــم بـــا ئانکـــە ئـــەز یـــومنی غـــەم تـــوو
خـــراب ئابـــاد دلٚ ئابـــاد دیـــرم

زاد =خـوان. ئاموزش= فێر بـوون .ئوستاد =ماموستا. خوشـم= باشیم، چاکیم. یومن=برین .

(٢٩٩)

بـــه عـــومر خۆیـــشتن تـــا یـــاد دیـــرم
زه هیجـــــرت نالّـــــه و فریـــــاد دیـــــرم
نـــەدارم خـــاتری شـــادی بـــه خـــاتر
هەمیـــــشه خـــــاتری ناشـــــاد دیـــــرم

خۆیشتن =خودیەتی، خۆ ویستی. خاتر =یادگاری، خەیاڵ.
(٠) بابـا تـاهیر لـه هیجرانـی دولبـەر هەمیـشەله نالّـه و گریانـه هـیچ یادگاریەکی خۆشی به خەیاڵدا نایەت غەیره یادگاریه ناخۆشیەکان نەبێت.

(٣٠٠)

بـــه غـــەیری تـــه دیگـــەر یـــاریّ نـــەدیرم
بـــیّ ئـــەغیاری ســـەرو کـــاری نـــەدیرم
بـــه دوکـــان تـــوو ئـــان کاســـه مـــەتاعم
کـــه ئەســـڵ رووی بـــازاری نـــەدیرم

دیگەر =یەکێکی تر. ئەغیار =پیاو چاك.مەتاعم =خۆراکم .ئەسڵ =هیچ.

(٣٠١)

بـــوره ئـــەی رووی تـــه بـــاغ و بـــەهارم
خـــەیاڵت مۆنـــسی شـــەبهای تـــارم
خـــودا دوونـــه کـــه دەر دونیـــای فـــانی
بەغـــەیری عـــشق تـــه کـــاری نـــەدارم

بوره=وەره .شەبهای تارم =شەوانی تاریکم .مۆنس= هاوریّ، هاودەم.

(٣٠٢)

زە دەســـت چـــەرخ گـــەردِوون داد دیـــرم
چـــگوونە خـــاتر خـــود شـــاد دیـــرم
نشـــستە دڵـــستانم بـــا خـــەس و خـــار
هـــەزاروون ناڵـــە و فریـــاد دیـــرم

چگوونە =چ گوناهێکە، چ تاوانێکە. خاتر خود=بۆ تۆ، بۆ خۆی .با خەس وخار =بە چاك وخراب.

(٣٠٣)

بـــە دونیـــا دڵ نـــەبودە هـــەر کـــە مـــردە
کـــە دونیـــا ســـەر بـــە ســـەر ئەنـــدوە ودەردە
بـــە قەبرســـتان گـــوزەر کـــون تـــا بـــوینی
کـــە دونیـــا بـــا رەفیقونـــت چ کـــەردە

نەبودە= نەماوە، نەیداوە. ئەندوە= غەم . گوزەرکون=تێپەرە، رەد بە.
(*) باباتاهیر لیرەدا ئاموژگاری دەکات، کە دونیا ئاخیرەتی هەر مردنە و بە جێی دەهێلێت، کرداری چاکە و خوا ناسی بەکەلك دێت .

(٣٠٤)

چ خـــۆش دارم کـــە چـــینەم مـــن گوڵنـــار
چ خـــۆش دارم کـــە بینـــەم چـــەهرەی یـــار
چ خـــۆش دارم کـــەیار ئایـــەد بـــە بـــیرون
جیهـــانی را کونـــەد رۆشـــن زە روخـــسار

چینەم= دەچێنم.ئایەد بە بیرون= دێتە دەرەوە.؟کونەد = دەیکات.

(٣٠٥)

ئەگــەر شـێری ئەگــەر بــەبری ئەگــەر گــوور
گــوزەر بایــەد کــونی ئــاخر لــەب گــوور
دلاٚ رەحمـــیٚ بــە جــان خووشـــتن کــون
کــە مۆرانــت نــەهن خــوان وکونــەن ســوور

گوور = گڕی ئاگر، قەبر . لەب = لێو.سوور=شایی.مۆر =مارو موری. نەهەن = دەنێن. خوان= سفره

(٣٠٦)

ســـەری دارم زە ســـەودای تـــوو پــڕ شــــوور
دڵـــیٚ دەر ســـینە چـــوون مـــوردە دەر گـــوور
هـــــەمی خـــــواهم بـــــە بـــالێنم بیـــائی
کـــە باشـــم تـــا قیامـــەت بـــا تـــوو مەحـــشوور

شـوور =شـەوق، مـەیل.مـوردە =مـردوە.بـاڵینم =جێگـام، نـوینم.باشـم =دەبم. مەحشوور= حەشر بوون.

(٣٠٧)

کـــــەمان ئەبرویـــــەت پەیوەســـــتە وێنـــــەم
گـــوڵ صـــەنعەت بـــە روویـــەت دەســـتە وێنـــەم
زە بـــەس مـــوهر رەخـــت عالـــەم فـــرووزەد
جیهـــان ڕا دڵ بـــە مـــوهرت بەســـتە وێنـــەم

کەمان ئەبرویەت=کەوانەی ئەبروت. وێنەم = دەبینم.دەستە وێنەم=بە شێوەی دەستە گوڵ دەبینم.رەخت= روخسار، بەرگ. فرووزەد =رووناك بوو. بەستە= پەیوەست، پابەند.

(٣٠٨)

عــەبیرو مــسك ئــەز مــووی تــوو خــواهم
نــە مەهرروومــە کــە مــن رووی تــوو خــواهم
ئەگــەر بــا غــەم بــەرن کــە گــولْ بــچینەم
گــوڵی هــەمرەنگ وهــەم بــۆی تــوو خــواهم

موو= قژ .نەمەهرروومە =حەرام نیە. رووی توو خواهم =روخساری تۆم دەویْ .با غەم= بەزۆر.هەمرەنگ=هاورەنگی توو.

(٣٠٩)

ئەگــەر چــوون مــو دووســەد ســورەت پــەزیرەم
بــە هــەر ســورەت بــە دلْ نــەقش تــوو گــیرەم
تــوو تــا بــەخت منــی هــەرگز نــە خــوابم
تــوو تــا عەهــد منــی هــەرگز نــە مــیرەم

پەزیرم= مێوانم، پێشوازم. نەخوابم=ناخەوم. نەمیرەم=نارۆم. عەهد = پەیمان.

(٣١٠)

هەمــە ئــەز بــاغ وبوســتان یــادم کــە
دلْ ئــەز زنــدان غــەم ئــازادم کــە
مــەکان دیگــەر وموڵــك دیگــەر چــووی
وەتــەن دەر ئــین خــەراب ئابــادم کــە

(*) ئاوات وداواکاری باباتاهیرە لە پیروانی کە بە فریای کەون ولەبیری نەکەن، شەیدای ئەو بیرو باوەرەی ئەوانە لە خوا ناسیدا. داوای ئازادی دەکات لە زیندانی غەمدا بە دیتن و پێگەیشتنی ئەوان.

(٣١١)

تــوو كــه دوور ئــەز منــى نزديــك كــێ بــێ
بلــــورين بازويــــت بــــالێن كــــێ بــــێ
بگــــو شــيرين لــەبت بــا كــى كــەره راز
نــــشينى بــــا كــــى و هــــەمراز كــــى بــــێ

بازو=قۆڵ .كەره=دەكات.هەمراز=هاوراز، گفتوگۆ .

(٣١٢)

مــــەرا ديوانــــه و شــــەيداى تــــه ديــــرى
مــــەرا ســــەر گوشــــته ورســــواى تــــه ديــــرى
نميدونــــــەم دلــــم دارد كوجــــا جــــاى
هەميدونــــەم كــــه درووى جاتــــه ديــــرى

سەر گوشته=سەر كێشى، پەرستيار كردن.دارد كوجا جاى= چ جيگاى دەوى.هەميدونەم=هەر دەزانم. درووى= دەورى، جاته= جيگاى تۆ.

د.مارف خەزنەدار لە میژووی ئەدەبی کوردیدا ب ١ لا١٩٦دا دەڵێت:- لەو دوایی یەدا کۆمەڵێك شیعری باباتاهیر ی هەمەدانی لە نامەخانەی مۆزەی قونیە لە ئارامگای جەلالەدینی ڕۆمی دۆزراوەتەوە، ئەو دەسنووسەی شیعرەکانی تێدا تۆمار کراوە لە ساڵی ٨٤٨ ك /١٤٤٤ز ڕوونووس کراوە. شیعرە کوردیەکانی دەسنووسەکەی ئەمانەی لای خوارەوەن:-

(١)

گەر ئەژ زەر ئەو نەهی دێوانە ئەز گڵ
بەپەر چینەش کەری وانووشەوو وڵ
گەر ئەو بشنەش نەهی ئان داری شمشاد
گەر ئەو روونەش کەری ئاواجی بلبل
سەرئەنجامان بشی بە پا بە هەرزی
پایی تە گوور وی ماوایی تە گڵ

واتاکەی:-

با لەباتی گڵ وخاك تەلارێك لەزێڕ دروست بکەی
لە گوڵ ووەنەوشە پەرژینی بۆ بکەی
با لە سایەی ئەو داری شمشادە رابنیشی
با لە هەموو لاییکەوە بلبل ئاواز بپژێنی
سەرئەنجام لەناو دەچی و نامێنی
جێگەت گۆڕ و مەئوات گڵ دەبی

هەر وا د. مارف لەسەری دەدوێت ودەڵێت:-" شاعیر لیرەدا باس لە کورتی ماوەی ژیانی ئادەمیزاد دەکا، ئەوەی دروستی دەکا ودایدەمەزرێنێ لە تەمەنی درێژترە، ئەم بیرو ڕایە دەور کردنەوەی بیرو باوەری ئاینی یە، ئەوەی دەڵی ژیانی سەر زەوی کورتە و ژیانی دووەم نەمرو هەمیشەیی یە.سۆفیزمی پراکتیکی خەریکی ئەم مەسەلەیە چونکە بایەخ بەژیانی گیانی دەدا نەوەکو ژیانی مەتریالی، لەوانەیە لەمەدا جیاوازی لەنیوان بیروڕای ئایینی وسۆفیزم (شریعەت وتەریقەت)دا هەبێ.

(*) (تاکە کەسی سۆفی کە شەیدای ڕێبازەکەی دەبێت بەو پلانەدا دەبێت تێ پەڕیت شەریعەت، تەریقەت، مەعریفەت، هەقیقەت).

(٢)

زاری جەم دی وە دایی مورج ئەد خەورود
مورجان دوو دەستی وە خودا دەرود
ناگەهان بامە دەنەد بازی وە داری
زارە جەش کوست وموران زارج ئەد خورود
داڵێ چە ئەڵوەند کووهان کەرد پەرواز
بازش بە کوشت وخوونش پاك وخوورد
بەعد نەچیروان دەر دین ودەر ئایین
بەو کەدەش تیر وە داڵ ئەژکار بە درود
بشە نەوچیروان دەستەت وەجادەست

چـــەمننەت بـــەد کـــرە ئـــەژکار بـــە درود
بـــەنامی نەشـــئە ئینـــی کەمـــەن کـــەرد
بەمـەن هـەر ئـان کەرەنـد هـروەد کەمـەن کـەرود
خـــوڕرەم ئـــان کێـــژ کـــۆ وەد کـــار نـــەبی
خـــۆش ئـــان کێـــژ کـــۆ وەزنـــت کـــۆیی کـــەرود

واتاکەی:-

کـــەوێکم دی باڵنـــدەییکی گـــرت وخـــوواردی
باڵنـدەکان هـەر دوو دەستیان پـان کـردەوە لـە بـەر خـودا
لـە پـڕ بازیـك لـە سـەر دارێـك بـە فریایـان کـەوت
کـەوی کوشـت وباڵنـدەکان کەوەکـەیان خـوارد
داڵێـــك لەشـــاخی ئەلوەنـــد پـــەروازەی دەکـــرد
بـــازی کوشـــت وهـــەموو خـــوێنی خـــواردەوە
لـــە پاشـــان ڕاوچـــی یێـــك پەیـــدا بـــوو
تیرێکـــی ئاراســـتەی داڵەکـــە کـــرد ولـــە پـــی ی دا
داڵ ووتـی ئـەی ڕاوچـی خـودا دەستت بشکێنی
چـــــونکە ڕاوی ئێمـــــــەت تێـــــــك دا
لـە ولاما ووتـی بـەم کردەوەیـەی خـۆت مـەنازە
هـەر کـارێکی خراپی مـن بیکـەم بـۆ خـۆم دێتـەوە
بـەختیاری بـۆ ئـەو کەسـەیە کـەکاری بـەد ناکـا
خۆشـی بـۆ ئـەو کەسـەیە کـە بـە بـەدکاری ڕازی نـابێ

هەر وا دەڵێت:-لەم پەندەدا شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربخا کە لەدوای هەموو هێزێك هێزێکی بە هێزتر هەیە.کە هێزو تووانا ببێ، دەبێ زەبر

وزۆرداری هەبێ، کەوابێ بەختیاری تەنیا لەوەدا دەبێ کەهێز نەبێ، کەنەبوو زۆرداری نابێ.

(٣)

یــاگیم دورِ دی هـــەنی دەریـــە نـــەبود یـــار
یــاگیم خوەردیــد گهــان پەیــدا نــەبود یــار
مــن ئــەژ ئــان ڕوو بــەدامانێ تــە زەد دەســت
دەگـــەردوونت پـــەرو پـــایی نـــەبود یـــار

واتاکەی:-

ئـەو جـێ یـەی دورِم تێـدا دی هێـشتا زەریـا نـەبوو ئـەی یـار
ئـەو جـێ یـەی ڕۆژم تێـدا دی هیـشتا گێتـی نـەبوو ئـەی یـار
مـــن لــــەو ڕۆژەی کـــە دەســـتم گەیـــشتە داوێنـــت
لــە گــەردوونت دا هێــشتا پــەرو بــاڵ نــەبوو ئــەی یــار

ئینجا د. مارف لێکـی دەداتەوە ودەڵێت:-" لەم دوو بەیتەدا باباتاهیر باس لە گیان (یار)دەکا، ئەمە زۆر پێش دروست کردنی گێتی کەوتوە.وە بە پێی کتیبی سەر ئەنجامی یارسان راڤەی دەکات و لە دواییدا دەڵێت:- شاعیر لەم دوو بەیتەدا هەمیشەیی "موتلەق" دەخاتە ڕوو، کە "گیان" هەبوو هێشتا "مادده" نەبوو، کە دورِ ورِۆژ ویار هەبوو هێشتا گێتی دروست نەبوو بوو.

بەلاَم صدیق بۆرەکەی(لەمێـژووی وێـژەی کـوردی لـە ١٩٢٧دا) بـە شێوەیەکی ڕوون وساکارتر ڕاڤەی دەکات ودەڵێت:-باباتاهیر دەڵێت:ئەی خوای گەورە وبە بەزەیی، لەو جێگەدا کە دوڕ بوو، منیش لەڕۆژی بەریندا لەوێ بووم و ئەو دوڕەم چاو پێ کەوت، ئەو دەمە هێشتا دەریا وزەوی و ئاسمان وئەم جیهانەت بەدی نەهێنابوو، وەلە جیهانی روون وخاوێنی خوایی تۆدا کە من هەتاوی خواییم دی، وە گەوهەری هەموو بەندەکان بۆ سروشت بوون وبەدی هێنانی بەڵێن و پەیمانیان داو بە گەورەیی وشکویی خوایی تۆ گەوایان دا، منیش دەستم گرتە داوینت وبەڵێنم دا.

(*) باباتاهیر لێرەدا باسی دۆنای دۆنی خۆی دەکات بەو گفتو گویە وەك فریشتەیەکی خوایی، کە ئەمەش تەوەریکە لە بیرو باوەری ڕێبازەکەی، کە ڕێبازی یارستانە.وە ئەو بوون ونەبوونە لە ڕاڤە کردنی د. مارف خەزنەدار و صدیق بورەکەیدا هاتووە لە ناو سرودەکانی یارستاندا بەر چاو دەکەوێت.

(٤)

یاکە ئەژ میهری تەم دەم می زەد ئەی یار
خـوێش بێگانەکان سنگم زەد ئەی یار
جـورمم ئینە کە ئەژ تە دۆست داروم
نەخوونم کەرد ونەم راهی زەد ئەی یار

واتاکەی:-

لەوی کە من بەر میهری تۆ دەکەووم ئەی یار
خـوێش وبێگانە سنگم بریندار دەکەن ئەی یار
گوناهم ئەوەیە کە من دۆستی تۆم
من نە خوێنم کردووە ونە ڕێ ی کەسم گرتووە ئەی یار

هەروا دەڵێت:-شاعیر لەوە دەدوێ کەلە ریزی خەڵکی چۆتە دەرەوە چونکە خەڵکی گوێ نادەنە عەشق بۆیە دەبێ بە بێگانە و خوشیان ناوێ وەدەبیتە تاوانبار بەرامبەریان،

هەر لە بەر ئەوەشە دەڵێ من گوناهم ئەوەیە تۆم خۆش دەوێ. د.صدیق بۆرەکەی هەمان شت دەچێتە سەر ڕای د. مارف خەزنەدار، لە راڤە کردنی ئەم دوو بەیتە.

باباتاهیر ئەو هەستە دەر دەبڕێ بەرامبەر یار (مەعشوق)، چونکە ئەوی خۆش دەوێ و چووەتە سەر ڕێبازەکەی.ئەو خەڵکەش کە دەیەوێ ڕێنماییان بکات لە ژێر فشارێکی زۆر دەستیان لە بیرو باوەری کۆنی خۆیان و باو باپیرانیان هەڵگرتوە، نایان ئەوێ جارێکی تر بکەونە ژێر ئەو فشارە.

(٥)

مەن ئان پیروم کە خوانەندەم قەلەندەر
نە خانم بی نە مانم بی نە لەنگەر
روو هەمە روو وەرایەم گەردی گیتی
شەو دەر ئایە وە ئەو سەنگی نەهم سەر

(*) لە سەر ئەم دوو بەیتە دواوین لە ژ .٣٨ دا .وەئەم دوو بەیتە لە چاپەکەی عەباس رەجەوی دا هەیە لەلا ٢٨دا. واتە تازە دۆزراوە نیە. وە د. مارف خەزنەدار دەڵێت : ئەم دوو بەیتە ی دەسنوسی قۆنیە(١٤٤٤ز) لە دەسنوسی پاریس (١٨٤٤ز) یشدا هەیە.

(٦)

یا ئەز ئین بەند دەر ئیزناوە کیتیم
خوونەم ئەز خوردو دەر خووناوە کیتیم
یا دەرین شوومە گیتی ئوم نەیایا
ئەژ خووبی بارە دەر وەلاوە کیتیم

واتەکەی:

حـــەزم دەکـــرد لــــە ئیزنـــاوە بوومایـــە
خـــوێنم خوواردۆتـــەوەو لونـــاو خوێنــا دەژیـــم
لەم گێتـی یـەدا هیچ جـێ یێـك نییـە بـۆ مـن بشێ
دیـــارە مـــن لــــە خـــۆم دا نــــەماووم

پاشـان د. مـارف دەڵێـت :-دەبـێ پـیری باباتـاهیر یـا دڵبـەری لـە ئیزنـاوە(نـاوی ناوچـەیەکە لـە هەمـەدان) بـووبێ وخـۆی لـە هەمـەدان لەیەکتری دوورن.باباتاهیر دەبێ لە نزیك پیریەوە بێ، ئەگەر لەوێ نەبێ، دیارە لە هیچ جێگەیەکی تر نییە، کە لە هیچ جێگەییك نەبێ بوونی نییە.

(*) ئەمەش دەبێ لە کاتی سەفەری شا خۆشین بێت بۆ هەمەدان بۆ سەردانی باباتاهیر و موریدانی ڕێبازەکەی.

(٧)

پـــەنج رووزی هـــەنی خـــوررەم گێهـــان بـــی
زەمـــین خەنـــدان و بـــەرمان ئاسمـــان بـــی
پـــەنج روویـــی هـــەنی هازیـــد وســـامان
نـــەجینان نـــام و نـــەژ ئانـــان نیـــشان بـــی

واتاکەی:-

لـــە پێـــنج ڕۆژدا گێتـــــی بـــــەختیارە
زەمین بۆمان پێ دەکەنێ وئاسمان دامان دەپۆشی
پێنج ڕۆژی تـریش سـەروەت وسامان لـە ناوەوەیـە
نـە لـەمان ونـە لـەوان هـیچ نیـشانەیەك نـەماوە

هـەر وا د.مـارف لەناخـە فەلـسەفیکەوە بـۆی دەچـێت و دەڵێـت :-" باباتاهیر ئەم هەڵهێنەمان بۆ دەکاتەوە لەبابەت (نەبوون) ی گێتی و(بـوون) ی گیان . دەڵێ لە پێنج ڕۆژی یەکەم گێتی بەختیارە، ئەم خۆشی یـە پێنج

ڕۆژی تریش دەمێنێ، لە پاش ئەوە نامێنێ، مەبەستیشی ئەوەیە کە تەنیا چاکە لە سەر ڕووی زەوی دەمێنێ.

صدیق بۆرەکەی لە لا۹۳ ی مێژووی وێژەی کوردی ب۱ بە پێی وەرزەکانی ساڵ لێکی دەداتەوە کە یەك لە دوای یەك دێن وهەریەکە بارو دۆخێکی تایبەتی هەیە وژیانی مرۆڤیش وەك وەرزەکانی ساڵە، ماوەیەك بەخۆشی وشایی رای ئەبوێرێ وجیهان بزەی بۆ ئەگرێتەوە، کوت وپڕ خولی ئەم خۆشی یە تێ ئەپەڕێ وجیهان دەر ئەچێ وناوونیشانێکی لێ بە جێ نامێنێ .

(۸)

ئەلف کەژ کاف ونوونەش سەر بە بەر کەرد
هەمەش هامان گهان ئەو لاجیوەر کەرد
ئانکیش ئەو ئافیری گەردوونی گەردان
ئانیش ئەدسات ومەن ئەنداجە ئەر کەرد

واتاکەی:-

کەکاف ونوونی ووت وگێتی دروست کرد
گێتی بەڕەنگی لاجیوردی خستە ڕوو
ئەو کەسەی گەردوونی گەردان دەسوڕێنیتەوە
هەر ئەویشە ئەدگاری ئێمەشی دارشتووە

د.مارف لەسەری دەرواو دەڵێت:- لەم دوو بابەتە باباتاهیر بیروڕای یارسان دەردەبڕێ لە بارەی کردەگارو دروست کردنی گێتی یەوە . بێ گومان ئەمە لەگەل بیرو ڕای ئاینە ئاسمانی یەکانی تریش دەگونجێ، بەتایبەتی ئیسلام، چونکە ئەوە تا کاف ونوونی لە قورئان وەر گرتووە.

(٩)

بــــشەم بـــە ئەلوەنـــد دامـــانی مـــو نیـــشانوم
دامـــەن ئـــەژ هـــەر دوو گێتـــی هاویـــشانوم
نیـــشانەم تـــوو لـــەوو موویـــەم بـــەزاری
بـــی کـــی بلبـــل هـــەنی وە وەیـــل نیـــشانوم

(*) ئـەم دوو بەیتـە یـان ئـەم چـوارینەیە تـازە دوزراو نیـە، چـونکە لـە کتیبەکەی عەباس رەجەووی دا لەلا٨٦دا لە ژیر ژمارەی ٢٧١دا هاتوە و کە پشتی بە کتیبەکەی وەحیـد دەستکردی بەستووە، د.مارفیش بـە چاکترین چاپی زانستی دوو بەیتەکانی باباتاهیر دای دەنێت.

(١٠)

ئـــەز ئـــان ئەســـپیدە بـــازم هەمـــەدانی
بـــە تـــەنهایی کـــەرووم نەچـــیرەوانی
هەمـــە بـــەمن ویدیرەنـــد چـــەرخ وشـــاهین
بـــەنامی مـــن کەرەنـــد نەچـــیرەوانی

(*) ئەمەش لە کتیبەکەی عەباس رەجەویدا هەیە لە ژیر ژمارە ٢٥٥ لـەلا ٨٢دا.

(١١)

بـــیٚ تـــە ســـەردەر گریبـــانوم شـــەوو ڕۆچ
سریـــشك ئـــەز دیـــدە بـــاروونوم شـــەووڕۆچ
نـــە بیمـــاروم نـــە ژایـــوم میکـــەر ۆ دەرد
هـــەمی زوونـــوم کـــە نـــالوونوم شـــەووڕۆچ

واتاکەی:-

بــــێ تــــۆ شـــەو و ڕۆژ لــــە بیابانـــــان دا دەژیـــــم
شـەوو ڕۆژ فرمێـسك لـە چـاووم وەکـو بـاران دێتـە خـوارەوە
نـــــە ئـــــازارم هەیــــــە ونـــــە دەردەداریـــــــشم
هـــــەر ئەوەنــــدە دەزانم کـــــە شــــەوو ڕۆژ دەنــــاڵێنم

وە لەلا ٢٥٨دا د. مارف لێی دەدوێت و دەڵێت :-لیرەدا سنوور بۆ کات و جێگەی شاعیر نیّیە، کات هەموویەتی، شەووڕۆژ، جێگەش هەموویەتی، هەموو ڕووی زەوی، هەروەها نەوەکو بەلەش لە مەتریال دوورە، بەڵکو بەگیانیش لە ئێش و دەرد وئازار دوورە، کەچی فرمێسك هەر دەڕێژی ولە ناڵە ناڵیش ناکەوێ چونکە نەگەیشتوەتە ڕاستی(حەقیقەت).

صدیق بورەکەی لەلا٩٥دا لە مێژووی ویژەی کوردیدا بە سادەیی راڤەی دەکات .

(*) بێجگـە لـەم چـوارینانە کـە د. مـارف خەزنـەدار دیـاری کـردوە کـە دۆزراونەتەوە ولەچاپە کونەکاندا نەبوە.پاش گەرانێکی زۆر و ماوەیەکی زۆر تـوانیم هەنـدێ دوو بـەیتی باباتـاهیر بدۆزمەوەکـە لـە سـەر چاوەکاندا ئامـاژەی پـێ کرابـوو کـەباباتاهیر ناردویـەتی بـۆ نـاویارسـان وە ئـەوان بەشێوەی سرودی پیرۆز دەیخوێننەوە، بەلاَم لە راستیدا دەرکەوت گفتو گویەکی نێوان باباتاهیرو شا خۆشینەلەگەل فاتمە لەرەدا.

لە کاتێ کە شاخۆشین دەچیتە هەمەدان وسەردانی باباتاهیر دەکات، باباتاهیر بەم دوو بەیتانە لە حزوری شاخۆشین دا دەڵێت:-

یاشا یاشا هەرکەس تۆ گوویەد هالش هەمین ئەست
بالأش خشت خام بالێنش زەمین ئەست
بەکەسانی دەهی نان کەندم کونا کون
بەکەسانی دەهی نان جۆ ئالوودە باخوون
بەکەسانی دەهی گەنج تەخت پادشاهی
بەکەسانی دەهی نان جۆ گەداهی
ئەگەر دەستم رەسد بەر چەرخ گەردوون
ئەز مەمی پورسەم ئین چیزە ئەست ئەو چوون

(*)واتاکەی:-
یاشا هەرکەسێ تۆ دەپرسێ وتۆی لەبیرە حاڵی خراپە
سەرینی خشتە و راخەری (نوینی) سەر زەوییە
بە هەندێ دەدەی نازو نیعمەت ونانی گەنم
بەهەندێکی تر دەدەی نان جۆی پلکاو بەخوێن
بەکەسانیك تر دەدەی دەسەڵات و تەختی پادشاهی
بەکەسانیك دەدەی نان جۆ بە گەدایی
ئەگەر دەستم بگاتە چەرخ گەردوون
من ئەپرسم ئەمە چییە وئەوە چوون

(*)شا خۆشین لەگەل نوسەد سوار ڕوو دەکاتە ماڵی باباتاهیر وفاتمە لەرە، بابا لەبەر نەبوونی و هەژاری نارەحەت دەبێت بۆیە بەو شێوەیە قسە دەکات، شاخۆشین زۆری پێ ناخۆش دەبێت بەلأم فاتمە لەرە زو بە زو

دڵی دەداتەوەو لێی دەپارێتەوە، فاتمە بە ئازوقەیەکی کەم خواردنیکی زۆر دروست دەکات کە بەشی هەمویان دەکات بە پێی کەرامات و بەرەکەتی شا خۆشین، پاشان باباتاهیر بە خویدا دەچیتەوە، پەشیمان دەبێتەوە ئەم دوو بەیتانەی لای خوارەوە دەڵێت :-

یاشا یاشا هەرکەس ئاهیٚ بەر کیشد
تۆ دەر مەیان ئان ئاهی
هەرکەس ڕاە خەڵەت کونەد
تۆرەهنمای ئان ڕاهی
ئەگەر مرۆچەکەدەر ئان ڕاە دەم زەنەد
تۆئەز ئاە مرۆچە ئاگاە بیناهی
تیریٚ کە تۆ زەدی بەر جان وجگەر
کە من ئەز وەشت تیر تۆ جان بەر نەبرم
ئەگەر تۆ شادی من ئەز تۆ شادمان ترم

(*)واتاکەی:-

ئەی شاە هەرکەسی ئاە وغەمێکی هەبیٚ
تۆ خۆت لێی بە ئاگای
هەکەس ڕیگا هەڵە بکات
تۆ خۆت ڕیٚ نیشاندەری ڕێگای
ئەگەر مێرولە لەو ڕێگایەدا دەم بکاتەوە
تۆ لە ئاهی مێرولە بە ئاگای
تیریٚ کە بیوەشێنی وبدا لە گیان وجگەر
من بۆ تیر وەشاندنی تۆ گیانم ناویٚ
ئەگەر تۆ بەو حاڵە شادی وا لەمن بکەی من شادمانترم

له کتیبی سەر ئەنجام لەلا ٤٩-٥١ دا ئەم دوو بەیتانە بە ناتەواوی هاتوە و زۆر بەلای فارسیدا شکاوەتەوە کە بەم شێوەی خوارەوەیە بۆ بەراورد کردن :-

یاشـــا هەرکـــەس شـــاهش تـــویی حـــاڵش هەمینـــە
ســـــــەرینش خـــــــشت و بـــــــاڵینش زەمینـــــــە
جـــــورمم ئینەســـــت کـــــەتۆ ڕا دوســـــت دیـــــرم
هـــــەر ئـــــان یـــــارش تـــــوێی حـــــاڵش چـــــەنینە
یاشـــــا مـــــــوهر تـــــــوڕا چ چـــــــارە کونـــــــەم
نایـــــەد ڕوزیکـــــە مـــــوهرت زە دڵ ئـــــاوارە کونـــــەم
ئەگـــەر بەعـــد سیـــصەد ســـاڵ بـــەر ســـەر قـــەبرم گـــوزەری
بـــۆی ویـــساڵت بـــەمن ڕەســـد کفـــن پـــارە کونـــەم

بەشی دووەم :-

یاشـــا تـــیرە زەدی بـــــەر جـــــان و جگـــــەرم
مـــن ئـــەز زەخـــم تـــیر تـــۆ جـــان دەرنـــەبرم
تـــــۆ شـــــادمان بـــــەر مـــــن تـــــیری زەدی
مـــن هـــەم شـــادمانم کـــە زەخـــم تـــیر خـــوردەم
هەرکـــەس شـــاهش تـــوێی بـــوێش خـــوش ئـــایوو
بەهـــەر مـــەجلس نـــشینە خەنـــدەش ئـــایوو
هەرکـــەس تـــوڕا گویـــەد بـــا دڵ وبـــا جـــان
هەمیـــشە کابینـــەش هـــەر دوو شـــەش ئـــایوو

# چوارینه گومان لیٚ کراوەکان

(*) لەکتیبی باباتاهیر عوریان – مەسعود میرزائی چ١ ئەم چوارینانەی دیٚن وەك پاشکوٚی کتیبەکە لە ژیر ناونیشانی
( دوو بەیتەهای مەشکوك) نوسراوەتەوە.

هەر لە سەرەتاوە کە هەست کراوە بە واتەکانی باباتاهیر لە ناخی چوارینەکاندا لە رووی فەلسەفیەو ڕوخساری شرین، وەبە پیٚی سەرچاوە جوٚراو جورەکان وا دەر دەکەویت لە سەدەی هەژدەو نوزدەوە دەستیان کردووە بە ڕوونوس کردن وکوٚکردنەوەیان تا بپاریٚزرین، لەگەل ئەو کارەشدا و چاپ کردنەوەیان چەند جار چوارینەی جوراو جوٚر خزاونەتە ناویانەوە. د. مارف خەزنەدار لە لا١٩٥٧دا دەلیٚت :-"ئەوەی بە ناوی باباتاهیرەوە کەوتوەتە ناوەوە لە بەرهەمی شیعری ئەوەیە کە نزیکەی ٦٠٠ دوو بەیت و پینج غەزەل و چەند پارچەیەکە بەلاٌم وا باوە کە دوو بەیتەکانی لە ١٣٠ تیٚپەر ناکەن. لە کتیٚبەکەی عەباس رەجەوی بە ناوی ( باباتاهیر عوریان) ژمارەی چوارینەکان ٣٦٢چوارینەیە لەگەل چوار پارچە شیعری غەزەل، لە کتیبی دیوان باباتاهیر بە چوار زمان ( فارسی، ئینگلیزی، ئەلمانی، فرەنسی) بە کوٚششی مەسعود میرزائی تەنها ٣١٣

چوارینە دەکاتە موڵکی باباتاهیر و گومانیش دەخاتە سەر ئەوانی تر، بۆیە بەباشمان زانی چوارینە گومان لێ کراوەکان بە جیا بنوسینەوە بۆ زیاتر ورد بوونەوە ولێکوڵینەوە.

(١)

نمیدونـــــەم دڵـــم دیوونـــــەی کیـــــست
کوجـــا میگـــەردد ودەر خوونـــەی کیـــست
نمیدونـــــە م دڵ ســـــەر گوشـــــتەی مـــــو
ئەســـیر نـــەرکس مەســـتوونەی کیـــست

دڵزار لەلا ٩٨دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

نـــــازانم دڵـــم دیوانـــــەی کێیـــــە
لـــە کـــوێ ئەگـــەڕێ ولـــە خانـــەی کێیـــە
نـــــازانم دڵـــــەی ئـــــاوارەیی مـــــن
دیلـــــی نیرکـــــزی مەســـــتانەی کێیـــــە؟

شیخ مەحەمەد خاڵ لەلا ٢٠دا دەربارەی ئەم چوارینەیە دەڵێت:-خوا لە هەموو شوێنیك هەیە و قەڵەمڕەوی زانینی هەموو بوونەوەرە، ئەم خوایە گەورەیە نەقەبارەی هەیە نە ڕەنگی هەیە نەدەنگی هەیە نەلەکەس دەچێ نەوێنەی هەیە، لە بەر ئەوە دڵخواز(مەعشووقە)کەی بابا لە هیچ دڵخوازێك ناچێ بۆیە ئەو جۆرە چوارینەیە دەڵێت.

(*)ئەو مەعشوقەی بابا شەیدای دیتنیەتی، ڕوناکی(نوور)ی خۆی دەبەخشیت بەکەسانی خاوێن (بەگشت مانا)، هەرچەندەباباتاهیر لەو جۆرە کەسانەیە بەلاّم هیشتا نەگەیشتوەتە ئەو مورادە، بۆیە بە سەر سامیەوە پرسیار دەکات.

(٢)

ئەگــــەر زەريـــن كلاْهـــى عاقبـــەت هـــيچ
بەتـــەخت ئـــەر پادشـــاهى عاقبـــەت هـــيچ
گـــرت ملـــك ســـليمان دەر نگـــين ئەســـت
دەر ئـــاخر خـــاك راهـــى عاقبـــەت هـــيچ

زەرين گلاْه=كلاْوى زيرين .نگين =بەد سروشت.

(*) باباتاهير لەم چوارينەيەدا ئاموژگارى مرۆڤ دەكات، كە روو لەچاكە بكات، چونكە كوتايى ژيان هەر مردنە وگەرانەوەيە بۆ خاك.وەهيچ شتێكى تر بەكار نايەت غەيرە كردەوەى چاكە لە ڕۆژى حيسابدا.

(٣)

چـــو ئـــان شـــاخم كـــە بـــارش خـــوردە باشـــند
چـــو ئـــان وێـــرون كـــە گـــەنجش بـــردە باشـــند
پـــڕ ئـــوون پـــيرى هـــەمى نـــالم دەر ئـــين دەشـــت
كـــــە ڕوودان جـــــوونش مـــــوردە باشـــــند

وێرون=وێرانە، كاول. بردە =دزرا.ڕودان = بەرێز، بەغيرەت.بارش= كولّى. چو= بۆچى، چ جۆر

(٤)

خـــۆر ئـــەز خورشـــيد ڕوويـــەت شـــەرم دارد
مـــــەنوز ئەبرووێـــــــەت ئـــــــازەرم دارد
بەشـــەهر وكـــۆە وســـەحرا هەركـــە وێنـــەم
زوبـــــان دلْ بـــــە وەصـــــلْت كـــــەرەم دارد

خورشـــيد =خـــوور.ڕوويـــەت=روخـــسارت.مـــەنوز=نـــاز مەنوێنـــە. ئەبرويەت=ئەبرۆت. دارد=هەيەتى.

(٥)

پەسەندی خواروزارم تاکەی و چەند
پەریشوون ڕۆز گـارم تاکەی وچەند
زه دۆشم باری ئەر باری نەگیری
کەری سەر بارم تاکەی و چەند

خوار =لاژیر، پاین. دۆشم =کۆڵم، شانم.

(*) باباسکالاْ بۆ یار دەکات، که لەژیاندا پەریشانه وباری قورسی له سەر شانه(زکرو عبادەت خۆ پاراستن دوور کوتنەوه له خۆشی ژیان) تا کەی خۆی پیشان نادات؟ تا یەکبوون وشادمانی بیگرێتەوه.

(٦)

نیهاڵی کان سەر ئەز باغی بەر ئارد
بەبارش هەر کەسیٚ دەستیٚ دەر ئارد
بدایەد کەندەنش ئەز بیخ و ئەز بن
ئەگەر بەرجای مێوه گوهەر ئارد

نیهال = جوانی. بەربارش = بەهۆیەوه.بدایەد =دەبوایه کەندەنش= هەڵکەندنی، دەر هێنانی. ئەز بیخ وئەز بن =له ڕەگ وریشەوه.

(٧)

یەکیٚ دەرد ویەکیٚ دەرموون پەسەندەند
یەکیٚ وەصڵ ویەکیٚ هیجروون پەسەندەند
مو ئەز دەرموون ودەرد و وەصڵ هیجروون
پەسەندم ئانچه ڕا جانوون پەسەندەند

ئانچه =ئەوجاکه.

(٨)

دلاْ خـــوْ بـــوون دلْ خـــونين پەســـەندەند
دلاْ خـوون شـو کـە خوْبـوون ئـين پەسـەندەند
مــەتاع کفــرو ديــن بــیْ موشــتەری نيــست
گروهــیْ ئــوون گروهــیْ ئــين پەســەندەند

خوْبوون =چاکە، باشە. خوون شو= بو بە خوێن. مەتاع = خوْشی .
گروه =تاقم، دەستە.

(٩)

دوو چــەشمم دەرد چــەشموون تــوْ چــيناد
نــەوا دەردیْ بــە چــەشموونت نــشيناد
شــنيدەم ڕەفتــی و وەيــاریْ گرفتــی
ئەگــەر گووشــم شــنەو چــەشمم نــەويناد

چــيناد =لادەبــات، کــزی دەکــات، هــەلْ دەچــنی. نــشيناد =بنشێتەوە.ڕەفتی= ڕۆیشتی .گرفتی=گردوتە. نەویناد= نابینیْ. شنەو= ببیستی. گوْشم=کوێم

(١٠)

ئەگــەر شــێری ئەگــەر بــەبری ئەگــەر کــوور
ســەر ئــەنجامت بــوود جــا دەر تــە کــوور
تــەنت دەر گــوْر گــەردد ســفرە کەســتەر
بگــەردش مــووش ومــارو عــەقرەب ومــوْر

بـەبر =گيانەوەرێکە لـە نێـوان پلْـنگ وپـشيلە.کەستر=کەسێکی تـر .
عەقرەب= دووپشك.

(١١)

جـــودا ئـــەز ڕویـــەت ئـــەی مـــاه دلْ ئـــەفروز
نـــەڕووز ئـــەز شـــەو شناســـم نـــە شـــەو ئـــەز روز
وصـــالْت گـــەر مـــەڕا گـــەردد مەیـــسەر
بـــوود هـــەر ڕووز مـــن چـــوون عیـــد نـــەوروز

ئەفروز= پاك، روناك. مەیسەر =ڕێك كەوتن، پێكهاتن. عید = چەژن.
وصالْ = پەیوەندی.

(١٢)

دلاْ ئەســـــلا نەترســـــی ئـــــەز ڕاهـــــی دوور
دلا ئەســـلا نەترســـی ئـــەز تـــەهی گـــوور
دلا ئەســـــلا نەترســـــی كـــــە ســـــە ڕووزی
شـــەوی بنگـــاه مـــارو ولانـــە مـــوور

(*) باباتـاهیر دلْ نـەوایی خـۆی دەداتـەوە كـە ڕێگایـەكی زوور دوور و قورسی هەلْبـژاردوە و نابێـت بترسێت و دلْ بگۆڕێـت(وەك كـورد دەلێـت ڕیـشی ناوەتـە گرەو دەبێـت تـا سـەر بێـت )، چـونكە دونیا چەند ڕۆژێكـە و دەكەوێتە بن خاك ولاشەی دەبێتە لانەی مارو مووری.

(١٣)

بـــەڕوی ماهـــت ئـــەی مـــاه دە دچـــار
بەســـەرو قـــەدت ئـــەی زیبنـــدە رفتـــار
بـــەجز عـــشقت خـــەیالْی دەر دلْـــم نـــی
بـــە دیـــاری نـــەبوو جـــز تـــوو ســـەرو كـــار

دچار =تووش بوو .زیبنده =خشلْ، هۆی رازاندنەوە. دە =ژمارەی دە، ئەمر کردن .دەستور دان.

(١٤)

بــه گورســتان گــوزەر کــەردم کــەم و پــیش
بدیـــــدم حـــالّی دەولّەتمەنـــدو دەرویـــش
نــه دەروێــشی بــه خــاکی بــیْ کفــن مانــد
نــه دەولّەتمەنــد بــەرد ئــەزیــەك کفــن پــیش

له کتیبەکەی شیخ مەحەمەد خالْ لەلا٢٤٧دا دیری سییەم نوسراوە :-
نەدەروێشی بیْ کفن دەر خاك رەفتە.

(*) مەبەسـتی بابـا لـیرەدا ئاموژگاریـە، مـردن بـۆ هـەموو وەك یەکـە دەڵەمەنـد بیـت یـان هـەژار هـەر تـەنها کفنیك لەگـەل خـووت دەبات، جا دەبێت ئاگات له خۆبێت، سامان وپلەو پایە مەغرورت نـەکات وله ڕێگـای خوا ناسیدا له خشتەت ببات له ڕێی ڕاست لا بدەی.

(١٥)

فەلــەك نــه هامــسەریْ دارد نــه هــام کــوف
بــه خــوون ریــزی کەســیْ ئەصــلانەگوفت ئــوف
هەمیـــــشه شـــــێوه و کـــــارش هەمینـــــه
چـــــراغی دوود مـــــانی ڕا کونـــــەد پـــــوف

هامسەری =هاوتا .هام کەف= هاو دەست. ئـوف =لـه ئـوفی عارەبیـەوە وەر گیراوە. پـوف =کوژانـەوە. دوودمانـی= داگیرسان، دەم دان.هەمینـه= هەر ئەوەیە، هەر وایه.

(١٦)

مـــەڕا دەرد بـــا ســـوتە دەرمـــان چـــە حاصـــل
مـــەڕا مـــەرگ نامرتـــە گریـــان چـــە حاصـــڵ
بـــــسوونەم گـــــوڵی ئالالـــــە بـــــێ ســـــەر
ســـــوموتە کـــــەمان بـــــاروون چـــــە حاصـــڵ

سووتە= سوتاندن، سەخت .مرت=پوستەی ناسك یان پەڕی دووەمی باڵندە.بسوونەم=بگرم. کەمان =کەوان. باروون =بهێنن، پیشە .سوموتە =سبەینێی من وتۆ.

(١٧)

حـــەرامم بـــی تـــە بـــۆ ئالالـــە و گـــوڵ
حـــەرامم بـــی تـــۆ بـــۆ ئـــاوازی بلبـــل
حـــەرامم بـــی ئەگـــەر بـــێ تـــۆ نـــشینەم
کـــشم دەر پـــای گوڵبـــەن ســـاغری مـــل

کشم =بێ دەنگم. ساغر =پیاڵە
(*) بابا بە مەعشوقە (یار) دەڵێت کە بێ ئەو هەموو شتی لە خۆ حەرام کردوە لەم دونیایەدا، تەنها یادی ئەو نەبێت و خوا ناسی وکردەوەی چاك.

(١٨)

بـــە خەنجـــەر گـــەر دەر ئـــارن دیـــدەکوونم
نـــــەگیرم دڵ زە یـــــار میهرەبـــــوونم
ئەگـــەر بـــەر نـــاخنونم نـــەی بکـــۆ بـــن
نـــــەگیرم دڵ زە یـــــاری میهرەبـــــوونم

ئەم چـوارینەیە لـە چاپە كونەكـەی عـەباس رەجەویـدا دوو نیـوە دێری یەكەم بەم شێوەیەیە:-

بەخەنجـــەر گـــەر دەر ئـــارن دیـــدەكوونم
بـــە ئاتـــەش گـــەر بـــسوزەن ئەســـتخوونم

دلزار بەم شێوەی خوارەوە كردویە بە سورانی:-

بەخەنجـــەر گـــەر دەر بێـــنن دیـــدەكانم
بـــە ئـــاگر گـــەر بـــسووتێنن ســـوقانم
ئەگـــەر نـــەی ئـــاژنیش كـــەن ناخونـــانم
نكـــوڵ ناكـــەم لـــەیاری میهرەبـــانم

رزایش لە لا ١٢ دا گۆریویەتی بۆ سۆرانی.

(١٩)

مـــن ئـــوون مـــسكین بـــێ قـــەدر و پەرســـتم
مـــن ئـــوون ســـوزندە شـــەمعی بـــێ سەرســـتم
نـــە كـــار ئـــاخرەت نـــە كـــار دونیـــا
مـــن ئـــوون خـــشكیدە نـــەخلی بـــێ بەرســـتم

من ئوون= من ئەو .سوزندە =سوتاو . خشكیدە= ووشك بوو.نەخل = دار خورما. بێ بەرستم =بێ بەرم.

(٢٠)

موئـــان رەنـــدم كـــە عـــصیان پیـــشە دیـــرم
بـــە دەســـتی جـــام و دەســـتی شیـــشەدیرم
ئەگـــەر تـــوو بـــێ گونـــاهی ڕو ملـــك شـــو
مـــو ئـــەز حـــەواو ئـــادەم ڕیـــشە دیـــرم

دڵزار له ١٩٩٧دا كردویه به سورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

مـــن ئـــەو ڕەندەمـــە عـــصیانە پیـــشەم
بەدەســـتێ جـــام وبەدەســـتێ شیـــشەم
گـــەر تـــوو بـــێ خـــەتایی ببـــە فریـــشتە
مـــن لـــە حـــەواو ئادەمـــە ڕیـــشەم

(*) مـرۆڤ هەسـت و ئـارەزوی هەیـە واتـە گونـاهی هەیـە، چـونكە ئارەزوەكانی دەروون زاڵ دەبن بە سەر هـۆش وبیری مروڤدا و تووشـی گوناهی دەكەن.ئەوەی بێ گوناه بێت لەم دونیایەدا فریشتەیە.بابا لێرەدا ئاخاوتن لەگەڵ یار دەكات.

(٢١)

زە بـــەخت بـــەد هـــەزار ئەندیـــشە دیـــرم
هەمیـــشە زەهـــر غـــەم دەر شیـــشە دیـــرم
زە ناســـازی بـــەخت و گـــەردش چـــەرخ
فیغـــان و ئـــاه و زاری پیـــشە دیـــرم

ئەندیشە =بیروكە، هەزەر.چەرخ =زەمانە، فەلەك.

(٢٢)

زە عـــشقت ئاتەشـــێ دەر بووتـــە دیـــرم
دەر ئـوون ئاتـەش دڵـی خـوون سـو وتـە دیـرم
سەگت گەر پا نەهد بەر چەشمم ئەی دووست
بـە موژگـان خـاكی ڕاهـش ڕوو تـە دیـرم

بۆتە =بۆتۆ .ڕاه =ڕێگا.

(٢٣)

بـــوره بـــوره كـــه ديـــدارى تـــوو وينـــه‌م
گـــولْ وســـونبل زه ديـــدارى تـــوو چـــينه‌م
هـــه‌مين شـــه‌وقم بـــه‌دى ســـالوون ومـــاهوون
كـــه ده‌ر ڕووى چـــه‌مه‌ن بـــا تـــه نـــشينه‌م

بووره=وه‌ره .چينه‌م =ده‌هونمه‌وه.سالوون= سالاْن.چه‌مه‌ن=چيمه‌ن.

(٢٤)

ئيلاهـــى ئاتـــه‌ش عـــشقم بـــه جـــان زه‌ن
شـــه‌ره‌ر زه ئـــان شـــوعله‌م بـــه‌ر ئيـــستخوان زه‌ن
چـــو شـــه‌معم بـــه‌ر فـــرووز ئـــه‌ز ئاتـــه‌ش عـــشق
بـــه‌ر ئـــان ئاتـــه‌ش دلْـــم په‌روانـــه ســـان زه‌ن

بـه‌ر فـرووز=ڕونـاكى.زه‌ن = ده‌سـت پـىْ بكـا.شـه‌ره‌ر=بليـسه.شـوعله =گڕ.ئيستخوان= ئێسقان. په‌روانه سان =به‌شێوه‌ى پوروانه.

(٢٥)

بـــىْ تـــه گولـــشه‌ن به‌چـــه‌شمم گولخـــه‌ن ئـــايو
واتـــه گولخـــه‌ن بـــه چـــه‌شمم گولـــشه‌ن ئـــايو
گـــولْم تـــه گولْبـــه‌نم تـــه گولـــشه‌نم تـــه
كـــه بـــا تـــه مـــورده ڕا جـــان بـــه‌ر تـــه‌ن ئـــايو

(٢٦)

بـــه دلْ چـــوون يـــادم ئـــه‌ز بـــووم و بـــه‌ر ئـــايو
سرشـــكم بـــىْ خـــود ئـــه‌ز چـــه‌شمم تـــه‌ر ئـــايو
ئـــه‌ز ئـــان ترســـه‌م منـــى بـــه‌ر گـــشته ده‌وران

کــە عـــومرم دەر غـــەریبی بـــەر ســـەر ئـــایو

بووم وبەر=بەرو بوومی درەخت.سرشك =فرمێسك.بەر گشتە= سەر گەردان.دەوران= زەمانە.

(٢٧)

خـۆش ئـان سـەعات کـە یـار ئـەز دەر دەر ئـایو
شـــەوی هیجـــران و ڕووز غـــەم ســـەر ئـــایو
زە دڵ بـیروون کونـەم جـان ڕا بەصـدق شـەوق
هـــەمین واچـــم کـــە جـــایش دەلبـــەر ئـــایو

ئەز دەر =لە دەرگا. دەر ئایو= بێتە دەر .بیروون کونەم=دەری دەهێنم .هەمین واچم= هەر وا دەڵێن.

(*)باباتـاهیر ئەوەنـدە بـە پەرووشـە بـۆ دیتنـی یـار، ئەگـەر بیبینـێ حـەز دەکـات دڵـی دەر بێنـی و یـار بخاتـە جیگـای.ئیتر غـەم وپەژارەی نـامێنی، شادمان دەبێت.

(٢٨)

بـــێ تـــە هـــەر کـــە ســـەرم بـــەر بـــاڵش ئـــایو
ئیـــــستخوانم چـــــونی دەر نـــــاڵش ئـــــایو
زە هیجروونــت بــەجای ئەشــك ئــەز چەشـــم
زە مــــژکون شـــــوعلەهای ئاتـــــەش ئـــــایو

(٢٩)

ئامـــان ئـــەز ئەختـــەری شـــوریدەی مـــو
فیغـــان ئـــەز بـــەخت بـــەر گردیـــدەی مـــو
فەلـــەك ئـــەز کینـــە و رزی کـــی گـــوزارە
دەر خـــوون ئـــەز دڵـــی غـــەم دیـــدەی مـــو

رزی=رەز.

(٣٠)

عـــــەزیزان مـــــەوسمی جـــــۆش بـــــەهارە
چـــیمەن پـــڕ ســـەبزە ســـەحرا لالـــە زارە
دەر ئـــین مەوســـم دەمـــێ فرســـەت غەنیمـــەت
کـــــە د ونیـــــای دەنـــــی بـــــێ ئیعتبـــــارە

مەوســـــم =وەرز. فرســـــەت غەنیمـــــەت= فرســـــەت بـــــە دەســـــت بێنە.دەنی=ئاست نزم.بێ ئیعتبار=بێ قیمەت.

(٣١)

غـــــەمم بـــــێ حـــــەد و دەردم بـــــێ شمـــــارە
فیغـــان کـــاین چـــارە ودەرمـــــوون نـــەدارە
خوداوەنـــدا نـــــە دوونـــــە ناصـــــح مـــــو
کـــــە فریـــــای دڵـــــم بـــــێ ئیختیـــــارە

کاین= ئەمەیە .

(٣٢)

ســـــەری ســـــەر گـــــشتەم ســـــاموون نـــــەدارە
دڵـــی خـــــوون گـــــشتەم دەرمـــــوون نـــــەدارە
بـــــە کـــــافر مەزهـــــەبێ دڵ بەســـــتە دیـــــرم
کـــە دەر هـــــەر مەزهـــــەبێ ئیمـــــوون نـــــەدارە

سەر گشتە= سەر گەردان .ساموون =سامان .ئیموون = ئیمان.

(٣٣)

ئیلاهـــــی ســــۆز عەشــــقم بیـــــشتر کـــــە
دلْ ڕێـــــشم زە دەردش ڕیـــــش تــــــر کـــــە
ئــەز ئــین غــەم گــەر دەمــیْ فــارغ نــشینم
بـــە جـــانم ســـەد هـــەزاران نیـــشتر کـــە

فارغ= دەست بەتالْ یان لە بیری بکات.نیشتر =نەشتەر.بیشتر =زیاتر.

(٣٤)

ســـــەرم بـــالێن، تـــــەنم بەســـــتەر نـــــەدارە
بـــە جـــز شـــوور غـــەمت دەر ســـەر نـــەدارە
نەهـــد دوور ئەزتـــە هەرکـــەس ســـەر بـــە بـــالێن
ئیلاهـــــی ســـــەر زە بـــالێن بـــەر نـــەدارە

شوور= قۆناغ، شەوق، مەیل. نەهد =دادەنێت. بەستەر =ڕایەخ، جیگا. نەدارە =نییەتی . بەر نەدارە= دەر نەهێنی.

(٣٥)

زە بـــەس مـــوهری ڕوخـــت عالـــەم فـــرووزە
جـــەهان ڕا دلْ بـــە مـــوهرت ســـینە ســـووزە
فەلـــەك ڕا شـــێوە دایـــم ئـــین چـــەنین بـــوود
کـــە هـــەر جـــا چەشـــم ئامیـــدی بـــدووزە

ڕووخت= ڕووت .فرووزە = ڕوشن بووە. ئامید = هیوا، هینات . موهر = خۆشەویستی.

(٣٦)

غـــەمی عـــشقت زە گـــەنجی ڕا یکـــان بـــە
وِصـــاڵی تـــە زە عـــومر جاویـــدان بـــە
کـــەفی ئـــەز خـــاك کویـــەت دەر حەقیقـــەت
خـــودا دانـــد کـــە ئـــەز کـــەون ومـــەکان بـــە

گـەنج= بـێ بەرامبـەر. ڕایکـان =خـورایی. جاویـدان= نـەمر کـەفی =مشتێ، چنگێ. کویەت= کۆە،

(٣٧)

ســـــەدای چاوشـــــان مـــــوردن ئایـــــە
بـــە گـــووش ئـــاوازە جـــان کەنـــدن ئایـــە
رەفیقـــون مـــیروون نۆبـــەت بـــە نۆبـــەت
وای ئـــان ڕووزی کەنۆبـــەت بـــەر مـــن ئایـــە

سـەدا =ئـاواز، دەنـگ. چاوشـان= چاوشـەکان.مـوردن =مـردن، مـورد =شـوین، جـێ مەسـەلە.کەنـدن =خـاوبوون.میروون = دەروون .نوبـەت بـە نوبەت =یەك لە دوای یەك.ئایە =دێت.

(٣٨)

چ خـــۆش بـــی میهرەبـــان هـــەر دوو ســـەربی
کـــە یەکـــسەر میهرەبـــانی دەردە ســـەر بـــی
ئەگـــەر مـــەجنوون دڵ شـــوریدەی داشـــت
دڵـــی لـــەیلا ئـــەز ئـــان شـــوریدەتر بـــی

دڵ شوریدە =دڵ بە شەوق، دڵ مایل. داشت =هەیبوو.

(٣٩)

زە دەســت عــشق هــەر شــەو حــاڵم ئــین بــی
ســـەریرم خـــشت و بـــاڵینم زەمـــین بـــی
خۆشــم ئــین بــی کــە مــو تــە دۆســت دیــرم
هــەر ئــان تــە دۆســت دارە حــاڵش ئــین بــی

ســـەریر= جیگـــا، چـــوار پایـــە.خۆشـــیم ئـــین بـــی =خۆشـــیم لەوەدایە.کەموتەدۆست دیرم =کە من دۆستی تۆم.هەر ئان تە دۆست دارە =هەر ئەوەی دۆستی تۆیە. حاڵش ئین بی = حاڵی ئەمەیە.

(٤٠)

ئەگــەر جایــەت بــە چــەرخی چــارەمین بــی
مــەدوومت گــورگی مــەرگ ئەنــدەر کــەمین بــی
وە گـــەر ســـەد ســـاڵ دەر دونیـــا بمـــوونی
دەر ئـــاخر مـــەنزلت زیـــری زەمـــین بـــی

دلزار لە لا٥٤دا کردویە بە سورانی بەم شێوەی خوارەوە :-
ئەگـــەر جیگـــەت لـــە چـــەرخی چـــوارەمینە
کـــە مـــادام گـــورگی مـــەرگت لـــە کەمینـــە
ئەگـــەر ســـەد ســـاڵ لـــە دونیـــادا بمێنـــی
لـــە ئـــاخر مـــەنزڵت ژێـــری زەمینـــە

شیخ مەحەمەد خاڵ لەلا ٢٣دا دەڵێت:-"باباتاهیر سۆفییەکی پایەبەرز بووە هەمیشە لە بیری خواو مردنا بووە و سۆزو گودازو نیازو خەم و خەفەتی هەر یادی خواو مردنە، ئەوە کە هەژارە و دەوڵەمەندە و گەورەو بچوك وداناو نادانی لەلا چوون یەکە و ئاموژگاری هەردوو لایان دەکات.

(٤١)

بـــه گورســـتان گـــوزەر کـــەردم ســـەباحیٚ
شـــــنیدەم نالٚـــــه و فغـــــان و ئـــــاهیٚ
شـــنیدەم کەللـــەیی بـــه خـــاك میگوفـــت
کـــەئین دونیـــا نمـــی ئـــازەرد بـــه گـــاهی

گوزەر کەردم =تێپەریم. سەباحی =بەیانیانێك، سبە ینانێك.شنیدەم =بیستم، گوێم لی بوو.میگوفت =ئەیوت، دەدوا.نمی ئارزەد= بە جیٚ ناهێلٚی. گاهی =تاوێك .

(٤٢)

هـــەر ئـــوون کـــەس مـــالٚ وجـــاهش بێـــشتر بـــی
دلٚـــش ئـــەز دەردی دونیـــا ڕێـــشتر بـــی
ئەگـەر بـەر سـەر نەهـد چـوون خەسرەو ئان تـاج
بـــه شـــیرین جـــانش ئـــاخر نێـــشتر بـــی

جاهش = سامانی .بێشتر =رزۆرتر . ڕێشتر =بریندارتر، زامدارتر.بەر سەر نەهد =بیناته سەر سەری، له سەری نیٚ.نیشتر =بەر نەشتەر، چەقوو.

(٤٣)

عـــەزیزوون ئـــەز غـــەمی دەردی جـــودائی
بـــه چـــەشموونم نەمانـــــدە ڕۆشـــنائی
گرفتـــــارم بـــــه دەردی غوربـــــەت ودەرد
نـــه یـــار و هەمـــدەمیٚ نـــه ئاشـــنائی

(*) باباتاهیر سکالاٚ ئاراستەی دۆست وبارانی دەکات و لە دەست غەریبی ودووره ولاٚت دەنالێنی، هەروا لە ژیر گرفتاربوونی بە ئەوینی یارو

ئاواتی بە دی نەهاتووی، کە بە تەنیا ماوەتەوە نەیار و نەهاودەم ودۆست لە دەوری نیە، بوویە غەرقی دەریای غەم وپەژارە بووە .

(٤٤)

دڵـــی شـــاد ئـــەز دڵـــی زارش خەبـــەر نـــی
ســـەلأمەت ڕوزی بیمـــارش خەبـــەر نـــی
نـــە تەقـــصیرتە، ئـــین ڕەسمـــی قەدیمـــە
کـــە ئـــازاد ئـــەز گرفتـــارش خەبـــەر نـــی

دڵزار لەلا٦٦دا کردویە بەسورانی بەم شێوەی خوارەوە:-

دڵـــی شـــاد ئاگـــای لـــە دڵـــزار نیـــە
سپووســـاغ ئاگـــای لـــە بیمـــار نیـــە
سووچـــی تۆنیـــە ڕەسمێکـــی کۆونـــە
ئـــازاد لـــە ئەســـیر ئاگـــادار نیـــە

(*) ئەمەش لەگەل دەقی قسەی نەستەق دەگونجێت کە دەڵێت:- سکی تێر ئاگای لە سکی برسی نیە.

هەروەها رازیش لە ١٢ دا ئەم چورینەی کردووە بە سۆرانی.

(٤٥)

نەســـیبی کـــەس نـــەبی دەردی دڵـــی مـــو
کـــە بـــسیارە غـــەمی بـــێ حاصـــل مـــو
کەســـی بـــوو ئـــەز غـــەم ودەردم خەبـــەردار
کـــە دارە موشـــکلی چـــوون موشـــکلی مـــو

(*) باباتاهیر گرفتاری دەردێك بووە بێ وێنەیە، هەرچەندە دەڵێت بێ ئەنجامە، بەلأم ئەو ئەنجامەی دەست دەکەوێت لەڕۆژی پەسلأندا.

(٤٦)

بــه لامــەردش بــه کـــامم دەڵبــەرم بـــی
ســوخەنهای خۆشــش تــاج ســەرم بـــی
ئەگــەر شــاهم ببەخــشەند مــوڵکی شــیراز
هــەمان بــەهتر کــه دوڵبــەردەر بــەرم بـــی

لامەردش=شاریکه له ناوچەی شیراز.

(٤٧)

زه دڵ مــوهری ڕوخـــی تــوو رەفتــەنی نـــی
غـەمی عـشقت بـه هـەر کـەس گوفتـەنی نـی
وەلیــەکون ســوزش مــوهر و موحەبـــەت
مــەیان مــەردموون بـــن هەفتــەنی نـــی

موهری ڕوخت= وینەی ڕووت. رەفتەنی نـی=دوور ناکەوێتەوە، لە یاد ناچیت.وەلیەکون(وشەیەکی عەرەبیە)=هەروا. مەردموون=کۆی مەردە، واتە مرۆڤ. (خەڵکان)

(٤٨)

تــه کــه خورشــید ئــەوج و دڵ رەبــائی
چــەنین بــێ رەحــم وســەنگین دڵ چــرائی
بــه ئــەوەڵ ئــان هەمــه مــوهرو موحەببــەت
بـــه ئــاخر ڕاه و ڕەســـم بـــێ وەفــائی

خورشید =خۆر.ئەوج =لوتکه. دڵ رەبائی =دڵ رفێنی. چەنین =وەها، بەم جورە.

(٤٩)

نـــەبو ڕۆیـــەم بـــە غـــەیر ئـــەز بـــیٚ قـــەراری
شـــــــوون بێـــــــداری و فغـــــــان وزاری
بـــەمن ســـۆزی دڵـــی هـــەر دوور ونزدیـــك
تـــە ئـــەز ســـەنگین دڵـــی پەروانـــەداری

ڕۆیەم =ڕۆژێکم. شوون =لە شیوەی، لەجیاتی.

# هەڵبەستە غەزەلیەکان

یەکەم =

ئـــەلا تـــازار چـــوون تـــوو، دولبەرســـتم
ســـەراپا هەمـــچوو ســـووتە مەجمەرســـتم
مـــو ئـــان ســـووتە دلیٚ ئاتـــەش مـــزاجم
کـــە دۆزەخ حـــزوی ئـــەز خاکەسترســـتم
نـــەخور نـــەخواب دیـــرم بـــیٚ تـــوو گـــوئی
کـــە دەر تـــەن هـــەر ســـەری مـــو خەنجەرستم
جـــودا ئـــەز تووبـــە خولـــد و حـــەور و توبـــا
ئەگـــــەر خرســـــەند گـــــەردم کافرســـــتم
نـــــەبی ئـــــەز ئەفـــــسەر شـــــاهیم فـــــەخریٚ
کـــە ئـــین ژولیـــدە مـــوو بـــە زە ئافـــسەرستم
زە بـــــالٚینم هەمـــــە ئـــــەڵماس ڕووئـــــی
هەمـــــە خـــــارو خـــــسك دەر بەستەرســـــتم
چـــو شـــەمعم گەرســـەر ئەندازەندســـەدبار
فروزەنـــــــدەتر وســـــــوزان ترســـــــتم
نـــەکاری ئـــاخرەت کـــەردم نـــە دونیـــا
یـــەکی بـــیٚ سـایە نـــەخلی بـــی بەرســـتم
ڕوخ تـــوو ئافتـــاب ومـــوو زە حیرمـــان

یــــەکی پــــژمورده تـــــەن نیلوفەرســـــتم
ســـپند ئاســـا مـــــەیانی ئاتـــــەش عـــــشق
یـــەکی پەرەکەنـــدە مـــورغی بـــیٚ پەڕســـتم
مویـــەم ئـــان بـــارور نـــەخلی موحەبـــەت
کەحەســـرەت ســـایە و زەحمـــەت پەرســـتم
بەیـــــەك نالەبـــسووچەم هـــەر دووعالـــــەم
کـــــە ئـــــەز ســـووز جگـــــەرخنیا گرەســـتم
دەر ئـــین دیـــرم چـــنان مـــەهمووم ومـــەغمووم
تـــوو پەنـــداری چـــوو مـــووغ دەر ئازەرســـتم
زە دەوران یەکـــسەری مـــوو بـــەهرام نیـــست
کـــــە ڕووز ئـــــەز ڕووز دیگـــــەر بەدترســـــتم
دەر ئـــین دونیـــا یـَــەتیمم بـــیٚ تـــە گـــووئی
چـــوو تفلٚـــی بـــیٚ پـــدەر بـــیٚ مادەرســـتم
بەســـــــان کـــــافرم دەر مۆمنـــــــستان
بەســـــانی مـــــومن ئەنـــــدەر کافرەســـــتم
بـــــەموڵك عـــــشق رووحـــــی بـــــی نیـــشانم
بـــە شـــەهری دڵ یـــەکیٚ ســـورەت پەرســـتم
ئەگـــــەر ڕووزی دووســـــەد بـــــارت بـــــوینم
بـــــەجان موشـــــتاق، بـــــاری دیگەرســـــتم
زوبـــــــانی پەهلـــــــەوی ڕا ئوســـــــتادم
کتـــــــاب عاشـــــــقی ڕا مەصدەرســـــــتم
خودایـــا عـــشق تـــاهیر بـــیٚ نیـــشان بـــی
کـــە ئـــەز عـــشق پوتـــان بـــیٚ پـــا سەرســـتم

ئەلا=خودا .هەم=دووبارە. هەمچو=دووبارە چۆن.تازار =پەریشان. مزاج=سروشت. حەزوی= قەستی. خولد=نەمر .حور=کیژی ناو بەهەشت.توبا=بەختەوەر، پاکتر. خرسەند= شادو خۆشحالْ. ژولیدە =شەڵەژاو، شرپار. ڕەخ توو ئافتاب =ڕووی توو وەك هەتاوە.پژموردە =لاواز بوون، سیس بوون.سپند=بزیو، چالاك.بارور =کوڵ وبار.خنیاگرەستم =دەنگی هەناسە.چنان= چەندێ. موغ= موغەکانی زەردەشتی.پەن داری =عیبرەتت هەیە .بەهرام=پەسەند کراو.بەسان =وەکو. مۆمنستان=جیگای بڕواداران.بار=جار.مەسدەرستم= سەرچاوەم.پوتان=کۆی پوت.بیْ پا سەرستم= بیْ پاو سەرم.

تێبینی:- پاش نیوە دێری ١٩دوو نیوە دێڕ لە چاپی نوێدا لابراوە وەلە چاپی کۆنی عەباس رەجەویدا هەیە کە ئەمانەن:-

نمیگیرەد کەسم هەرگز بە چیزی
دەر ئین کیشوەر زە هەر کەم کەمتەرستم

نیوە دێڕی ١٤ لە چاپی کوندا بەم شێوەیە نوسراوە:- فروندەتر وسۆزان پەرستم

(*)ئەم پارچە شیعرەی باباتاهیر لە ژێر ناونیشانی غەزەل هاتووە، ئەگەر لە ناخی بدویی غەزەلێکی ئاسایی نییە، بەڵکو غەزەلێکی مەجازیە بەرامبەر خواو پیروانی ڕێبازەکەی.

دووەم =

مــو ئــان ســووتە دڵ بــێ پــا سەرســتم
کـــە دڵ ســـووتە زە عـــشقی دولبەرســـتم
بـــە دڵ ئەزلالـــە ڕویـــان داخ دیـــرم
هەمـــە ئـــان دەر ڕەگ وجـــان نـــشتەرستم
ڕەخـش تـا کـردە دەر دڵ جلـوە ئـەز مـوهر
بخـــوبی ئافتـــاب خاوەرســـــتم
مــو ئــان نەخــچیر وەحــشم تــیر خــوردە
کـــەدەر دامـــی زەمانـــە مـــضطرســـتم
بـــەجز مــــوهرت ئەگـــەر دەر دڵ گوزینـــەم
بـــە هـــەفتاد ودوو مللـــەت کافرســـتم
دەر ئـــین ئاماجگـــە دونیـــای فـــانی
یـــەکی ئەشکـــستە تـــەیری بـــێ پەرســـتم
هەمـە سووچـم هەمـە سووچـم هەمـە سـووچ
بەگـــەرمی چـــوون فـــروزان ئازەرســـتم
مـــەنم تـــاهیر کـــە دەر خونابـــە نۆشـــی
موحەمـــــەد ڕا کەمینـــــە چاکرســـــتم

جلــوە =لــە پیــشەوە .بخــوبی ئافتــاب =بتــەوی ڕۆژ . مــضطرســتم =ناچارم.گوزینەم =لە گوزەرانەوە وەرگیراوە.
ئاماج =ئاماژ، دەست نیشان کردن.تەیری بێ پەرستم =مەلی بێ پەرو باڵسووچ=سوتانم.فروزان=ڕوشنایی
خونابە =خوون وئاو

سییەم=

دلاَ دەر عـــشق تـــوو ســـەد دەفتەرســـتم
کــە ســـەد دەفتــەر زە کـــەونین ئەزبەرســـتم
مـــەنم ئـــان بولبـــل گـــولْ ناشـــکفتە
کــــە ئـــازەر دە تـــەهی خاکـــسترستم
دلْـــم سووچـــــە زە غەصـــــەوەر بریـــژە
جـــەفای دوســـت ڕا خواهـــان ترســـتم
موئـــان عـــوودم مـــەیان ئاتەشـــستان
کـــەئین هـــەفت ئاسمـــان هـــا مەجمەرســـتم
شـــود ئــەز نیلـــی غــەم و ماتــەم دلْــم خـــوون
بـــە چـــەهرە خووشـــتر ئـــەز نیلوفەرســـتم
دەریـــن ئەللالـــە دەر کـــۆیش چـــو گولْخـــەن
بـــە داخـــی دلْ چـــوو ســـۆزان ئاخگرســـتم
نـــەزور ســـتەم کـــە بـــا دوشمـــن ســـتیزم
نەبـــەهرەی دوســـتان ســـیم وزەرســـتم
زە دەوران گرچـــە پـــوور بـــیْ جـــام عەیـــشم
وەلی بـــیْ دۆســـت خـــونین ساغرســـتم
چـرم دایـم دەر ئـین مـەرز ودەرئـین دەشـت
کـــە مـــورغ خـــوگری بـــاغ و بەرســـتم
مـــەنم تـــاهیر کەئـــەز عـــشق نـــەکویان
دلْـــی لـــەب ریـــز دەر خـــوون ئەندەرســـتم

دەفتەر=نوسینگە، دەفتەری نوسین.عود=دار. ئاتەشستان =جیگـای ئاگر کردنەوە.نیلی =نەهیلی. کۆبە =خۆشی .سوزان=سوتێنەر. ئاخ گرستم

=داخ دەخـــۆم.ســتیز =ململانـــێ، شـــەر.ســیم= وایـــەر .زەر =زیـــر، ئـــاڵتون.بـــەهرەی =بـــەهرە، ســـوود.پـــوور =ئەبـــدال. جـــام =تـــاس، کاسە.عەیش=ژیان.ساغر =پەیمان.چرم=بانگ دەکەم.مەرز =سنور . مورغ = باڵندە .خوگری =خوو گرتن.نەکویان =کۆ نەبوون. لەب ریز =لیو ریژ، سەر ریژ.ئەندەرستم =لەولاوەم.

چوارەم

مـــن ئـــان مـــسکین تـــە زەرو بـــێ پەرســـتم
موئـــان ســـوزندە شـــەمع بـــێ بەرســـتم
هەمـــــە دەر ئاشـــیان دیـــرن نـــــەشمین
دەر ئـــین ویرانـــە مرغـــی بـــێ پەڕســـتم
بـــەدین مەردانـــەکی هەســـتم چـــنان خـــوار
نـــە پەنـــداری کـــە بـــەر ســـەر موعجرســـتم
دلاَ نـــــاموردە ئاســـــایش نـــــەبینی
کـــــەمو تاجـــــان نـــــەدادم و ئەندەرســـــتم
دڵ ئـــەز ئالالـــە ڕوویـــان ســـووتە دیـــرم
ئـــەز ئینـــان دڵ دەر و جـــان نـــشتەرستم
ئەگـــەر جـــوز میهـــر تـــوو ئەنـــدەر دڵـــم بـــی
بـــە هـــــەفتادو دوو میللــــەت کافرســـــتم
فراقـــی لالـــە ڕوویـــان ســـووتە دیلـــم
وزایـــــشان دەر ڕەگ و جـــــان نـــــشترستم
مـــەڕا ئـــەز ئاتـــەش دۆزەخ چ غـــەم بـــوود
کـــە دۆزەخ جـــزووی ئـــەز خاکـــسترستم
مـــــسال کـــــــافرم دەر مۆمنـــــــستان

چـــوو مـــۆمن دەر مــــەیانی کافرســـــتم
هەمــە سووچــەم هەمــە ســووزەم هەمــە ســووز
بــــە گــــەرمی چـــون فـــروزان ئاخگرســـتم
رەخــــش نـــاکردە دەر جلـــوە ئـــەز مـــوهر
بــــــە خـــــوبی ئافتــــابی خاوەرســـــتم
مـــو ئـــەز ڕوز ئـــەزەل تـــاهیر بـــەزادم
ئـــــەز ئـــــان ڕو نــــام باباتاهیرســـــتم

ئاشیان =ماڵی ئیمە.نەشمین = نەشمیل (ڕەنگین باڵاکوڵ). مەردانەکی =جوامێرچـــنان =وەهـــا. خـــوار=خـــراب.دیلـــم =دیـــل، ئەســیر.زایــشان=خواردنیــان. مــسال =وەك. مۆمنــستان =ناوچـەی بڕواداران.سوزەم =دەسوتیم.فروزان =ڕوشنایی.

# سەرچاوەکان


١-ئینسکلوپیدای ئیسلامی، بەرگی (٢، ٣، ٤،)
٢-مێژووی ئەدەبی کوردی، م.علاء الدین سجادی چ ٢ ساڵی ١٩٧١ز.
٣-دەقەکانی ئەدەبی کوردی، م. علاء الدین سجادی ساڵی ١٩٧٨ز.
٤-مێژووی سوله یمانی، م. مەحەمەد ئەمین زەکی ساڵی ١٩٥١ز بەغدا.
٥-مێژووی کوردوکوردستان، مەحەمەد ئەمین زەکی ب١ چ٢.
٦-کورد تورك عەرەب، سی .جی.ئەدموندز ساڵی ١٩٥٥ز.
٧-بورهان الحق، نوور عەلی ئیلاهی ١٣٤٢ فارسی تەهران.
٨-موعجەم البلدان، التبری ب٦، ٧چ١ساڵی ١٩٠٦ز.
٩- الکاکائیه فی التاریخ، عباس العزاوی ساڵی ١٩٤٩ز.
١٠-الواقعیه فی الادب الکوردی، د. عزالدین مصطفی رسول .
١١-شجرەالسادات الحسنیه والحسینیه، محمد عبد الکریم الشیخانی البرزنجی ساڵی ١٩٧١ز .
١٢-سادات برزنجه عبد القادر البرزنجی ساڵی ١٩٥٦ز.
١٣-گوڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب٢، ، ٥ساڵی ١٩٧٤، ١٩٧٧ز.
١٤-ئینسکلوپیدیا، پوترس بوستانی ب٧.
١٥-گەنجێنه، دڵزار ساڵی ١٩٦٠ز.
١٦-کلیات باباتاهیر عوریان، عباس رەجەوی .
١٧-من الادب الکوردی، محمد البدری ساڵی ١٩٦٩ز.
١٨-صفحات من النضال الشعب الکوردی فی ایران، محمد توفیق الوردی ساڵی ١٩٧١ز.
١٩-گۆڤاری لغه العرب، ب٧، ٨ ساڵی ١٩٢٩ز.
٢٠-فەرهەنگی لەك ولوڕ حەمید ئیزدی پەناه ساڵی ١٩٧٨ز.
٢١-چوارینەکانی باباتاهیر عوریان، رازی چ٢ساڵی ١٩٧٦ز بەغدا .
٢٢-مێژووی وێژەی کوردی ب١ د.صدیق بورەکەی (صفی زاده)ساڵی ١٣٧٠ فارسی.
٢٣-دوو بەیتەهای باباتاهیر، مؤسسه توبا -قم ساڵی ١٣٨٢ فارسی.
٢٤-دیوان باباتاهیر، به گۆشش مسعود میرزائی، (ئینگلیزی، ئەڵمانی، فرەنسی، فارسی.)چ١ ساڵی ٢٠٠٣ز.
٢٥-گوڤاری ماموستای کورد ژ ١١، ١٢، ئەوروپا.
٢٦-نام ئاوەران یارسان . د. صدیق صفی زاده چ١ تەهران .
٢٧-الاوراد الکسنزانیه -دار القادری للتباعه والنشر والتوزیع دمشق .
٢٨-شاعر وناودارانی کاکەیی- هەردەویل کاکەیی.
٢٩-مێژووی موسیقای کوردی- محمد حەمەی باقی .

٣٠-نیگاهی گوزەرا بە تاریخ و فەلسەفەی اهل هەق ((یارسان)-د. مراد گولمرادی.
٣١-گوڤاری العربی کویتی ژ٢٤٥ سالی١٩٧٥ز، ژ.٢٤٨ سالی ١٩٧٩ز.
٣٢-مێژووی ئەدەبی کوردی ب١ د.مارف خەزنەدار -هەولیر.
٣٣-مێژووی ویژەی کوردی ب١ د.صدیق بورەکەی چ١ سالی ١٣٧٥ فارسی
٣٤-ئینسکلوپیدیای گشتی -یاسین صابر صالح سلیمانی ٢٠٠٥ ز چ١.
٣٥-فەرهەنگی باشور -کوردی، کوردی، فارسی. -عباس جلیلیان سالی ٢٠٠٥ز هەولیر.
٣٦-فەرهەنگی کاروانی هاوچەرخ- ابو بکر کاروانی چ٤ سالی ٢٠٠٧ هەولیر .
٣٧-فەرهەنگی کاوە -فارسی، کوردی -کاوە شوانی چ١ سالی ٢٠٠٧ هەولیر.
٣٨-دیوانی باباتاهیر -صابر کرمانی تهران١٣٨٣ فارسی چ١٠.
٣٩-ئافرەت لە هونراوەی کوردیدا -فؤاد حسین احمد سالی ١٩٩٠ بەغدا .
٤٠-سەر ئەنجام-تیب تاهریسالی ٢٠٠٧ .
٤١-باباتاهیر هەمەدانی مەشهور بە عوریان -شیخ محمد خالْ ١٩٧٧ز بەغدا .
٤٢-تاریخ ادبیات فارسی -ئەز دەوران فردوسی تا عهد سلجوقی -یەکنی ادوارد ویج برنلس، ت. سیوس تهران سالی ١٣٧٤ فارسی .
٤٣- فریاد رەس لە نێوان مەهدی و عیسادا- سامی عەلی عەزیز (ئارام) ٢٠٠٩ چاپخانەی روون.
٤٤- فەلسەفە و رامانی یارسانی لە فەرهەنگ و کۆمەڵگای کوردەواریدا- د. جەمال نەبەز، هەولێر ٢٠٠٩.
٤٥- باباتاهیر - ژیان و بەهەمی - احمد تاقانە ٢٠٠٩ - هەولێر.
٤٦- تاریخ و فەلسەفەی سەرنجام طیب طاهیری ٢٠١٠ هەولێر
٤٧- شەرف نامە، شەرف خانی بەدلیسی وەرگێرانی بۆ زمانی عەرەبي محمد جمیل رۆژبەیانی چ ٣ بەغداد ٢٠٠٧ .
٤٨- بابەتێکی فەهمي کاکەیی دەربارەی باباتاهیر لە ئینتەرنێت وەرگیراوە.

## له ناوەرۆكی ئەم كتێبەدا:

١. ژیانی باباتاهیر.

٢. ٣١٢ چوارینە، كۆمەڵێك چوارینەی دۆزراوە، ٤٩ چوارینەی گومان لێكراو.

٣. هەموو چوارینەكان بە رەنوسی كوردی نوسراون.

٤. زۆربەی چوارینەكان گۆڕاون بۆ شێوە زاری سۆرانی.

٥. روون كردنەوەو لێدوان دەربارەی زۆربەی چوارینەكان.

